زنجیرە کتێبەکانی ئیعجازی زانستی
لە قورئان و سوننەتدا
(١)

# بەڵگە ئاشکراکان

## زنجیرە بابەتێکە دەربارەی ئیعجازی پزیشکی لە قورئان و سوننەتدا

کۆکردنەوە و ئامادەکردنی
دکتۆر کاوە فەرەج سەعدون
پزیشکی شارەزا لە نەخۆشییەکانی
سنگ و کۆئەندامی هەناسەدان

چاپی دووەم
پێداچوونەوە کراوە و بۆی زیادکراوە

زنجیرە کتێبەکانی ئیعجازی زانستی
لە قورئان و سوننەتدا
١

# بەڵگە ئاشکراکان

## زنجیرە بابەتێکە دەربارەی ئیعجازی پزیشکی لە قورئان و سوننەتدا


کۆکردنەوە و ئامادەکردنی
دکتۆر کاوە فەرەج سەعدون
پزیشکی شارەزا لە نەخۆشییەکانی سنگ و کۆئەندامی هەناسەدان



لە بڵاوکراوەکانی:
ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا
چاپی دووەم - ١٤٢٨ی کۆچی / ٢٠٠٧ی زایینی
پێداچوونەوە کراوە و بۆی زیادکراوە

کتێب: بەڵگە ئاشکراکان

ەر: د.کاوە فرج سعدون

دووەم: ١٤٢٨ك — ٢٠٠٧ز

وکراوەکانی: ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا

ی سپاردنی (٢٢٨)ی ساڵی (٢٠٠٥)ی دراوەتێ لە (وەزارەتی رۆشنبیری)

١٠٠٠ دانە

نیای چاپ و بەخشی نووسەر

# پێشکەش بێت

- بە زانا ماندوو نەناسەکانی بواری ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا کە هەڵگری پەیامی موعجیزەی قورئانن لەم سەردەمەدا.

- بە هەموو کەسێك کە دەنووسێت لەبواری ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا.

- بە دایك و باوکم.

- بە (د. تریفە)ی خێزانم.

- بە جگەرگۆشەکانم (بەهەست) و (تێبین) بەئومێدی گەورە بوونیان لەناو گوڵزاری بەرەکەتی ووتە شیرینەکانی قورئان و سوننەت.

# پێشەکی چاپی دووەم

پاش سوپاس و ستایشی بێپایان بۆ خوای گەورە و داواکردنی درووود و رەحمەت بۆ سەر گیانی پاکی پێغەمبەری ئیسلام محمد (ﷺ) .....

خوێنەری خۆشەویست .....

لەسەر داواکاری ئێوەی خۆشەویست و لەبەر بوونی داواکاری و پرسیارێکی زۆر لەسەر ئەم بەرهەمەی ناوەند کە لە ماوەیەکی کەمدا لە بازاڕدا تەواو بوو دەستەی باڵای ناوەند بە مەبەستی جێبەجێکردنی ئەم داواکارییەی بەڕێزتان پێی باش بوو کە چاپی دووەم لەم کتێبە بخاتە بازاڕەوە، ئەویش پاش پێداچوونەوە و کەمێک دەستکاری و بۆ زیادکردن.

بوونی ئەم داواکارییە زۆرە لەسەر بەرهەمەکانی (ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا)، ئەوە دووپات دەکاتەوە کە سوپاس بۆ خودا خەڵکی کوردستانی ئێمەش وەک موسوڵمانانی تر لە جیهاندا تامەزرۆی دەستکەوتنی زانیارین لەسەر ئەم لایەنە گەورەیەی ئیعجازی قورئان و سوننەتی پیرۆز کە لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا ناوازەیی و گەورەیی، و بەرزیی سەرچاوەی بەرنامەکەی پەروەردگاری بۆ هەموو خەڵکی سەر زەوی روون و ئاشکرا کردووە.

خوای گەورە پشت و پەنای هەموو ئەو کەسانە بێت کە لەم لایەنەدا بە تایبەتی کاردەکەن، و هەموو ئەو کەسانەش کە لە هەر لایەنێکی تردا خزمەت بە قورئان و سوننەتی پیرۆز دەکەن، و پاداشتی خێری هەموو لایەک بداتەوە.

ئامادەکار

سلێمانی - ٢٠٠٧/٥/٢٥

# پێشەکی

**بە پێنووسی: سەرۆکی ناوەند**

الحمد لله رب العالمين و الصلاة و السلام على سيد المرسلين وآله و صحبه أجمعين

لە پاش سڵاو ......

بەردەوام دەزگاکانی ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوە (سەر بە دەوڵەت بن یان سەربەخۆ) هەڵدەستن بە دەرکردن و بڵاوکردنەوەی گۆڤار و پەرتووکی نووسراو یان وەرگێڕدراو، بە مەبەستی پەخش کردنی ڕۆشنبیرییەکی خاوەن مەبەست، یان ڕۆشنبیری گشتی، یان ڕۆشنبیری ئابووری و بازرگانی ....هتد، ئەوەبوو دەزگاکانی (الهلال) و (المعارف) لە ناوەڕاستی سەدەی رابوردوودا هەستان بە دەرکردنی زنجیرە کتێبێك، کە تا ئێستاش ڕۆڵێکی گرنگ دەبینن لە کتێبخانە گشتی و تایبەتییەکاندا ...

لە کتێبی (الهلال) و ڕۆمانەکانی (الهلال)وە، پاشان زنجیرەی (إقرأ) تا گەیشتینە زنجیرەی هەزار کتێب (سلسلة الألف كتاب)، و کۆمەڵە کتێبی ڕۆشنبیری (المجموعة الثقافية)، و کتێبی گەل (كتاب الشعب) و کتێبی کۆمار (كتاب الجمهورية)، و فەرهەنگی بچووك کراوە (الموسوعة الصغيرة)، و کتێبی (المعرفة) و (العربي) ..... و دەیان کۆمەڵە کتێب لە بوارەکانی: مێژوو، زانست، دەروونناسی، کۆمەڵناسی، ئاین، یاسا و چیرۆکی وەرگێڕدراو و ..... هتد.

کوردستانی ئازیزیشمان خاڵی نەبووە لەو جۆرە زنجیرە ڕۆشنبیرییانە، وەك زنجیرە کتێبەکانی دەزگای (سەردەم)، و کتێبخانەی (ڕۆشنبیر)، و نووسینگەی (تەفسیر) و چەندین دەزگای ڕۆشنبیری تر، لەم کورتەیەشدا نابێت ڕۆڵی کتێبخانەی (المثنى) لە شاری (بەغداد) لە یاد بکەین کە توانیویەتی کۆمەڵە کتێبێکی دەگمەن بە چاپ بگەیەنێت، و بەشداریشی کردووە لە بڵاوکردنەوەی چەندین کتێبی ڕۆشنبیری لە بوارەکانی: ئاین، مێژوو، یاسا، دەروونناسی و کۆمەڵناسیدا.

گۆڕەپانی کوردستان لەمڕۆماندا چالاکی‌یەکی ڕۆشنبیری بەرچاو بەخۆیە دەبینێت، لە بوارەکانی ئازادی ڕادەربڕین و بڵاوکردنەوەدا، کە وای لە دەزگا ڕۆشنبیری‌یەکانی هەرێم کردووە کە چالاکانە بەشداری بکەن لە دەرکردن بڵاوکردنەوەی بڵاوکراوە بەردەوامەکان، و کتێبە وەرگێڕدراوەکان. هەروەها ا گرتنەخۆ و یارمەتیدانی نووسەران و ئەدیبان، ئەویش لەڕێی پشتگیری کردنی بۆ بڵاوکردنەوەی بەرهەمە تایبەتەکانی خۆیان و بەرهەمە وەرگێڕدراوەکانیان ...

لەم بناغەیەوەیە کە دەستەی باڵای (ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی ا قورئان و سوننەتدا) بڕیاری دا کە زنجیرەیەك کتێبی تایبەت بە بابەتەکانی ئیعجاز زانستی لە قورئان و سوننەتدا بە زمانی کوردی بڵاوبکاتەوە، بۆ ئەوەی چ کتێبخانەی کوردی لەم بابەتە گرنگ و بەسوودانە بێبەش نەبێت و یەکەم هەوا ڕێکخراو بێت لەم بوارەدا.

لەم ماوەیەی دوایی‌دا لەلای ناوەند کۆمەڵێك بەرهەمی ئەندامانی ناوەن کۆبوونەتەوە کە ئامادەن بۆ بڵاوکردنەوە، ئێمەش وەك کتێبی یەکەم لە زنجیرەیەدا بەرهەمێکی بەڕێز (د.کاوە فەرەج)مان هەڵبژارد بە ناوی (بەڵگ ئاشکراکان)، کە کتێبێکە بە یارمەتی پەروەردگار جێی خۆی لە ڕۆشنبیر ئیعجازیی نوێدا دەکاتەوە، خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ئەم پەرتووکە و کار نووسەر و ناوەندەکەمانەوە.

کتێبەکە بریتی‌یە لە چەند نموونەیەکی ئیعجازی پزیشکی لە قورئان سوننەتی پیرۆزدا، و لە دوو توێی‌دا ئەم بابەتانەی خوارەوەی لەخۆ گرتووە:

- مرۆڤ لە بەرزایی‌یە زۆرەکان لە نێوان قورئان و زانستی نوێدا.
- ئیعجازی زانستی لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی تەنینەوەی نەخۆشی.
- سیستمێکی هۆرمۆنی یەکتری تەواوکەر لە سەرەتای سوورەتی (مریم)دا.
- چەند نموونەیەك لەئیعجازی زانستیی پزیشکیی لە سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ
- هەستکردن بە ئازار لە نێوان قورئان و زانستی پزیشکی‌دا.
- تووڕەبوون ... زیانەکان و چارەسەری لە سوننەتدا.

ئیعجازی پزیشکی لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی کلێنچکە (عجب الذنب).
ناوچەوان و کاری ناوچەوانە پڕ لە مێشکدا... {لێکۆڵینەوەیەکی ئیعجازیی سوورەتی لعلق)}.
چارەسەر بەڕەشکە لەنێوان ئیعجازی سوننەت و زانستی پزیشکیدا.
موعجیزەی چارەسەرکردن بە هەنگوین و ئەوەی لە سکی هەنگەوە دەردەچێت چەند راستییەکی سەلمێنراو.
هەروەها چەندین گفتوگۆی زانستی لە روانگەی زانستی پزیشکییەوە لەخۆ ێتووە، لەگەڵ هێنانەوەی بەڵگەی زانستی و ووتەی زانایانی ناسراو لە سپۆڕییە پزیشکییە جیاوازەکاندا لە کاتی روون کردنەوەی بابەتەکاندا.
لە لایەکی ترەوە ئێمە لە دەستەی باڵای ناوەندەوە بەڵێن بە خوێنەران و قورئان ێستانی خۆشەویست دەدەین کە بە یارمەتی پەروەردگار لە ماوەی ئەم ساڵانەدا الاکییەکی رۆشنبیری بەرچاوی ناوەند دەبینن، لە سازدانی کۆڕ و سیمیناری ۆراوجۆر، و گرێدانی کۆبوونەوەی زانستی لە پسپۆڕییە جیاوازەکاندا، ئەویش میواندارێتی کەسانی رووناکبیر و مامۆستا لەو بوارانەدا.
هەروەها بەردەوام دەبین لەسەر دەرکردنی گۆڤاری (هەیڤ)، بە هیوای شکەوتن و ناوازەیی و رۆشنبیرییەکی رەسەن لە بواری ئیعجازی زانستی لە رئان و سوننەتدا.
خوای گەورە پشتیوانی هەموو لایەك بێت ............

ئەشنەت غەفور سەعید
سەرۆکی ناوەند

# پێشەکی

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن اتبع هداه الى يوم الدين ....

مرۆڤایەتی لەرۆژگاری ئەمڕۆدا لە گێروگرفتدا دەژی، ئەم گێروگرفتە بەپلەی یەکەم ئابووریی نییە چونکە مرۆڤەکان بەگشتی رۆژ لەدوای رۆژ ژیانیان بەرەو باشتر دەچێت و هەژاریی قەڵاچۆ دەکرێت، لەلایەکی تریشەوە خۆشگوزەرانی ماددی زۆرێك لە گەلانی سەر زەوی گرتۆتەوە (بۆ نموونە وولاتانی ئیسکندیناڤی لەو وولاتانەن کە لەو خۆش گوزەرانییەدان و ژیانێکی دابین کراویان هەیە لە هەموو لایەنەکاندا، بەڵام لەهەمان کاتیشدا یەکێك لە بەرزترین رێژەکانی خۆکوشتنیش لەجیهاندا هەر لەو وولاتانەدایە!!)، هەروەها ئەم گێروگرفتە لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ژیانی رۆژانەدا نییە، چونکە دەبینین رۆژ لەدوای رۆژ لەم بوارانەدا بەردەوام هەنگاوی گەورە دەنرێت و دەتوانین بڵێین شۆڕشێك لەو بوارانەدا بەرپابووە، ئێستا سەردەمی کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت و ژیری دەستکردە.

ئەم سەرگەردانییە گەیشتۆتە رادەیەك کە مرۆڤایەتی بەدوای لەناوبردنی خۆیدا دەگەڕێت، بەردەوام بواری چەکسازی و خۆپڕچەك کردن بەرەو پێش دەچێت و ئێستا چەندین جۆر چەکی کۆمەڵ کوژ دۆزراونەتەوە، لەوانە: چەکی ئەتۆمی و هایدرۆجینی و نیوترۆنی و بایۆلۆژی و .... هتد، هەرئەوەندە بەسە بڵێین: ئەو چەکە ئەتۆمییانەی دەوڵەتە زلهێزەکانی دونیا ئێستا لەژێر دەستیاندایە و ئامادەیە بۆ بەکارهێنان بەشی لەناوبردنی ٢٠ هێندی هەموو دانیشتووان و زیندەوەرانی سەر زەوی دەکات!.

ئەوگێروگرفتەی ئەمڕۆ مرۆڤایەتی تێیدا دەژی گێروگرفتی ویژدان و دەروونە، مرۆڤ لەگەڵ ئەم هەموو پێشکەوتنانەدا کێشە و گرفتە دەروونییەکان و گرفتە کۆمەڵایەتییەکان تەنگیان پێهەڵچنیوە و تا ئێستا چێژی بەختەوەری نەکردووە، دەبینین زۆرێك لە زانایانی ناسراوی ئەمڕۆ (بە تایبەتی رۆژئاواییەکان) هەستیان بەم بارە ناهەموارە کردووە، وەك زانای بەناوبانگ (د. ئەلیکسیس کاریل)ی

فەرەنسی، کە لە کتێبی (الأنسان ذلك المجهول)دا داوای گۆڕینی شارستانی‌یەتی ئەمڕۆ دەکات، و دەڵێت: دەبێت بیرێکی نوێ لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا بێتە پێشەوە کە هەموو پێویستی‌یەکی لایەنە جەستەیی ودەروونی‌یەکانی مرۆڤ بە هاوسەنگی جێبەجێ بکات، کە بێگومان تەنها لە گەڕانەوەی مرۆڤ بۆلای پەروەردگار و بەرنامە پیرۆزەکەی‌دا ئەم مەبەستانەی دێنەدی.

مرۆڤ لەمڕۆماندا زۆر لە دروستکەر و پەروەردگاری دوور کەوتۆتەوە کە بووەتە هۆی لەدەستدانی مرۆڤ بۆ گرنگی و بەرزیی پلەوپایەکەی لە ژیاندا، و تووشبوونی بەو گیروگرفتانەی کە بەدەستی‌یەوە دەناڵێنێت، تەنها بە گەڕانەوەی مرۆڤ بۆ لای پەروەردگاری گیروگرفتەکانی چارەسەر دەبن و بەختەوەریی بەدەست دێنێت، چونکە بێگومان ئەو کەسەی بەو شێوە وورد و سەرسوڕهێنەرە مرۆڤی دروستکردووە زۆر لە مرۆڤ شارەزاتر و بەتواناترە بۆ زانینی هەموو پێویستی‌یە جەستەیی‌و دەروونی‌یەکانی و دابینکردنی لە هەموو رووەکانەوە.

بەمەبەستی دابین کردن و تێرکردنی هەموو ئەم پێویستی‌یانە، لەدێر زەمانەوە پەروەردگار لەلایەن خۆیەوە پەیامی ئاسمانی بە پەیامبەرە بەڕێزەکانی‌دا بۆ ئینسانەکان ناردووە، و هەمیشە وویستوویەتی مرۆڤەکان لە گێژاوی کوفر و نەفامی و زوڵم و ستەم و یەکتری پەرستی‌یەوە دەرچن بۆ رووناکی یەکتاپەرستی دروستکەرەکەیان و بەرچاو روونی پەیامە پیرۆزە ئاسمانی‌یەکان، بۆ سەلماندنی راستی خودایی لە ناردنی ئەو پێغەمبەرانە و پەیامەکانیان، پەروەردگار چەندین بەڵگەی روونی پێداون کە پێیان دەووترێت (موعجیزات)، کە لەگەڵ شتە باوەکانی سەردەمی ئەو پێغەمبەرانەدا گونجاوە، بەڵام بەدەربووە لە توانای مرۆڤەکان و لە بەردەمیدا دەستەوسان بوون ..... بێباوەڕانی پێ دەمکوت کراوە و ئیماندارانی پێ باوەڕ پتەوتر بوون.

رۆژگارەکان هاتن و چوون و پەیامە ئاسمانی‌یەکان گەیشتنە کۆتایین پەیام کە ئیسلامی پیرۆزە، و کۆتایین پێغەمبەریش کە محمدە(ﷺ) لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ مرۆڤەکان نێردرا ، بەڵگەی پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ) بریتی‌یە لە

موعجیزەیـەك كـە تـا كۆتـایی ژیـان لەسـەر زەوی‌دا بـە زینـدوویی و نـاوازەیی دەمێنێتـەوە و هەمیشـە مرۆڤـەكان سەرسام و دەستەوسـان دەكات، كـە ئـەویش كتێبی پەروەردگار قورئانی پیرۆزە.

بەتێپـەربوونی رۆژگارەكـان مرۆڤـەكان ئینجـا دەگەنـە راسـتی و بەڵگـەی نـوێ لەسەر موعجیزەی قورئان، كە ئەمەش سەلمێنەری ئەو راستی‌یە قورئانی‌یەیە كە دەفەرموێت: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت:٥٣)، واتە: ئێمە لە پاشەڕۆژ و داهاتوودا بەڵگەكانمان نیشانی خەڵكی دەدەین لە ئاسۆكان و لە لاشەی خۆشیاندا بۆ ئەوەی كە بۆیان دەربكەوێت ئەم كتێبەی پەروەردگار ( قورئانی پیرۆز) هەق و راستی‌یە.

بەردەوام قورئانی پیرۆز موعجیزە و بەڵگەیەكی رۆشن و زیندووە بۆ مرۆڤەكان: ﴿لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ﴾ (فصلت:٤٢)، واتە: هیچ كاتێك ئـەم قورئانـە پیرۆزە باطـل و نـاڕەوایی تێكـەڵ نابێت، چونكە لەلایـەن خودایـەكی كاربـەجێ و دانـا و سوپاس كراوەوە هاتۆتـە خـوارەوە، قورئـانی پیرۆز مرۆڤـەكانی دەستەوسـان كـردووە بـەڵام لەهـەمان كاتـدا هیدایـەت و رێنومایی‌یـان دەكات بۆ باشترین و تەواوترین بەرنامە كە لە ژیانیاندا پەیڕەوی بكەن.

زانایان زۆر دڵگیربوون بە لێكۆڵینەوەی قورئان لە هەموو لایەنەكانەوە و تەفسیر كردنـی نهێنی‌یـەكانی، بـەڵام گـرنگترین لایەنـە ناوازەكـانی قورئـان بریتی‌یـە لـە باسكردن و دەرخستنی ئەو سیفەتانەی كە وای لە قورئان كردووە كە پەیامێكی موعجیز بێت، و هـەر ئەمیش بەرامبەركێ و (تحدی)ی هـەموو ئینسانەكانی بكات كە بتوانن تەنها یەك سوورەت لە هاوشێوەی ئەو بهێنن: ﴿قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَن يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا﴾ (الإسراء:٨٨)، واتـە: ئەگـەر هـەموو مرۆڤـەكان و جنۆكـەكانیش كۆببنـەوە لەسـەر ئـەوەی كـە بیانـەوێت هاوشـێوەی ئـەم قورئانـە بهێـنن، نـاتوانن هاوشـێوەی بهێـنن ئەگەر بەردەوامیش هاوپشتیوانی و كۆمەكی یەكتری بكەن بۆ ئەم مەبەستەیان.

موعجیزاتی پێغەمبەرانی پێشوو تەنها لە سەردەمی خۆیاندا رۆڵی هەبووە و پاش وەفاتیان تەنها وەکو باسێك دەمایەوە، بێجگە لە موعجیزەی محمد (ﷺ) کە لە جۆرێکی ترە، و بەردەوام تاوەکو رۆژی دوایی مرۆڤەکان دەدوێنێت و سەرسامیان دەکات، و بە تێپەڕبوونی سەردەمەکان خەڵکی موعجیزەکانی قورئان زیاتر دەبینن و دەبیستن، هەر بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) لە ووتەیەکیدا دەفەرموێت: ﴿مَا مِنْ نَبِيّ مِنَ الأَنْبياء إلاّ أُعْطِي مِنَ الآيَاتِ مَا مِثْلُهُ آمَنَ عَلَيْه البَشَر، وَإِنَّما كَانَ الَّذي أُوتِيتُه وَحْياً أَوْحَاهُ اللهُ إِلَيّ، فَأَرْجوا أَن أَكون أَكْثَرهُم تَابعاً يَوْم القِيَامَــة﴾ (رواه البخاري)، واتە: هەموو پێغەمبەرێکی گەلانی پێشوو ئەوەندەی شوێنکەوتوو هەبووە بەپێی ئەو موعجیزەیەی کە پێی درابوو و خەڵك بینی‌یان، بەڵام موعجیزەکەی من کە پێمدراوە نیگا و پەیامێکە خوا پێی داوم، و هیوام وایە بەهۆیەوە زۆرترین شوێنکەوتووم هەبێت لە رۆژی دوایی‌دا.

موعجیزەی قورئانی پیرۆز بەردەوامە تا رۆژی دوایی و تا ئێستا زۆر لایەنی ئەم موعجیزەیە دەرکەوتوون و زانایان باسیان لێوەکردووە، لەوانە: ئیعجاز لە لایەنەکانی: زمانەوانی، رەوانبێژی، مێژوویی و لایەنی بەسەرهات و چیرۆکەکانی، لایەنی شەریعەت و ئەحکامەکانی، یەکێکیش لە گرنگترین لایەنەکانی ئیعجازی قورئان بریتی‌یە لەو بەسەرهاتە غەیبی‌یانەی باسی کردوون، کە لەسەردەمی هاتنە خوارەوەی قورئاندا نەزانراوەو خەڵکی زانیاری‌یان لەبارەیانەوە نەبووە ، بەڵکو لەدواییدا خەڵك گەیشتوونەتە ئەو راستی‌یانە، یەکێك لەو لایەنە غەیبی‌یانەی کە تازە دەرکەوتووە بریتی‌یە لەو ئاماژە و ئیشاراتانەی کە باسی زۆرێك لە راستی‌یە زانستی‌یە سەلمێنراوەکان دەکات لە بوونەوەر و گەردوونی فراواندا، کە لە رۆژگاری ئەمڕۆی سەردەمی زانست و پێشکەوتنی تەکنۆلۆژی‌دا دۆزراونەتەوە و سەلمێنراون، لە هەموو ئاسۆکانی گەردوون و لاشەی مرۆڤیشدا، ئەمە سەلمێنەرێکی فەرموودەکەی پەروەردگارە: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت:٥٣).

(ناوەنــدی کوردســتان بــۆ ئیعجــازی زانســتی لــە قورئــان و ســوننەتدا) وەك دەستپێشخەری کۆمەڵێك مامۆستا و کەسانی پسپۆڕ لە زانستە جیاجیاکاندا لە کوردســتاندا هاتۆتــەدی بــۆ ناســاندن و روونکردنــەوەی ئــەم لایەنــە گرنگــەی مــوعجیزەی قورئــان وســوننەتی پــیرۆزی پێغەمبــەر(ﷺ) لــەم ســەردەمەماندا، کــە گرنگترین لایەنی سەلمێنەری راستی فەرموودەکانی قورئان و سوننەتی پیرۆزە لەم رۆژگارەماندا، ئێمە بەپشتیوانی پەروەردگار هەوڵدەدەین کە زوربەی ئەو لایەنانە روون بکەینەوە و بۆ گەلی کوردی موسوڵمانی خۆمانی شیبکەینەوە، کە هیوادارین هەوڵێك بێت لەپێناو خزمەت کردنی قورئان و سوننەتی بەرێز.

خوێنەری ئازیز ئەم کتێبەی بەردەستت بەشی یەکەم دەبێت لە زنجیرە کتێبێکی تایبەت بە ئیعجازی زانستی لە قەرئان و سوننەتدا، و بە زمانی شیرینی کوردی لەلایەن ناوەندەوە بڵاودەکرێتەوە و هەوڵێکە لەو بوارە پیرۆزەدا، لە دوو تویۆیدا چەندین بابەتی پزیشکیی جۆراوجۆر دەبینیت و ئاماژەکانی قورئان و سوننەت لەو بوارە پزیشکیيانەدا هێنراونەتەوە.

کتێبەکە لە ١٠ بەشی سەرەکی پێکدێت، کە ئامارەیان تێدایە بۆ چەندین بواری جۆراوجــۆری زانســتی پزیشــکیی نــوێ و لــە هــەمان کاتــدا ئامــاژە وردە زانســتی‌یەکانی قورئــان و سوننەتیشــی بــەم بوارانــە خســتۆتەروو، پاشــان هاوئاهــەنگی فــەرموودەکانی قورئــان و ســوننەت لەگــەڵ ئــەم راستی‌یە زانستی‌یە نوێیانــەدا و لایەنــە ئیعجازی‌یــەکانیان بەشــێوەیەکی زانســتی‌یانە و زۆر ســادە و ئاشکرا روون کراونەتەوە.

یەکگرتنــەوەی فــەرموودە پیرۆزەکــانی قورئــان و ســوننەت لەگــەڵ راســتی‌یە پزیشــکی‌یەکاندا (بــە شــێوەیەکی تــەواو و زۆر گونجــاو، تەنانــەت لــە بچــووکترین وردەکاریشــدا دژ بەیــەك و پێچــەوانە نــین) ســەلمێنەری ئــەو راســتی‌یەیە کــە ئــەو پەیامە پیرۆزە و هەموو گەردوون بەگشتی و مرۆڤیش بەتایبەتی هەمان دروستکەر و رێك و پێککەریان هەیە.

دەرکــەوتنی ئــەم راســتی‌یە و روون بوونــەوەی جــارێکی تــر ســەلمێنەری حەقیقەتێکی تری قورشانە کە هەر ئەو بەڵێنی داوە کە گەورەیی و راستیی ئەم فەرموودانە لە داهاتوودا بۆ مرۆڤەکان روون دەبێتەوە: ﴿قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ (الفرقان:٦)، ﴿وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ (النمل:٩٣).

ئامادەکار

سلێمانی: ٢٠٠٥/٢/٢٦


1
مرۆڤ لە بەرزاییە زۆرەکاندا
لە نێوان
قورئان و زانستی نوێدا

## سەرەتا:

ئیعجازی زانستی قورئانی پیرۆز بەتەواوەتی لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەردەکەوێت: ﴿فَمَن يُرِدِ اللَّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلإِسْلاَمِ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاء كَذَلِكَ يَجْعَلُ اللَّهُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾ (الأنعام:١٢٥)، واتە: هەر کەسێك پەروەدگار بیەوێت هیدایەتی بدات دڵی فراوان دەکات بۆ وەرگرتنی ئیسلام، و هەر کەسێکیش کە بیەوێت گومڕای بکات دڵ و سەرسنگی تەنگ و ناڕەحەت دەکات بۆ وەرگرتنی ئیسلام، بەشێوەیەك وەکو کەسێکی لێدێت کە بەئاسماندا سەربکەوێت بۆ سەرەوە (واتە یەکێك لە ماناکانی ئایەتەکە ئەوەیە: هەر مرۆڤێك بەئاسماندا سەر بکەوێت تووشی سنگ تەنگ بوون و هەناسەتوندی و ناڕەحەتی دەبێت).

زانستی فڕۆکەوانی ئەمڕۆ سەلماندوێتی کە کاتێك مرۆڤ دووچاریی بەرزایی زۆر دەبێت، کاتێك لەسەر رووی زەوی‌یەوە بۆ چینە بەرزەکانی بەرگەهەوا (الغلاف الجوي Atmosphere) سەردەکەوێت تووشی چەندین نیشانەی فیسیۆلۆژی دەبێت کە لە هەست کردن بە هەناسە توندی لە سنگی‌دا دەست پێ‌دەکات، کە ئەگەر بێت و بەردەوام بێت لە سەرکەوتن و رووبەروو بوونەوەی بەرزیی زۆر، و نزم بوونەوەی پەستانی هەوا، و کەم بوونەوەی ئۆکسجین، ئەوا دەگاتە قۆناغێکی ناڕەحەتی زۆر و شلۆق بوونی بارە تەندروستی‌یەکەی بە تەواوی (مرحلة حرجة)، هەروەك ئایەتە پیرۆزەکەی سەرەوە ئاماژەی پێداوە.



## درێژەی باس:

لە زیاتر لە ٢٠٠ ساڵ لەمەو پێشەوە (١٧٨٦م)، لێکۆڵینەوەی زۆر کراوە لە چینە بەرزەکانی بەرگەهەوادا، و کاریگەریی ئەم بەرزایییانە لەسەر مرۆڤ لێک دراوەتەوە، لە نزیکەی ١٠٠ساڵ لەمەو پێشەوە (لە ١٨٧٨م) چەندین لێکۆڵینەوەی پێشکەوتوو کرا سەبارەت بە باری فیسیۆلۆژی لەشی مرۆڤ (Human Physiology) و کاریگەریی بەرزایی زۆر لەسەری.

کە دەڕوانینە قورئانی پیرۆز کە بەر لە ١٤سەدە لەمەوپێش بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هاتووە دەبینین لە بارەی ئیمان و بێباوەڕییەوە دەفەرموێت: ﴿فَمَن يُرِدِ اللَّـهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ﴾ (الأنعام١٢٥)، کە لە دووتوێی ووشەکانیدا زانیاری هەموو ئەو لێکۆڵینەوانەی لەخۆ گرتووە بەشێوەیەکی پوخت و موعجیز.*

لە زانستی پزیشکیی فەزا و فڕۆکەوانیدا روونکردنەوەیەکی ئاشکرای ئایەتەکەمان بۆ دەردەکەوێت، ئەویش لەرێی باسکردنێکی سادەی پێکهاتەی بەرگە هەوای زەوی و چینەکانی، و کاریگەرییان بۆ سەر مرۆڤ لەڕووی فیسیۆلۆژییەوە.

## پێکهاتەی بەرگە هەوای زەوی و دابەشکردنی لەڕووی فیسیۆلۆژییەوە:

١- ناوچەیەکی تێروتەسەل لەڕووی فیسیۆلۆژییەوە: (لەڕووی دەریاوە تا بەرزیی ١٠٠٠٠پێ دەگرێتەوە)، لەم ناوچەیەی بەرگە هەوادا مرۆڤ دەتوانێت بەئاسایی بژی چونکە ئەو بڕە ئۆکسجینەی کە هەیە بەشی ژیانی ئاسایی مرۆڤ دەکات.

٢- ناوچەیەکی ناتێر لەڕووی فیسیۆلۆژییەوە: (لە بەرزیی ١٠٠٠٠ تا ٥٠٠٠٠پێ)، زانایان تێبینی ئەوەیان کردووە کە لەم ناوچەیەدا

* (الزجاج)ی موفەسیر دەفەرموێت: (الحرج) لەئایەتەکەدا بەمانای ئەوپەڕی ناڕەحەتی دێت، ووتەی پەروەردگار (كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ) بەهۆی قورسی ئیمان لەسەر دڵ و دەروونی، بێباوەڕی بە یەکێك شوبهاندووە کە داوای شتێکی لێبکرێت کە لە توانایدا نەبێت، کە ئەویش سەرکەوتنە بەئاسماندا، (الشوكاني) دەفەرموێت: مانای ئەوەیە کە داوای کارێکی لێبکرێت کە لەتوانایدا نەبێت جار لەدوای جار.

نوقسانی‌یەکی زۆر هەیە لە ڕێژەی ئۆکسجیندا، هەروەها نزم بوونەوەی پەستانی هەواش، کە ئەمانە دەبنە هۆی پەیدا بوون و دەرکەوتنی نیشانەکانی کەمی ئۆکسجین (Hypoxia)، و نیشانەکانی کەم بوونەوەی پەستانی هەوا (Dysbarism) لەسەر ئەو مرۆڤە.

٣- ناوچەی بۆشایی نزیک: (لە بەرزیی ٥٠٠٠٠پێ دەست پێدەکات تاوەکو نزیکەی ٦٣٢٠٠٠پێ)، مرۆڤ ناتوانێت لەڕووی فیسیۆلۆژی‌یەوە لە بەرزی زیاتر لە ٥٠٠٠٠پێ بژی، تەنانەت ئەگەر ١٠٠٪ ئۆکسجینیشی بدرێتێ، بەڵکو دەبێت جل وبەرگی کەشتی‌یەوانی فەزا لەبەر بکات، کە ئامادە کراوە بە جۆرێك کە بتوانێت بەرگەی دابەزینی پەستانی هەوا و کەمی ئۆکسجین بگرێت لەو بەرزایی‌یە زۆرانەدا.



## دیاردەی کەمی ئۆکسجین لە لەشدا ( Hypoxia ):

ئەم دیاردەیە تووشی فڕۆکەوان دەبێت بەهۆی کەمی ئۆکسجین لە شانە و خانەکانی لەشیدا، کاتێک کە ئامێرەکانی ڕاگرتنی پەستانی هەوا لەناو فڕۆکەکەیدا لەکار دەکەون، ئەویش لە بەرزاییەکی هەرە زۆرەکاندا، ئەم دیاردەیە خۆی لە دابەزینی پەستانی هەوای گازی ئۆکسجیندا دەبینێتەوە و دەبێتە هۆی کەمتر هەڵمژینی ئۆکسجین و تێک چوونی ڕێژەکەی لە ناو لەشدا.

هەوای هەڵمژراو لە لایەن مرۆڤەوە لە کاتی هەناسەداندا لەمانە پێکدێت:

* ٢٠,٩٥٪ گازی ئۆکسجین.
* ٧٨,٠٩٪ گازی نایترۆجین.
* ٠,٠٣٪ گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن.
* ڕێژەکەی تر کە دەمێنێتەوە چەند گازێك پێکی دەهێنن کە گرنگ نین بۆ زیندە چالاکییەکانی لەش.

لەم تێکەڵاوە گازییەدا -واتە هەوای هەڵمژراو- باشتر وایە کە باسی پەستانی هەوای گازەکان بکەین، ئەم پەستانە بریتییە لە فاکتەری کاریگەر بۆ هەر گازێك لەم تێکەڵەیەدا، بەتایبەتی پەستانی هەوای گازی ئۆکسجین لە سیکڵدانۆچکەکانی (توورەکە هەواییەکانی Alveoli) ناو سییەکاندا، کە فاکتەری سەرەکی کاریگەرە بۆ سەر لەش، چونکە ئەم فاکتەرەیە کۆنترۆڵی ئەو ڕێژەیە لە ئۆکسجین دەکات کە دەچێت بۆ خوێن و پاشان بۆ ئەندامەکانی لەش.

پێویستە ئەوەش بزانین کە بەڵگە نەویستێکی زانستییە، هەر کاتێك بە بەرگە هەوادا سەر بکەوین پەستانی هەوا بەگشتی و پەستانی ئۆکسجین بە تایبەتی کەم دەبێتەوە، هەربۆیە دەبێت ئۆکسجین بە خەستی ١٠٠٪ بدرێت بە کەسێك کە لە بەرزی ٣٢٧٠٠پێدا بێت، لەگەڵ ئەمەشدا پەستانی هەوای گازی ئۆکسجین لە توورەکە هەواییەکانی سییەکانی ئەم کەسەدا هەمان ڕێژەی ئەو پەستانەی توورەکە هەواکانی کەسێکی دەبێت کە هەوای ئاسایی بمژێت بەڵام لە ئاستی ڕووی دەریادا.

کاتێک کە دەگەینە بەرزیی ٤٠٠٠٠پێ، پەستانی هەوای گازی ئۆکسجین بەشێوەیەك نزم دەبێتەوە و بۆ ئاستێك کە مەترسی بۆ ژیان دروست دەکات، و نایەڵێت کۆئەندام و ئەندامەکانی لەش بەئاسایی کاربکەن، ئەو بەرزی‌یە مەترسیدارەی کە تێیدا پەستانی هەوا دا دەبەزێت بۆ ٨٧ملم/ جیوە بریتی‌یە لە بەرزیی ٥٠٠٠٠پێ، کە لێرەدا تەنانەت ئەگەر ١٠٠٪ ئۆکسجین هەڵبمژین بەهیچ شێوەیەك پێویستی‌یەکانی لەش دابین ناکات.




## قۆناغەکانی نیشانەکانی دیاردەی کەمی ئۆکسجین:

دابەش دەکرێت بۆ چوار قۆناغ بەپێی پەستانی هەوا، و راددەی بەرزیی، و رێژەی ئۆکسجین لەخوێندا:

١- قۆناغی روونەدانی گۆڕانکاری (لە ئاستی رووی دەریاوە تا بەرزیی ١٠٠٠٠پێ): لەم قۆناغەدا هیچ جۆرە نیشانەیەکی کەمی ئۆکسجین روو نادات و بینین بە رۆژ زۆر ئاسایی‌یە.

٢- قۆناغی راگرتنی باری ئاسایی لەرووی فیسیۆلۆژی‌یەوە (لە بەرزیی ١٠٠٠٠پێ تا ١٦٠٠٠پێ): لەم ئاستەدا ئەندامەکانی لەش هەڵدەستن بە راگرتنی باری ئاسایی لە لەشدا (هاوسەنگیی فیسیۆلۆژی)، و کارێکی وا دەکەن کە نیشانەکانی کەمی ئۆکسجین دەرنەکەون، بەڵام ئەگەر بێتوو ماوەی مانەوە لەم ئاستەدا درێژ بێت یان ئەو کەسە هەستێت بە ئەرکێکی جەستەیی زیاد، ئەوا

ئەمانــە دەبنــە هــۆی زیــاد بــوونی قــووڵی و ژمــارەی جارەکــانی هەناســەدان لــە دەقیقەیەکدا، لێدانی دڵ زیاد دەکات و پەستانی خوێن بەرز دەبێتـەوە، هـەروەها خێرایی سوڕانەوەی خوێن بەلەشدا زیاد دەکات.

٢- قۆنـاغی تێکچـوونی هاوسـەنگیی فیسـیۆلۆژی (لـە بـەرزیی ١٦٠٠٠پـێ تـا ٢٥٠٠٠پـێ): لـەم قۆناغـەدا ئەندامـەکانی لـەش نـاتوانن بـاری ئاسـایی رابگـرن، ئەویش بەهۆی ئەوەی ئۆکسجینی پێویست ناگات بە شانە و خانەکانی لەش، لێرەوە نیشانەکان دەست دەکەن بە دەرکەوتن، لەم قۆناغەدا روون کردنەوەیەکی ئاشــکرامان دەســت دەکــەوێت بــۆ دیــاردەی ســنگ تــەنگ بــوون و ئــەو هەناسەتوندییەی تووشـی مـرۆڤ دەبێـت کاتێـك دەگاتـە ئـەو بەرزاییيـە زۆرانـە، ئەمەش یەك دەگرێتەوە لەگەڵ ئەوەی ئایەتە پیرۆزەکە ئاماژەی پێداوە، کە ئەویش هەست کردنی مرۆڤە بە سنگ تەنگ بوون کاتێك بەئاسماندا سەردەکەوێت: ﴿كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ﴾ واتە لە چینەکانی سەرەوەی بەرگە هەوادا، ئایەتە پیرۆزەکە بە روونی باسی ئەوە دەکات کە سنگ تـەنگ بوون روو دەدات کاتێك مـرۆڤ بە بەرگە هەوادا سەر دەکەوێت.



زانایان لـە کـاتی تـاقی کردنـەوەکانیان لەســەر فڕۆکــەوانان بۆیــان دەرکــەوت کــە مـرۆڤ لـەو بەرزاییيانـەدا تووشـی: هـیلاك بوون، سەرئێشە، حەز لە نووستن کردن و خـەواڵی بـوون، هەناسـە تونـدی و سـنگ تــەنگ بــوون دەبێــت، کــە ئەمــە یــەك دەگرێتـەوە لەگـەڵ ئـەوەی لـە ئایەتەکـەدا هاتووە، ووتـەی پەروەردگار ﴿... يَجْعَــلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا﴾ بە شێوەیەکی کورت و وورد و بـە چـەند ووشـەیەکی مـوعجیز بۆمـان روون دەکاتـەوە کـە مـرۆڤ لـەو بەرزییـە

زۆرانەدا لەڕووی فیسیۆلۆژی‌یەوە چی بەسەر دێت، ئەم ڕاستی‌یە زانستی‌یانەی لە ئایەتەکەدا هاتوون زانایانی پسپۆڕ لەم بوارەدا دوای لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی دەیان ساڵ پێ‌ی گەیشتن.

٤-قۆناغی ناڕەحەتی و شڵۆقی (المرحلة الحرجة) (لە بەرزیی ٢٥٠٠٠پێ و بەرەو سەرەوە): لەم بەرزی‌یەدا مرۆڤ بەتەواوەتی لەهۆش خۆی دەچێت، بەهۆی شکست هێنانی کۆئەندامی دەمار، ئەوەی بەسەر مرۆڤدا دێت کاتێك کە بەردەوام سەردەکەوێت بە بەرگە هەوادا و گەیشتنی بۆ بارێکی ناڕەحەتیی زۆر و شڵۆقی تەندروستی، سەلمێنەری ئەو ڕاستی‌یانەیە کە ئایەتەکە باسی کردوون: ﴿ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ﴾.




یەککرتنەوە لە نێوان مانای ئایەتە پیرۆزەکە و ئەوەی چەسپاوە لەڕووی زانستی‌یەوە بە ئاشکرا لەو نیشانانەدا دەردەکەوێت کە تووشی مرۆڤ دەبێت کاتێك دووچاری کەمی گازی ئۆکسجین دەبێتەوە لەو بەرزی‌یە زۆرانەدا، چونکە گۆڕانکاری‌یەکان لە سنگدا (کۆئەندامی هەناسەدان و دڵ) دەگاتە ئەوپەڕی.

لەدوای ئەم بارە ناهەمواره شکستی تەواو ڕوو دەدات لە کاری فیسیۆلۆژی دڵ و سی‌یەکاندا بەهۆی ئەو ئەرکە قورسەی دەکەوێتە سەریان، هاوشان لەگەڵیاندا شکست هێنان لە کۆئەندامی دەماردا ڕوودەدات، بەهۆی دابەزینی ترسناك لە پەستان و ڕێژەی ئۆکسجین لە بەرزی‌یە هەرە زۆرەکاندا، لێرەدا بۆمان دەسەلمێت کە قورئانی پیرۆز چەندین ئاماژەی داوە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) لە بوارە زانستی‌یە جۆرا و جۆرەکاندا، کە تەنها لە دوایی‌دا بەهۆی پێشکەوتنە زانستی‌یەکانەوە دەرکەوتووە و ڕاستی‌یەکەی ئاشکرا بووە.

## دیاردەی دابەزینی پەستانی هەوا (Dysbarism):

لەم حاڵەتەدا چەندین نیشانە ڕوودەدات کە هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ کشانی قەبارەی گازەکان و زیاد بوونیان لە لەشی مرۆڤدا، کاتێك مرۆڤ دووچاری دابەزینی پەستانی هەوا دەبێت لە بەرزاییە زۆرەکاندا (ئاسمان)، هەروەها تووشی گەشتیارانی ناو فڕۆکە دەبێت کاتێك کە ئامێرەکانی هاوسەنگ کردنی پەستان لەناو فڕۆکەکەدا شکست دەهێنێت و تێك دەچێت، ئەمیش بەهەمان شێوە دەبێتە هۆی کشانی گازەکانی لەش.

## نیشانەکانی دیاردەی دابەزینی پەستانی هەوا:

نیشانەکانی ئەم دیاردەیە دەکرێن بە دوو بەشەوە:

یەکەم: ئەو نیشانانەی کە بەهۆی کشانی ئەو گازانەی گلدراونەتەوە لە بۆشاییەکانی ناو لەشدا ڕوودەدەن، یاسای (بۆیل) ئەمەمان بۆ لێك دەداتەوە.

دووەم: ئەو نیشانانەی کە بەهۆی بەرزبوونەوەی گازە تواوەکانی ناو خانەکانی لەش دروست دەبێت بەشێوەی بڵقی گەورە (بە پلەی یەکەم گازی نایترۆجینە)، ئەم حاڵەتە ڕوودەدات کاتێك کە مرۆڤ دووچاری بەرزی زۆر و دابەزینی پەستانی هەوا دەبێت، ئەم بارەش یاسای (هێنری) بۆ گازەکان بۆمان لێك دەداتەوە.

ئەو گازی نایترۆجینەی کە لە لەشی مرۆڤدایە قەبارەکەی دەگاتە نزیکەی (١لیتر)، کە (٧٥ سانتیمەتر سێجای) لەخوێندا تواوەتەوە و ئەوی تری لەناو شانەکاندا تواوەتەوە، تێبینی کراوە کە چەوری توانای مژین و توانەوەی نایترۆجینی زیاترە (٩ ئەوەندەی خوێن و شانەکانی تر)، هەروەها دەبێت تێبینی ئەوەش بکەین کە کۆئەندامی مێشك و دەمار ڕێژەیەکی بەرزی لە چەوری تێدایە.

## نیشانەکانی بەشی یەکەم (گازە گلخواردوو و پەنگخواردووەکانی لەش):

١-گازەکانی کۆئەندامی هەرس و گەدە:

گەدە: ئەگەر گازەکانی ناو گەدە قەبارەیان زیاد بکات و بکشێن ئەوا گەدە خۆی دەکشێنن و وای لێدەکەن کە پەستان بخاتە سەر سییەکان، و دەبێتە هۆی

تێکدانی کرداری هەناسەدان، ئەمە روون کەرەوەیەکی ئاشکرایە بۆ سنگ تەنگ بوون لە بەرزاییەیە زۆرەکاندا وەك قورئان ئاماژەی پێداوە.

__ڕیخۆڵە گەورە (قۆڵۆن)__: زیاد بوونی قەبارەی گازەکانی ناو ریخۆڵە ئەستوورە و کشانیان دەبێتە هۆی دروست بوونی ئازارێکی زۆر لەناو سکدا کە هۆکارێکی هەست کردنە بە ناڕەحەتی زۆر (ضيق شديد) لە بەرزییە زۆرەکاندا.

٢-گازەکانی ناو سییەکان:

گازەکانی ناو سییەکان دەکشێن لە بەرزاییەیە زۆرەکاندا و قەبارەیان زۆر دەبێت و لەگەڵ هەناسە دانەوەدا دەچنە دەرەوە، ئەگەر مرۆڤ لەکاتی بەرز بوونەوەدا دەم و قورگی دابخات ئەوا بەهۆی ئەو گازە پەنگ خواردووانەوە شانەکان و بۆری هەواکانی ناو سییەکانی تووشی دڕان و پارچە بوون دەبن.

٣-گازەکانی ناو ددانەکان و شەویلگەکان: ئازارێکی زۆر دروست دەکەن کاتێك دەکشێن.

٤-گازەکانی ناو گوێی ناوەڕاست: بەهەمان شێوە بەهۆی کشانیانەوە ئازارێکی زۆر دروست دەکەن.

٥-گازەکانی ناو گیرفانە هەواییەکان (الجيوب الأنفية): ئەمانەش ئازار دروست دەکەن بەهۆی زیاد بوونی قەبارەیانەوە.

**نیشانەکانی بەشی دووەم (گازە بەرز بووەکان):**

ئەمانە وەك باسمان کرد بەهۆی بەرز بوونەوەی گازە تواوەکانی ناو شانەکانی لەش (گازی نایترۆجین) بەشێوەی بڵقی گەورە لەنێوان شانەکاندا لە بەرزاییەیە زۆرەکاندا دروست دەبن، نیشانەکان بریتین لە:

١-ئازاری جومگەکان: گازە بەرز بووەکان ئازارێکی زۆر لە جومگەکاندا دروست دەکەن.

٢-خنکان: ئازارێکی زۆر لەسەر سنگدا دروست دەبێت و مرۆڤ هەست بە ناڕەحەتی زۆر دەکات، کاتێك دووچاری پەستانی هەوای نزم دەبێت بەهۆی سەرکەوتنی بەئاسماندا، هەروەها بینراوە لەکاتی ئەم سنگ تەنگ بوونەدا نیشانەی تر هەیە،

وەك: كۆكەیـەكی ووشـكی بەئازار، ئـازارێكی زۆر لـە كـاتی وەرگرتنـی هەناسـەی قووڵدا، ئەمانەش دروست دەبن بەهۆی بەرز بوونـەوەی بڵقەكانی گـازی نـایترۆجین لـە شـانەكانی سـی‌یەكانەوە لـە دەوروبـەری موولوولـەكانی خـوێن و لەناویانـدا، هـەروەها بـەهۆی كـارتێكردن و ئاگـادار كردنـەوەی دەمـاری دەیـەمی دەرچـوو لـە مێشكەوە (Vagus Nerve)، ئەمەش ئەوەیە كەئایەتە پیرۆزەكە ئاماژەی پێداوە: ﴿وَ مَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَـيِّقًا حَرَجًــا﴾، لێرەدا ووشەی (الصـدر) –كە لە نـاویدا كۆئەنـدامی هەناسـەدان و كۆئەنـدامی دڵ وسـووڕانی خـوێن هەیـە– بـاس كـراوە بـەوەی كـە شـوێنی هەسـت كردنـە بـە ناڕەحـەتی لـە كـاتی سـەركەوتن (بـە ئاسمانـدا) بـۆ بـەرزیی زۆر، زانسـتی نـوێش سـەلماندوویەتی كـە ئێرەیـە تووشـی ناڕەحـەتی دەبێـت، و بەسـەر ئـەو كەسـانەدا دێـت كـە لـەناو فڕۆكـەدا تووشـی ئـەو پەستانە نزمەی هەوا دەبن لە بەرزییە زۆرەكاندا.

٣–پێست: بڵقە گـازە دروست بووەكـان لە ژێـر پێسـتدا كۆدەبنـەوە و دەبنـە هـۆی خوران و هەستیاری لە پێستدا (Urticaria).

٤–كۆئەندامی دەمار و مێشك: هەسـتی بینـین كـاری تێدەكرێـت، بـواری بینـین كـەم دەبێتەوە، لەوانەیە ئەو كەسە تووشی ئیفلیجـی تـەواو یـان نیمچە ئیفلیجی ببێـت، ئەمانە هەمووی بەهۆی بەرز بوونەوەی ئەو گازانەوە دەبێت.

٥–دابەزینی كـاری كۆئەنـدامی سـووڕانی خـوێن و دەمـار: لـەم حاڵـەتەدا ئەمانـە روودەدەن: سەرئێشـە، لـەهۆش خۆچـوون، بەركەوتـەی دەمـاری (صـدمة عصـبیة Neural Shock) و شین بوونەوەی لەش، ئەمە كۆتایی ئەو بارە زۆر ناڕەحەت و شلۆقەیە ﴿حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ﴾، كە سەرەنجامەكەی مردنە.

## پوختە:

ئێمـە توورەكـەی هـەوایی (سیكڵدانۆچـكە)مـان هەیـە لـەناو سـی‌یەكانماندا، كـە هـەوا دەچێتە ناویـان فوویـان تێدەكـات، كاتێـك كـە بـەرز دەبینـەوە بـە چینـەكانی بەرگە هـەوادا ئۆكسـجین و هـەوا كـەم دەبێتـەوە، و دەبێتـە هـۆی چوونـەوەیەكی ئـەم سیكڵدانۆچكانە و تەنگە نەفەسی و سنگ تەنگ بوون دروست دەبێت.

بە کورتی ئەم ئایەتە پیرۆزە دوو ئیعجازی تێدایە:

١-سەرەنجامی ئەو کەسانەی کە بە ئاسماندا سەردەکەون بەبێ هیچ ئامێرێکی پارێزەر، کە کەمی ئۆکسجین و دابەزینی پەستانی هەوا دەبێتە هۆی تووش بوونیان بە سنگ تەنگ بوون و ئەو ناڕەحەتی‌یانەی کە باسمان کرد و لە کۆتاییدا مردن، ئاشکرایە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) هیچ جۆرە هۆکارێك نەبووە بۆ سەرکەوتن بە ئاسماندا و زانینی ئەم راستی‌یە.

٢-ئایەتەکە ئاماژەی تێدا بۆ ئەوەی کە هەوا پەستانی هەیە، چونکە هۆکارێکی سەرەکی ئەو ناڕەحەتی‌یانەی سەرەوە بریتی‌یە لە دابەزینی پەستانی هەوا لەو بەرزایی‌یە زۆرانەدا.

دۆزینەوەی ئەو راستی‌یەی کە هەوا پەستانی هەیە دراوەتە پاڵ زانای ئیتاڵی (ئیڤانجیلیستا تۆرشەلی Torricelli, Evangelista)* لە ساڵی (١٦٤٣ز)دا، ئەم زانایە ئامێری پێوانی پەستانی هەوا (بارۆمیتەر Barometer)ی داهێنا {ئەم ئامێرە پێکهاتووە لە لوولەیەك شووشە کە پڕە لە جیوە بە درێژی ١مەتر و دادەنرێت لەناو دەفرێکدا بە هەڵگێڕاوەیی (بڕوانە وێنەی داهاتوو)}، ئەم جۆرە لە پەستان پێو پێی دەووترێت بارۆمیتەری جیوەیی (Mercury Barometer)، کاتێك تۆرشەلی ئەم ئامێرەی لە ئاستی رووی دەریا دانا بینی جیوەکە لە ئاستی ٧٦٠ملم دا دەوەستێت، و ئەگەر بە بەرزییدا ئەم ئامێرە ببرێت بینی کە ئاستی جیوەکە دادەبەزێت.

لێرەوە بۆی دەرکەوت کە پێوانەی پەستانی هەوا لە ئاستی رووی دەریا بریتی‌یە لە (٧٦٠ملم جیوە)، و هەتا بە ئاسماندا سەربکەوین ئەم پەستانە کەم

---

* ئەم زانایە لە ساڵی ١٦٠٨ی زایینیدا لە دایك بووە لە شاری (فیبەنزا)ی ئیتاڵیا، دەرچووی زانکۆی (رۆما)یە، لە ساڵی (١٦٤١– ١٦٤٢ز)دا وەك سکرتێری زانای بە ناوبانگ (گالیلۆ) کاری کردووە، لە پاش مردنی گالیلۆ لە ساڵی (١٦٤٢ز)دا سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە وەرگرتنی پلەی (پرۆفیسۆر لە فەلسەفە و بیرکاری)دا، و لە ئەکادیمیای (فلۆرەنتینا) وەك مامۆستا وانەی دەووتەوە، دروستکەری ئامێری بارۆمیتەر و چەند ئامێرێکی تری پەیوەندی دارە بە پەستانی هەواوە، ساڵی ١٦٤٧ی زایینی کۆچی دوایی کردووە.

دەبێتەوە، کە کاریگەریی گەورەی دەبێت لەسەر تەندروستیی مرۆڤ، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا چەندین جۆری تر لە بارۆمیتەر داهێنراون، کە یەکێك لەو جۆرە گرنگانە بارۆمیتەری هەوایییە (Aneroid Barometer) (بڕوانە وێنەکان).




***Mercury Barometer***
**A mercury barometer is an accurate and relatively simple way to measure changes in atmospheric pressure. At sea level, the weight of the atmosphere forces mercury 760 mm (29.9 in) up a calibrated glass tube. Higher elevations yield lower readings because the atmosphere is less dense there, and the thinner air exerts less pressure on the mercury.**

ئەم ڕووەی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا یەکێکە لە تازەترین ئەو زانیارییانەی کە زانستی نوێ پێی گەیشتووە لەم سەردەمەدا، کە سەردەمی زانست و زانینە، هەتاوەکو زانستیش بەرەو پێش بچێت و بوارەکانی فراوان ببێت، لایەنی تر لە لایەنەکانی ئیعجازی زانستی قورئان دەردەکەوێت، کە وا لە مرۆڤەکان دەکات باوەڕ بە قورئان بهێنن و بێنە ناو ئاینی ئیسلامەوە بەبێ جیاوازی لە نێوان زمان و ڕەنگی مرۆڤەکاندا.



**سەرچاوەکان:**

١-قورئانی پیرۆز.

٢-تەفسیری (الشوكاني): فتح القدير/ چاپی (دار إبن كثير)/ بيروت-دمشق.

٣- فەرهەنگی: لسان العرب/ چاپی (دار صادر)/ بيروت.

٤-نامیلکەی: (الإعجاز العلمي في القرآن والسنة في: الإرتفاعات العالية و الإحساس بالألم)/ لە بڵاوکراوەکانی: (هيئة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة).

**5- Aerospace Medicine / H.G. Armstrong.**

**6- Davison's Principles & Practice of Medicine\19th Edition 2002 Churchill Livingstone-UK.**

**7- Intrnet: www.tasabeeh.com, www.science4islam.com.**



# (2)

# ئیعجازی زانستی لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی تەنینەوەی نەخۆشی

**Robert Koch:**

**An illustration depicts German scientist Robert Koch at work in his laboratory. Considered the founder of modern medical bacteriology, Koch isolated the bacillus that causes tuberculosis in 1882. He won the Nobel Prize for physiology or medicine in 1905.**

زۆر کەس لە ئێمە دەبێتە نێچیری خەیاڵاتی نەخۆشی و ترسان لە تووشبوون بە دەردە جیاوازەکان، هەندێك کەس زۆر زیادە ڕەوی لەم ترسانەدا دەکەن و دەبێتە هۆی تاڵبوونی ژیانیان و سەرف کردنی بەشێکی زۆر لە سامانیان لەسەر ترسێك کە هیچ بوونێك یان گرنگی‌یەکی نی‌یە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) وەکو ڕێنموویکەری مرۆڤەکان ئەم ڕاستی‌یەی لەبیر نەچووە و لە چەند فەرموودەیەکیدا ئامۆژگاری مرۆڤەکانی کردووە لەم بارەیەوە، کە زانستی نوێی ئەمڕۆش پشتگیری تەواوی ئەو فەرموودانە دەکەن و ڕاستی‌یەکانیانی سەلماندووە، پێغەمبەر (ﷺ) جیاوازی کردووە لە نێوان ڕێگرتنی ڕاستەقینە لە تووش بوون بە نەخۆشی‌یە درمەکان و لەگەڵ ترسانی بێ‌هۆ و ناپێویست لەنەخۆشی، کە دەبێتە هۆی پشتگوێ خستنی نەخۆشەکان و گرنگی پێ‌نەدانیان و دوورکەوتنەوە لێیان.

سەبارەت بە ترسانی ناپێویست لە نەخۆشی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿لا عَدوی و لا طِیرةَ و لا هامَّة و لا صَفَر﴾ رواه البخاري ومسلم، الطيرة بمعنى التشاؤم، واتە: مرۆڤی موسوڵمانان نابێت لە تووشبوون بە نەخۆشی بترسێت، نابێت ڕەشبین بێت بە گشتی و بە تایبەتی لە هەندێك گیاندار یان لە مانگی سەفەر (کە مانگێکی عەرەبی‌یە)، مەبەستی سەرەکی ئەم فەرموودەیە دوورکەوتنەی موسوڵمانە لە ڕەشبینی و تەشائوم، چونکە ڕەشبینی هەستی مرۆڤ لەناو دەبات و دڵنیایی دەروون ناهێڵێت، هەست کردن بە جوانی ژیان دەمرێنێت، و مرۆڤ لە هەستان بە ئەرکەکانی سارد دەکاتەوە، چەندین مرۆڤی ڕەشبین دەبینین لە کۆمەڵگاکەماندا کە بەندی ترسەکانێتی و دوودڵی تەنگی پێ‌هەڵچنیوە، ئەمانە بوونەتە هۆی شکانی کەسێتی و نەمانی عەزیمەتی لە کارەکانی ڕۆژانەی‌دا، لەلایەکی ترەوە لە ژیاندا زۆر شت هەیە وا لە مرۆڤ دەکات ڕەشبین بێت، بەڵام موسوڵمان کە فەرموودەکەی پێغەمبەری بیر دەکەوێتەوە: ﴿لا طِیرةَ﴾ ئیتر ئەو کابوسی خەیاڵات و دوودڵی‌یانەی لەسەر لا دەچێت و دەچێت بۆ هەستان بە کارەکانی بەبێ ترس.

هەروەها فەرموودەکە ئاماژەی بۆ تەنینەوە و گواستنەوەی نەخۆشی داوە لەناو باسی ڕەشبینی‌دا و دەفەرموێت نابێت لە هەموو نەخۆشی‌یەك بترسێن، چونکە

ِسان لـه تووشـبوون بـه نەخۆشـی بـەبێ بنەمایـەکی راسـتەقینە و بـەهێز وەك
ەشبینی وایە و جۆرێکە لەو، چونکە ئەمیش وەهم و خـەیالاتێکی بێبناغەیـە و
ەك ئـەو کەسـە وایـە کـە بەهۆی بینینـی باڵندەیـەك یـان ئاژەڵێـك کارەکـەی یـان
ەفەرەکەی دەگۆڕێت.

ئیسـلام بـۆ ئـەوە هـاتووە کـە ئـەم وەهـم و خـەیاڵـە بێبناغانـە لـەناو بـەرێت لـە
ۆمەڵگادا، و مرۆڤەکان فێر دەکات کە هەموو لایەکی ژیان لەسەر چەند یاسا و
ەمایـەکی خـودایی دەمـەزراوە، و ئـەو شـتە پووچانەی وەك: رەشـبینی و رۆڵـی
ەنگێك یان تەیرێك لە رووداوەکانی ژیاندا، هیچ کاریگەرییەکیان نییە و ناتوانن
ەو یاسا دامەزراوانە بگۆڕن.

لـە لایـەکی تـرەوە زانسـتی پزیشـکیی نـوێ بۆمـان بـاس دەکـات کـە ئـەو
ەخۆشییانەی تووشی مرۆڤ دەبێت دەکرێن بە دوو بەشەوە:

-جۆرێکیان درمن و بڵاو دەبنەوە بەهۆی چەند رێگەیەکی دیاری کراو، کە ئەمانـە
ـەو نەخۆشـییانەن بـەهۆی زینـدەوەرە وردەکـانی وەك: ڤـایرۆس و بـەکتریا و
ینەوەری ووردی ترەوە تووشی مرۆڤ دەبن.

-جـۆری دووەمیـان ئـەو نەخۆشـییانەن کـە لـە کەسـێکەود بـۆ کەسـێکی تـر
گوێزرێنەوە و نابێت لێیان بترسێن.

هەروەها فەرموودەکە ئاماژە بەوە دەدات و بۆمان باس دەکات: کە تاکە هۆکاری
ووش بوون بە نەخۆشی بریتی نییە لە (عدوی) واتە تەنینەوە، تەنانەت ئەگەر
ۆکـاری نەخۆشـییەکانیش وەك: میکـرۆب، بچـنە نـاو لەشـەوە مـەرج نییـە کـە
ەخۆشییەکە دروست بکەن، بەڵکو چەندین فاکتەری تر هەیە کە دەبنە هۆکاری
روست بوون و گرتنی نەخۆشییەکان، بۆ نموونە بینراوە کە نەخۆشی ئیفلیجی
ندالَ (شلل الأطفال Poliomyelitis) نابێتە هۆی دروست بوونی نەخۆشییەکە
، ٩٩,٩٪ی ئەو منداڵانەی کە ڤایرۆسەکە وەردەگرن و دەچێتە لەشیانەوە و هەر
ەستیشی پێناکەن. تـەنها یـەك منـداڵ لـە ١٠٠٠منداڵدا کە ڤایرۆسەکە دەچێتە
ەشیانەوە تووشی ئیفلیجی منداڵ دەبن.

لەوانەیە چوونە ناوەوەی ئەو میکرۆبانە بۆ ناو لەش هەر خۆیان هۆکارێکی چارەسەر بن، ئەوەتا هەر لە ڤایرۆسی ئیفلیجی منداڵدا بینراوە کە چوونە ژوورەوەی ئەم ڤایرۆسە لە تەمەنی منداڵیدا بۆ ناو لەش دەبێتە هۆی پاراستنی ئەو کەسە لە تووش بوون بەم نەخۆشی‌یە بۆ هەموو تەمەنی، ئەم بیروبۆچوونە بوو کە بووە بنەمای داهێنانی کوتانەکان.

شلەی کوتان بریتی‌یە لە ڤایرۆس یان بەکتریای نەخۆشی‌یەکە یان بەشێکیان، کە ئەوەندە لاواز دەکرێت کە گەشەنەکات و بەشێوەی دەرزی یان قەترە دەدرێت بە منداڵ، ئەم کوتانانە کە دەچنە لەشەوە دەبنە هۆی چالاك کردنی سیستەمی بەرگری لەش بۆ دروست کردنی دژەتەن (اجسام مضادة Antibodies) لە دژی ئەو میکرۆب و ڤایرۆسی نەخۆشی‌یانە، و ئەم دژە تەنانە بۆ ماوەیەکی زۆر دەمێننەوە لە لەشدا و دەبنە هۆی پاراستنی ئەو کەسە لە تووشبوون بە نەخۆشی‌یە راستەقینەکە لە داهاتوودا، کەواتە تەنها (عدوی) و چوونە ژوورەی میکرۆب بۆ لەش نابێتە دروستبوونی نەخۆشی.

جارێکی تر دووپاتی دەکەینەوە کە مانای سەرەکی فەرموودەکە رێگە گرتنە لە رەشبینی بە هەموو جۆرەکانی‌یەوە، و مانای (لا عَـدوی) هەر لە چوارچێوەی رێگرتنە لە رەشبینی بە نەخۆش و نەخۆشیی، و ئاماژەشە بۆ ئەوەی کە نەخۆشی تەنیا بە (عدوی) دروست نابێت و فاکتەری تر رۆڵی تێدا دەبینن، و زۆر جاریش (عدوی) دەبێتە پارێزەرێك بۆ مرۆڤ نەك فەوتێنەری.

هەروەها موسوڵمانی راستەقینە باوەڕی پتەوی بەوەش هەیە کە هەموو شتێك لە گەردووندا بە ویستی خودایی هەڵدەسووڕێت، وەك لە بەسەرهاتێکدا هاتووە لەبارەی إبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خودای لێبێت): ﴿إنَّ إبراهيم (عَلَيه السَّلام) قال: يا رَبِّ ممَّن الداء؟ قال: منّي. قال: فَممَّن الدواء؟ قال: منّي. قال: فما بالُ الطبيب؟ قال: رَجُلٌ أُرْسِلُ الدواءَ على يديه﴾* واتە: (إبراهیم) خەلیلی خودا لە خودای پرسیوە: خودایە

---

* بڕوانە کتێبی: الطب للنبوي لابن القيم الجوزية ص١٢.

ەخۆشی لە کێوەیە؟ خوداش وەڵامی دایەوە: لە منەوەیە، پاشان پرسی: ئەی ەرمان و چارەسەر لە کێوەیە؟ خوداش فەرمووی: هەر لە منەوەیە، دوایی پرسی: ئەی پزیشك کاری چی‌یە؟ پەروەردگار وەڵامی دایەوە: پیاوێکە کە چارەسەر بەهۆی ئەوەوە دەنێرم، واتە پزیشك تەنیا هۆکار و سەبەبی چارەسەرە.

بەڵام با بزانین ئەو فەرموودانەی سەرەوە مانای ئەوە ناگەیەنن کە هیچ کاتێك لە گواستنەوەی نەخۆشی خۆمان نەپارێزین، بەڵکو مانای ئەوەیە وەك باسکرا کە بە نەخۆشی رەشبین نەبین و هەمیشە پشت بەخودا ببەستین بۆ ئەوەی بمانپارێزێت، لە هەمان کاتدا نابێت ئەو هۆکارانەی کە لە نەخۆشی درم دەمانپارێزێت پشتگوێ بخەین، بەڵکو دەبێت بەردەوام هەوڵی دۆزینەوەیان بدەین و ئەگەر پێویست بکات دەبێت هەموو رێگایەکی پێویست بگرینە بەر بۆ خۆپارێزی لە نەخۆشی، چونکە هەر پێغەمبەر (ﷺ) خۆی ئامۆژگاری ئەوەمان دەکات کە لە نەخۆشی خەتەرناك خۆمان بپارێزین.

سەبارەت بە خۆپاراستن لە نەخۆشی درم و گوازراوە لە فەرموودەکەیەکی‌دا هاتووە: ﴿فِرَّ مِنَ المَجذومِ فِرارَكَ مِنَ الأَسَدِ﴾ رواه البخاري، واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: رابکە لەدەست ئەو کەسەی کە تووشی نەخۆشی (گولیی) بووە، وەك ئەوەی کە لە دەست شێر رادەکەیت، بێگومان ئەم راکردنە بە مەبەستی خۆپاراستن و تووش نەبوونە بەم نەخۆشی‌یە خەتەرناکە کە نەخۆشی گولی‌یە (الجذام Leprosy).

## کورتەیەك دەربارەی نەخۆشی گولیی؛

ئەم نەخۆشی‌یە زۆر درمە و بەهۆی بەکتریایەکەوە تووشی مرۆڤ دەبێت کە شێوەیەکی درێژکۆلەی چیلکەیی هەیە و زۆر لە شێوە و قەبارەدا لە بەکتریای درێژکۆلەی نەخۆشی سیل (تدرن Tuberculosis) دەچێت، و ناوی (Mycobacterium Leprae)ە، کە ماوەی نزیکەی سەدەیەکە دۆزراوەتەوە.

ئەم نەخۆشی‌یە یەکێکە لە مەترسیدارترین ئەو نەخۆشی‌یانەی کە تووشی پێستی مرۆڤ دەبێت بە پلەی یەکەم، ئەم نەخۆشی‌یە سێ جۆری سەرەکی هەیە:

١- گـول شـێرپی (الجـذام الأسـدي Lepromatous Leprosy). ٢- گـول تـەدەرونی (الجذام الدرني Tuberculoid Leprosy). ٣- گولیی هاوبەش لەنێوان ئەم دوانەدا (Borderline Leprosy).



# چەند نموونەیەك لە بەکتریای چیلکەیی نەخۆشی گولیی لەژێر ووردبیندا

زانستی پزیشکی نوێ تا ئێستا کۆنترۆڵی تەواوی ئەم نەخۆشییەی بۆ نەکراوە، نەخۆشییەکە تووشی کۆتاییەیە دەمارییەکان دەبێت، بەتایبەتی لە پەلەکانی سەرەوەدا و وا لەو کەسە دەکات کە هەستەکانی وەك (هەست کردن بە ساردیی و گەرمیی و ئازار)ی نەمێنێت، هەروەها پووکانەوە روودەدات لە ماسولکەکانی دەستەکان و قاچەکاندا و ئێسکەکانیشیان تووشی داخوران دەبێت، بلّق و جەراعەت لە پێستدا روودەدات، نەخۆشی گولیی تووشی گونەکانی پیاویش دەبێت و دەبێتە هۆی نەزۆکی و نەمانی توانای وەچە خستنەوە لە پیاودا، کەواتە مرۆڤی گول بێ‌وەچە دەبێت، لە پێستدا وەك چەند بلّقێك و پەڵەیەکی جیاواز لە شکڵ و قەبارەدا دەردەکەوێت، ئەم پەلّانە بە نەمانی هەست و ئارەق کردنەوە تێیاندا و بە کاڵی رەنگیان جیادەکرێنەوە، ئەمانە و چەندین کاریگەریی و نیشانەی تر کە لەسەر ئەندامە جیاوازەکانی لەش لە جۆرە جیاوازەکانی گولییدا دەردەکەوێت.

لەبەر خەتەرناکی و درمیی ئەم نەخۆشی یەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئامۆژگاریمان دەکات کە لە مرۆڤی گول رابکەین، تەنانەت لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: نابێت زۆر سەیری مرۆڤی گولیش بکەین: ﴿لا تُدِيمُوا النَّظَرَ الى المَجْذومين﴾ حديث رواه ابن ماجة، ورد في إرشاد الساري لشرح صحيح البخاري، چونکە لە لایەکی ترەوە زۆر سەیر کردنی گول دەبێتە تێکدانی دەروونی و هەست کردنی بە گەورەیی ناڕەحەتی یەکەی.

جۆری یەکەمی گولیی کە جۆری شێریی یە زۆر باوترە لە جۆرەکەی تر، لەگەڵ روودانی ئەو گۆڕانکاری یانەی کە باسمان کرد لەم جۆرەیاندا دەم وچاوی نەخۆشەکە مووی پێوە نامێنێت، ئاوساوی و پەڵەی لێپەیدا دەبێت، و روخساری مرۆڤی گول بەهۆی گۆانکاری یەکان و تێکدانەکانی میکرۆبی نەخۆشی یەکەوە وەکو شێری لێدێت (Lion Face) (بڕوانە وێنەی خوارەوە).



**بڕوانە لێکچوونی گەورەی نێوان روخساری نەخۆشی گول و روخساری شێر**

ئەوەی سەرنج راکێشە ئەوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: لە مرۆڤی گول رابکە وەك چۆن لە شێر رادەکەیت، واتە مرۆڤی گول وەك شێر وایە، و وەك لەسەرەوە روون کراوەتەوە ئەو کەسەی تووشی نەخۆشی گولی دەبێت دەم وچاوی وەك شێوەی شێری لێدێت، بەڕاستی سەرسوڕهێنەرە چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لە ژیانی دا مرۆڤی گولی نەدیوە، تەنانەت لە هەموو ژیانیدا یەك جار مرۆڤێکی گول هات بۆ موسوڵمان بوون و پەیماندان، ئەم فەرموودەیە ئیمامی موسلیم گێڕاوی یەتەوە: کە کاتێك وەفدی هۆزی (ثقیف) هاتن بۆ موسوڵمان بوون و پەیماندان ئەوە بوو یەکێکی گولیان لەگەڵ بوو، پێغەمبەر یەکێکی نارد بۆ لای کە

پـێی بڵێـت: بگـەڕێرەوە ئـەوا پێغەمبـەر موسـوڵمانێتی و پـەیمانی لێوەرگرتیـت و پێویست ناکات بچێت بۆلای، کەواتە لەم فەرموودەیەوە گرنگـی خۆپاراسـتنمان بـۆ دەردەکەوێت لە تووش نەبوون بە نەخۆشی، دەتوانین بڵێین ئەم فەرموودەیـە یەکەم بنەمای راست و زانستی‌یانەیە بۆ زانستێکی زۆر گرنگ کە لـە رۆژگـاری ئـەمڕۆدا زۆر گرنگی پێدراوە و بەرەوپێش چووە کە ئەویش زانستی خۆپارێزی پزیشکی‌یە (علم الوقاية Preventive Medicine)، کەواتـە زانسـتی ئـەمڕۆ بـە تـەواوەتی پشتگیری ئەم فەرموودەیە دەکات و ئیعجازە زانستی‌یەکەی دەسەلمێنێت، زانایانی زانسـتی خۆپاراسـتن هەمیشـە و بـەردەوام ووتویانـە و دەڵـێن: خۆپاراسـتن لـە چارەسەر کردن باشترە.

لێرەوە بۆمـان روون دەبێتـەوە کە هـیچ ناڕێکی‌یەکیش نی‌یە لە نێوان ئـەو دوو فەرموودەیەی کە باسمـان کـردن: ﴿لا عَدوى و لا طِيَرَةَ﴾، ﴿فِرَّ مِنَ المَجْذومِ فِرارَكَ مِـن الأَسَدِ﴾، چونکە لـە فەرموودەکانـەوە دەگەینـە چـەند راسـتی‌یەك کە زانسـتی نوێ بۆمان دەسەلمێنێت:

مـرۆڤ دەبێـت هـەر حاڵـەتێکی نەخۆشـی بـەجیا حیسـابی خـۆی بـۆ بکـات، ئـەو نەخۆشی‌یە درمانەی کە مەترسی‌یەکی راستەقینەن بـۆ تـەندروستی وەك: گـولیی، تـاعوون، کـۆلێرا، گرانـەتا، هـەوکردنی جگـەری ڤایرۆسـی ...... هتـد، ئەمانـەن کـە پێغەمبەر(ﷺ) مەبەستی بووە مرۆڤ خۆیانی لێبپارێزێت، لەبـەر ئـەوەی خەتـەرناکن بۆ تەندروستی تـاك و کۆمـەڵگا، بەڵام خـەیاڵات و ئـەوهام لە بـارەی تووشـبوون بـە نەخۆشی‌یەوە و رەشبینی، دەبێـت ئاوڕیـان لێنەدەینـەوە، و تـەوەکولی تـەواومان بـە پەروەردگار بێت (لەگەڵ وەرگرتن و بەکار هێنانی هۆکارەکان)، و بزانین کە (عدوى) و نەخۆشـی گواسـتنەوە تـەنها بـە وویسـتی خـودا دەبێـت و خـوای گەورەیـە کـە دروسـتکەر و بەڕێوەبـەری هـەموو گەردوونـە، هـەروەها مرۆڤـەکان بشـزانن کـە هەرکەسێك دووچاری وەرگرتنی میکرۆب بوو مەرج نی‌یە نەخۆش بکەوێت، لێرەوە مرۆڤەکان دەروون ئارام دەبـن لـە ژیانیانـدا و بـەو گەشـبینی‌یەوە دەڕواننـە هـەموو شتێك و یارمەتیدەر و پشتیوانی ساغ و نەخۆشەکانیش دەبن.

ئێستا با بچینە خزمەتی فەرموودەیەکی دیکە لەم بارەیەوە: قال رسول الله (ﷺ): ﴿الطاعون رِجْزٌ أُرسِلَ على طائفة من بني إسرائيل و على مَنْ كان قَبلَكُم، فإذا سَمِعتُم به بِأرضٍ فلا تدخلوا عليه، و إذا وَقَعَ بِأرضٍ وَأنتُم بها فلا تخرجوا منها فِراراً مِنْهُ﴾ رواه البخاري و مسلم، واتە: نەخۆشی تاعوون غەزەب و سزایەك بووە خودا بۆ كۆمەڵێكی لە (بەنی ئیسرائیل) و میللەتانی پێشووتر ناردبوو، ئەگەر گوێتان لێبوو لە شوێنێكدا بڵاوبۆتەوە مەچنە ئەو شوێنە، بەڵام ئەگەر لە شوێنێكدا بڵاوبوەوە كە خۆتانی لێبوون ئەوا لەو شوێنە دەرمەچن و لەترسی ڕامەكەن.



ناوچە تووشبووەكان بە ( تاعون ) لە جیهاندا

## چەند زانیارییەك دەربارەی نەخۆشی تاعوون:

فەرموودەكە نەخۆشی تاعوونی كردووە بە نموونە، تاعوون (الطاعون Plague) نەخۆشییەكی زۆر مەترسیدار و درماوییە، لە كۆنەوە ناسراوە بە مردنی ڕەش (Black Death)، هۆكاری ئەم نەخۆشییە بەكتریایەكی چیلكەیی وورده (تیرەكەی یەك ونیو مایكرۆمیتەرە) ناسراوە بە (Yersinia Pestis)، ئەم میكرۆبە بەهۆی كێچ كە لەسەر لەشی قرتێنەرەكانی وەك: مشك و جرج دەژی بۆ مرۆڤ دەگوێزرێتەوە، كاتێك ئەم كێچانە مرۆڤ دەگەزن میكرۆبەكە بۆ مرۆڤ دەگوێزنەوە، میكرۆبەكە دەچێتە ناو سیستمی لیمفی مرۆڤەوە و ئەگەر گەستنەكە لەبەشی خوارەوەی لەشدا بێت لیمفە گرێكانی بەر مووسەڵان (ناوچەی نێوان ڕان و خوارووی سك) دەئاوسێن، و ئەگەر بەشی سەرەوەی لەش بێت لیمفە گرێكانی بن

باڵ دەناوسێن*، ماوەی گۆشگرتن (فترة الحضانة)ی نەخۆشی تاعوون پێش دەرکەوتنی نیشانەکانی نەخۆشییەکە لە کەسی تووشبوودا لە نێوان (٣-٦) ڕۆژدایە.

ئەم نەخۆشییە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا زۆر بە باشی ناسراوە و خەڵکی زۆر لێی ترساون و هیچ جۆرە چارەسەرێکی نەبووە، لە زوربەی شوێنەکانی جیهاندا وەك شەپۆلێکی تەنینەوە بڵاودەبووەوە، بە تایبەتی لە ئەورووپادا کە بەشێوەیەکی بەربڵاو لە سەدەی چواردەیەمی زایینیدا لە زوربەی وڵاتانی ئەورووپادا بڵاوبووەوە و بووە هۆی لەناوچوونی زیاتر لە ٢٥ملیۆن کەس، هۆکاری گەیشتنی ئەم دردە بۆ ئەورووپا لەڕێی تەتارەکانەوە بوو کە چەندین وڵاتی خۆرهەڵاتی ئەورووپایان لەو کاتەدا داگیرکرد، هۆکارێکی تر بریتی بوو لەو کەشتیوانە ئەورووپییانەی کە هاتووچۆی بازرگانییان دەکرد، و لەناو کەشتییەکانیاندا مشك و جرجی هەڵگری نەخۆشییەکە کە دەچوونە ناو کەل وپەلەکانەوە، گوێزرانەوە و لە ئەورووپادا نەخۆشییەکەیان بڵاوکردەوە.

## ڕاڤەی فەرموودەکەی سەرەوە:

ڕێگرتن لە موسوڵمان لە چوونە ناوەوەی شوێنی تووشبوو بە نەخۆشی ئاشکرایە، بەبێ هیچ زانیارییەکیش لەبواری پزیشکیدا دەزانرێت کە بۆ پارێزگاری ژیانیان و تووش نەبوونیانە بە نەخۆشییەکە، بەڵام ڕێگرتن لەو

---

* لە فەرموودەیەکی تری پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە: ﴿عن عائشة أم المؤمنين (رضي الله عنها) أنّها قالت للنبي (ﷺ): الطعن عرفناه، فما الطاعون؟ قال (ﷺ): غُدّةٌ كَغُدَّةِ البعير تَخْرُجُ من المراق أو الإبْط﴾ رواه البخاري، واتە: دایکی ئیمانداران (عائیشە) لە پێغەمبەری پرسی تاعوون چییە؟ ئەویش فەرمووی: گرێیەکە وەك گرێی لەشی ووشتر، لە ناوچەی بەر موسەڵان یان بن هەنگل و بن باڵی مرۆڤ دەردەچێت. بەڕاستی موعجیزەیە کە پێغەمبەر پێش ١٤٠٠ساڵ لەمەوبەر بەو شێوە وردە وەسفی نەخۆشی تاعوونی کردووە، بە تایبەتی کە پێغەمبەر لە ژیانیدا نەخۆشی تاعوونی نەدیوە و لە هەموو دورگەی عەرەبیشدا نەناسراوە، بەڵگەشمان پرسیاری عائشەیە لەو بارەیەوە، تەنها ئەوەندە دەڵێین کە پێغەمبەر لەخۆیەوە قسەی نەکردووە ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى، إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى﴾ (النجم:٣-٤).

کەسانەی لە شوێنێکدا دەژین کە تووشبووە بە نەخۆشی یەکی درمی وەك تاعوون کە نەچنە دەرەوە و هەر لەشوێنی خۆیاندا بمێننەوە، بە تایبەتی کەسانێکی تەندروست کە هیچ جۆرە نیشانەیەکی نەخۆشی یان تێدا نی یە، شتێکی سەیر و قورسە بۆ تێگەیشتن بۆ کەسانێکی ئاسایی کە شارەزایی یان لە بواری پزیشکی دا نی یە!! هەروەها عەقڵ و مەنتیق بەسەرماندا دەسەپێنێت کە ئەو کەسەی لە شارێکی درماوی دا بێت، دەبێت رابکات بۆ شوێنێکی سەلامەت لەو نەخۆشی یە، بۆ ئەوەی تووش نەبێت، چۆنکە راکردن لە نەخۆشی و تیاچوون غەریزەتێکی ئاسایی یە لە هەموو مرۆڤێکدا.

لەولنەیە کەسانێکیش هەبن کە بڵێن مرۆڤ دەبێت لەدەست تیاچوون رابکات، لەبەر ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلاَ تُلقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾ (البقرة:١٩٥)، بەبێ ئەوەی لە مانای راستەقینەی تیاچوون لەم ئایەتە پیرۆزەدا تێبگەن، لێرەدا رۆڵی شەریعەتی خوای پەروەردگار دێت، کە دەست پێگرتنی دەبێتە رزگاری و سەرفرازی دونیا و دوارۆژ، کە ئەم مەسەلەیە و هەموو پێویستی یەکی ژیان روون دەکاتەوە، و بۆمان دەردەخات کە ئەوەی بە زەرەر و تیاچوونی دەزانیت زۆرجار دەبێتە هۆی رزگاربوونت، ئەگەر شەریعەت فەرمانی پێکردبێت، ئەمەش ئەوە بووە کە موسوڵمانان لە هەموو سەردەمەکاندا کردوویانە و مایەی سوودمەندی بەردەوام و رزگاری و سەرفرازی یان بووە.

زانستی پزیشکیی نوێ لە بواری خۆپارێزیی و گواستنەوەی نەخۆشی دا شتی سەرسوڕهێنەری دۆزیوەتەوە لەم بوارەدا، کە راستیی و گەورەیی فەرموودەکەمان بۆ روون دەکاتەوە، زانایان و پزیشکان دەڵێن کاتێك پەتایەك یان درمێك لە شوێنێکدا بڵاودەبێتەوە و کاتێك نیشانەکانی نەخۆشی یەکە لەسەر هەندێك لە خەڵکەکەی دەردەکەوێت، لەو قۆناغەدا زوربەی خەڵکی ئەو ناوچەیە بوونەتە هەڵگری میکرۆبی نەخۆشی یەکە و چۆتە لەشیانەوە، با نیشانەکانی نەخۆشی یەکەش تێیاندا دەرنەکەوتبێت، بە تایبەتی ئەمە بینراوە لە کاتی دەرکەوتنی نەخۆشی تاعووندا، کەواتە مەرج نی یە ئەو کەسەی میکرۆبی نەخۆشی

دەچێتە لەشــی‌یەوە تووشــی نەخۆشــی‌یەکە خــۆی ببێــت، چــونکە دەرکــەوتنی نەخۆشی‌یەکە بەندە بە چەندین هۆکاری ترەوە، کە گرنگترینیان بریتی‌یە لە باری کۆئەندامی بەرگری لەش، کە لە زوربەی هەڵگرەکانـدا رێگر دەبێت لە دەرکـەوتنی نەخۆشی‌یەکە (لە نەخۆشی ئیفلیجی منداڵاندا بینراوە کە ٩٩،٩٪ی ئەو کەسانەی ڤایرۆسەکە دەچێتە لەشیانەوە چاك دەبنەوە بەبێ سەرەنجام، و تـەنها بـۆ ماوەیـەك هەڵگری ڤایرۆسەکە دەبن)، ئەو کەسانە تەنها هەڵگری میکرۆبەکە دەبن.

مەترسی‌یەکە لـەم کەسـە هەڵگرانەدایە چونکە بە شـکڵ ئاسایی و لـەش سـاغ دەردەکەون، بەڵام میکرۆبی نەخۆشـی‌یەکە لـە لەشـیاندایە و بڵاویشـی دەکەنـەوە، زۆرێـك لـە نەخۆشـی‌یە درمـەکانی وەك: گرانـەتا (تایفۆئیـد)، سکچـوونی ئـەمیبی، کـۆلێرا و تـاعوونیش، سـووڕی نەخۆشـی‌یەکەی بـەم شـێوەیە دەبێـت و هۆکـاری سـەرەکی بڵاوبوونـەوەیان بریتی‌یـە لـەو کەسـانەی کـە هـەڵگری میکرۆبەکـەن بـەڵام خۆیان نەخۆش نین.

لەلایـەکی تـرەوە لـە زوربـەی نەخۆشـی‌یەکاندا کاتێـك هەیـە پـێش پەیـدابوونی نیشانەکان، کە هەر لە سەرەتای چوونە ژوورەوەی میکرۆبەکە بۆ نـاو لـەش دەسـت پێ‌دەکـات و پـێ‌ی دەوترێـت مـاوەی گۆشـگرتن یـان گەشـەکردنی نەخۆشـی‌یەکە (فترة الحضانة Incubation Period)، لـەم ماوەیـەدا میکرۆبەکە لەناو لەشدا زیاد دەکات و گەشەدەکات، بۆ نموونە: ماوەی گۆشـگرتنی ڤایرۆسـی (ئینفلوەنزا) یـەك یـان دوو رۆژ دەخایـەنێت، بـەڵام لـە ڤایرۆسـی نەخۆشـی (هـەوکردنی جگـەری ڤایرۆسی‌دا) لەوانەیە بگاتـە زیـاتر لـە ٦مـانگ، ئـەو کەسـەی لـە مـاوەی گۆشگرتنی میکرۆبەکەدایە زۆر درماوی‌یە و نەخۆشی‌یەکە بڵاودەکاتەوە، و خـەڵکیش خۆیـانی لێ‌ناپارێزن لەبەر ئەوەی زۆر ئاسایی و تەندروست دیارە.

هـەر بۆیـە و لـەژێر رۆشـنایی ئـەم راسـتی‌یە نوێیانـەدا زانایـان و پزیشـکان ئامۆژگاری ئەو کەسانە دەکەن کە لە ناوچەیەکدان کە نەخۆشی‌یەکی درمـی تێدا بڵاوبووەتەوە و هەروەها بەرپرسانی ئەو ناوچەیەش ئاگادار دەکەن کە نەهێڵن هیچ کەسێك لەوێ بچێتە دەرەوە، تـاوەکو بـە پشـکنینی تایبـەت نـەزانرێت کـە هـەڵگری

نەخۆشـی یەکە نـین، کـە ئـەم بڕیاردانـەش زۆر زەحمـەت و گرانـە، چـونکە چـوونە دەرەوە هـیچ سـوودێکی نی یـە (لەبەرئـەوەی ئـەوەی رووی دابێـت تـازە بـووە!) و مەترسیداریشـە، لەبەرئـەوەی هـەر کەسێك کـە هـەڵگر بێـت لـەو شـوێنە دەرچـێت دەبێتە هۆی بڵاوکردنەوەی میکرۆبەکە بۆ شوێنی تر و کۆنترۆڵ کردنی تەنینەوەی نەخۆشی یەکە زۆر زەحمەتتر دەبێت.

سەبارەت بەم بابەتە پرسیار کرا لە (دکتۆر جۆن هانۆڤەر لارسن) کە بەرپرسی پزیشـکانی نەخۆشـخانەی رەسمـی شـاری (کۆبنهـاگن)ە لـە وڵاتـی دانیمـارك، و خۆیشـی پسـپۆڕی بـەکتریۆلۆجی و بـڵاو بوونـەوەی نەخۆشـی یە، کـە ئەگـەر لـە شوێنێکدا بووین و لەو ناوچەیەدا نەخۆشی یەکی درمی وەك تاعوون بڵاوبووەوە، دەبێت ئێمە چی بکەین؟ ئایا دەرچین لەو شوێنە و رابکەین؟

- ئەویش وەڵامی دایەوە: ئەم ووتەیە زۆر کۆن و کلاسیکی یە، چونکە زانستی پزیشکیی بۆی سەلماندووین کە کاتێك نیشانەکانی نەخۆشی یەکە دەردەکەوێت لەسـەر خەڵکەکـە، لـەو کاتـەدا زوربـەی زۆریـان بوونەتـە هـەڵگری میکرۆبەکـە و لـەماوەی گۆشـگرتنیدان، لـە نەخۆشـی تاعوونـدا بینـراوە کـە تـەنها ٨-١٣٪ی خەڵکەکە تووشی نەخۆشی یەکە دەبن بەڵام ٧٠٪-٩٠٪یان دەبنە هەڵگر، ئەمانە کۆئەنـدامی بـەرگری یان بـەهێزە و بەسـەر میکرۆبەکـەدا زاڵ دەبێـت و زەرەر بـە لەشیان ناگەیـەنێت، بەڵام تـا ماوەیـەك هـەر لـە لەشیاندا دەمێنێتـەوە، ئەگـەر مـن بەرپرسی شارێك بوومایە و ئەو شارە نەخۆشی یەکی درمی تێدا بڵاوببوایەتەوە ئەوا هەرچی سـەربازم هەبوایـە دەمهێنـان و ئابڵوقـەی شـارەکەم پـێ دەدان، و نەمـدەهێڵا کـەس بچێتە نـاوەوە و لێی بچێتە دەرەوە، چـونکە ئەوانـەش کـە لـەش سـاغن و نەخۆشی یەکەیان تێدا دەرنەکەوتووە مانـەوەیان لـەو شـوێنە زەرەری نی یـە بۆیـان، چونکە بـەرگری یان وەرگرتـووە لـە دژی میکرۆبەکـە، ئەمانـە کە لـەش سـاغ دیـارن ئەگەر بچنە دەرەوە بۆ شوێنی تر میکرۆبی نەخۆشی یەکە بڵاو دەکەنـەوە و لەوانەیـە ببنە هۆی تیاچوونی ملیۆنەها کەس.

+پرسیار: تا کەی ئەم ئابڵووقەیە بەردەوام بێت باشە؟

- (د. جۆن هانۆڤەر): تا ماوەیەکی کەم پێویست دەکات بەردەوام بێت، تاوەکو ئەو کاتەی کە هەڵوێست و سیفەتەکانی ئەم میکرۆبە دەگۆڕێت، بەوەی کە خەسڵەتێکی بۆماوەیی نوێی بۆ دروست دەبێت کە وای لێدەکات خاسیەتی تەنینەوە و بڵاوبوونەوەی بۆ کەسانی دیکە لەدەست دەدات و ئیتر زەرەری نامێنێت*.

لێرەوە گەورەیی ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەرمان بۆ دەردەکەوێت بە ڕێگە گرتن لە خەڵکی ئەو شوێنەی کە تاعوونی تێدا بڵاوبووەتەوە لەوەی لەو شوێنە رابکەن، لە هەردوو رووی تەشریعی و زانستییەوە، کە لەمڕۆدا و لەپاش ١٤سەدە بە روونی ئیعجازە زانستییەکەی دەرکەوتووە، لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) بە شێوازێکی زۆر هەرەشە ئامێز دووبارە رێدەگرێت لە موسوڵمانان کە لەو شوێنە رانەکەن کە تاعوونی تێدا بڵاوبووەتەوە، ئەوەتا دەفەرموێت: ﴿عن جابر (رضي الله عنه) قال: قال: رسول الله (ﷺ): الفارُّ من الطاعونِ كالفارِّ مِنَ الزَّحْفِ و الصَّابرُ فيـه كالصَّـابرِ في الزَّحْـــفِ﴾ رواه احمد، واتە: ئەو کەسەی لە شوێنێك رابکات کە تاعوونی تێدا بڵاوبووەتەوە وەك ئەو موسوڵمانە وایە کە لە شوێنی رووبەڕوو بوونەوەی موسوڵمانان و بێباوەڕان لە مەیدانی جەنگدا رادەکات (کە یەکێکە لە تاوانە هەرە گەورەکان)، پێغەمبەر (ﷺ) دەیزانی کە مرۆڤ چەند حەز لە رزگار بوونە و دەست بە ژیانەوە دەگرێت، بۆیە بەم شێوە توند و تیژانە هەرەشەی خودایی لەو کەسانە دەکات کە لە ترسی تاعوون شوێنی خۆیان جێدەهێڵن، چونکە ئەم دەرچوونەی ئەم کەسە هەڵگرانە بەڵاکە گەورەتر دەکات و کۆنترۆڵ کردنیشی دەبێتە کارێکی لە توانا بەدەر.

موسوڵمانانیش پابەندیی تەواویان بەم فەرمانانەوە هەبووە و بەردەوام جێبەجێیان کردووە، لە نموونەی ئەو پابەندییە: هەردوو بوخاری و موسلیم لە

---

* بۆ درێژەی ئەم پرسیارانە بڕوانە ئەو چاوپێکەوتنەی کە گۆڤاری (الإعجاز العلمي) لەگەڵ (د. جۆن هانۆڤەر لارسن) ئەنجامیداوە، و لە ژمارە (٤)ی گۆڤارەکەدا بڵاوکراوەتەوە.

(عبدالله ی کوڕی عەبباسەوە) (ڕەزای خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕنەوە: کە خەلیفەی موسوڵمانان عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خوای لێبێت) لە مەدینەوە دەرچوو بۆ سەردانی وولاتی شام، کاتێك گەیشتە دێی (سەرغ) کە نزیکی شامە ئەمیری وولاتی شام (ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕراح) لەگەڵ سەربازاندا هاتنە پێشوازی، و پێیان ووت کە نەخۆشییەکی درم و پەتایەك (کە نەخۆشی تاعوون بووە) لە شام بڵاوبۆتەوە، ئەوەبوو ئیمامی عومەر نەیزانی چیبکات و ووتی: هاوەڵە کۆچکەرە ئەوەڵەکانم بۆ بانگ بکەن با بزانم چی دەڵێن، ئەوەبوو جیاوازی لە نێوانیاندا ڕوویدا، هەندێکیان ووتیان: ئێمە پێمان باشە بەردەوام بیت لەسەر سەفەرەکەت و بچین بۆ شام بۆ ئەو کارەی کە بۆی هاتووین، ئەوانی تر ووتیان: نەخێر ئێمە دەڵێین دەبێت بگەڕێیتەوە لەگەڵ خەڵکەکەدا و نەیانبەیت بۆ ناو ئەو بەڵایە لەبەرئەوەی هاوەڵە گەورەکانی پێغەمبەرت لەگەڵدایە، ئەوەبوو ئیمامی عومەر ئەم جیاوازییەی پێناخۆش بوو و ووتی ئێوە هەستن، پاشان داوای کرد کە هاوەڵە پشتیوانەکان (الأنصار)ی بۆ بانگ بکەن و پرسیاری لەمانیش کرد، ئەمانیش بەهەمان شێوە جیاوازییان هەبوو و بوون بە دوو بۆچوون.

ئیمامی عومەر بەمانیشی ووت هەستن، و داوای کرد کە ڕیش سپییەکانی قورەیشی بۆ بانگ بکەن ئەوانەی لەوێ ئامادە بوون، ئەمان هەموویان کۆبوون لەسەر یەك بۆچوون کە دەبێت عومەر بگەڕێتەوە و نابێت موسوڵمانان بەرێت بۆ ناو ئەو نەخۆشییە، ئەوەبوو خەلیفە عومەر ئەمەی پێباش بوو و داوای کرد کە موسوڵمانان ئامادەبن بۆ گەڕانەوە لە ڕۆژی دواییدا بۆ مەدینە، (ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕراح) کاتێك ئەمەی بیست هات بۆلای عومەر و پێی ووت: تۆ لە قەدەری خودا ڕادەکەیت؟ عەمەریش ووتی: ئەگەر غەیری تۆ ئەی (ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕراح) ئەم قسەیەی بکردایە دەمزانی چی لێدەکەم! بەڵێ ئێمە لە قەدەری خودا ڕادەکەین بۆ قەدەرێکی تری خودایی، باشە ئەگەر تۆ ڕانێك ووشترت هەبێت و بیانبەیت بۆ دۆڵێك، ئەگەر لایەکی دۆڵەکە بەپیت بێت و هەمووی لەوەڕبێت و لاکەی تر ووشك بێت، ئەگەر تۆ ووشترەکان بەریت بۆ هەر یەکێك لەو دوو لا ووشك

و بەپێتە هەر بە ویست و قەدەری خودا نی‌یە!؟ لەو گفتوگۆیەدا بوون کە یەکێکی تر لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کە ناوی (عبدالرحمن ی کوڕی عەوف) بوو هات (کە چووبوو بۆ کارێکی خۆی و ئاگای لەم حاڵە نەبوو)، ئەوەبوو عبدالرحمن ووتی: من فەرموودەیەکی پێغەمبەرم بیستووە لەم بارەیەوە، کە دەربارەی نەخۆشی تاعوون ڕۆژێک پێی فەرمووین: ﴿إذا سَمِعْتُم بِهِ بِأرضٍ فلا تقدموا عليهِ، و إذا وَقَعَ بِأرضٍ وَأَنْتُم بها فلا تخرجوا فِراراً مِنْهُ﴾، ئیمامی عەمەریش ووتی: سوپاس بۆ خودا، و داوای کرد لەوانەی لەگەڵی هاتبوون کە بکەونەڕێ بۆ گەڕانەوە بەرەو شوێنی خۆیان لە شاری مەدینەی پیرۆز.

ئەم پابەندی‌یەی موسوڵمانان بوو بە فەرمانەکانی خودا و پێغەمبەرەوە کە بووە هۆی پاراستنیان و پاراستنی نیوە دورگەی عەرەب لەو نەخۆشی‌یە ترسناکانە، بە تایبەتی پاراستنی شاری پێغەمبەر مەدینەی پیرۆز لەو بەڵای تاعوونەی کە لە سەردەمی پێشەوا عومەردا لە شام بڵاوبۆوە،




**Plague Victim**

Death personified lays violent claim to a plague victim in this grim work from the 14th-century. Devastating epidemics of diseases commonly known as plague swept through Europe starting in the Byzantine era, killing tens and even hundreds of thousands quickly and painfully. The plague's cause and transmission remained a frightening mystery until the late 1800s, although speculation ranged from foul air from the Earth's core to divine punishment for the sins of humankind.

درێـژایی مێـژووش نەخۆشـی ئـاوا ترسـناك لـە مەدینـە بڵاونەبۆتـەوە، ئەمـەش
ەلمێنەری راستیی ئەو بەڵێنەیە کە لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) هـاتووە
، ئیمامی (بوخاری) گێراوێتی‌یەوە: ﴿إنَّ الطاعون لا يـدخُلُ المدينـة﴾، و في رواية
خری: ﴿لا يَدْخُلُ المدينةَ المَسِيحُ الدجّال و لا الطـاعون﴾، واتـە: نەخۆشـی تـاعوون و
سیحی درۆزن (دەجال) ناچنە نـاو مەدینـەوە، ئەمـەش مژدەیـەك و دڵنیایی‌یـەکی
ورەیـە بـۆ دانیشـتوانی شـاری مەدینـەی پـیرۆز و پرشـنگێکی درەوشـاوەیە لـە
ۆعجیزەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، چونکە تەنها کەسێك دەتوانێت ئەم بەڵێنە بدات کە
شتگیری کرا بێت بە وەحی لەلایەن دروستکەری بوونـەوەر و ئاگـادار لـە هـەموو
ۆرانکاری‌یەکانی رۆژگار.

لە لایەکی تـرەوە فـەرموودەی: ﴿الطاعون رِجْزٌ أُرسِلَ على طائفة من بني إسـرائيل و
لى مَنْ كان قَبلَكُم، فإذا سَمِعْتُم به بِأرضٍ فلا تدخلوا عليه، و إذا وَقَعَ بأرضٍ وأنتُم بها فـلا
رجوا منها فِـراراً منـهُ﴾ یەکەم ئاماژەیە لـە مێـژووی مرۆڤایەتی‌دا بـۆ بابـەتێك و
ۆسـەیەکی پزیشـکی خۆپـارێزی نـوێ کـە گرنگی‌یـەکی زۆری هەیـە و بـووە بـە
اسـایەکی پزیشـکی و دەسـتووری، ئـەویش کـرداری ئابڵوقـە و جیاکردنـەوەی
ـوێنی تووشـبووە بـە پەتایـەك یـان درمێکـی بڵاوەبـووە (عملیـة الحجـر الصـحي
Medical Quarantine or Area Isolatio) لـە لایـەن دەسـەڵاتە
زیشکی‌یەکانی ئەو وولاتەوە.

واتە نەهێشتنی چوونە دەرەوە و چوونە ناوەوە بۆ شوێنێکی تووشبوو تاوەکو
ەترسی نامێنێت، ئەم کردارە موسوڵمانان پێش ١٤٠٠ساڵ جێ‌بەجێ‌یان کردووە،
ێش ئەوروپا و وولاتانی پێشکەوتووی ئەمڕۆ، ئەوروپا بۆ یەکەمجار گرنگـی ئەم
ابەتـەیان زانـی لـەکاتی بڵاوبوونـەوە بەناوبانگەکانی تـاعوون لـە سەدەی ١٤یـەمی
اینی‌دا، ئەوەبوو بۆ یەکەمجار لە وولاتی ئیتاڵیادا ئەو شوێنەی تووشبوو بوو بـۆ
ـاوەی ٣٠رۆژ لـە شـوێنانی تـر جیادەکرایـەوە، بـەم کردارەیـان دەووت (ترینتینـا
Trentina)، پاشان ئـەم مـاوەی جیاکردنـەوەیان زیـاد کـرد بـۆ ٤٠رۆژ کـە پێ‌یـان
ەووت (کیورەنتینـا Curantina)، لێـرەوە دەبیـنین کـە ئیسـلام بنـەماکانی

جیاکردنەوەی پزیشکی (الحجر الصحي) لە پێش ئەورووپاوە بە نزیکەی ٧٥٠سال داناوە، کە لەگەڵیدا هاندەری بەهێزیشی هێناوە بۆ پابەند بوون پێیەوە و جێبەجێ کردنی.

**Effects of the Black Death**
The Black Death, an epidemic of plague in Europe that lasted from 1347 to 1351, resulted in the deaths of almost one-quarter of Europe's population. The Black Death was the first in a cycle of plagues in Europe that continued into the 18th century. Shown here, the French city of Marseille is devastated by a later outbreak of plague.




ئەوەتا دەبینین هەڕەشەی گەورە دەکات لەو کەسانەی کە گوێڕایەڵیی ناکەن و لەهەمان کاتدا بەڵێن دەدات بەوانەی کە ئەم فەرمانانە جێبەجێ دەکەن کە پاداشتێکی بێ سنووریان هەیە لە ڕۆژی دوایی‌دا، ئەو موسوڵمانەی کە ئەم فەرمانە جێبەجێ دەکات و شوێنی درماوی بەجێ ناهێڵێت خوای گەورە لێی خۆش دەبێت، و ئەگەر بەو نەخۆشی‌یە بمرێت وەك شەهید وایە لە پێناوی خوادا، چونکە ئەو بە ڕۆحی خۆی پارێزگاری لە هەموو موسوڵمانان کردووە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿الطاعون شَهادَةٌ لِكُلِّ مُسْلِمٍ﴾ اخرجه البخاري، واتە: مردن بە تاعوون شەهادەتە بۆ هەموو موسوڵمانێك، هەروەها دەفەرموێت: ﴿الْمَطْعونُ شَهيدٌ وَ الْمَبْطـونُ شَهيدٌ﴾ اخرجه البخاري، واتە: ئەو موسوڵمانەی بە تاعون دەمرێت شەهیدە و ئەوەشی بە سکئێشە دەمرێت شەهیدە.

## ئەو نەخۆشی‌یانەی جیاکردنەوەی نەخۆشی دەوێت:

مەفهومی کۆکردنەوە و جیاکردنەوەی ئەو کەسانەی کە نەخۆشی درمیان هەیە لە شوێنێکی تایبەتدا یان (عَزل Isolation) زۆر نوێیە و زانستی پزیشکیی خۆپارێزی لە رۆژگاری ئەمڕۆدا پیادەی دەکات، زۆر گەورە و سەرسوڕهێنەرە کە دەبینین پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی بەم راستی‌یە داوە:

ـلە یەکێك لە فەرموودەکانی‌دا دەفەرموێت: ﴿لا یُورَدَنَّ مُمْرِضٌ علی مُصِــحٍّ﴾ رواه البخاري ومسلم، واتە: با خاوەنی وشتری نەخۆش ئەمان نەهێنێتە سەر ئاوێك کە وشتری ساغ لێی دەخۆنەوە، چونکە ئەم تێکەڵاو بوونە دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی درمی وشترە نەخۆشەکان بۆ وشترە ساغەکان، بۆیە پێغەمبەر رێی لەمە گرتووە بەمەبەستی ئەوەی نەخۆشی بڵاونەبێتەوە، و دەبێت ئاژەڵی نەخۆش لە ئاژەڵی ساغ جیابکرێتەوە، جا ئەگەر ئەمە بۆ ئاژەڵی نەخۆش پێویست بێت ئەوا بۆ مرۆڤ زۆر پێویستتر و گرنگترە چونکە مرۆڤ لە هەموو گیاندارانی تر لە پێشترە و سەروەری هەموویانە.

ئەم فەرموودەیە نموونەیەکی گەورەی تری ئیعجازی زانستی‌یە لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ)، لەم فەرموودە پیرۆزەوە چەندین راستی زانستی گرنگمان بۆ دەردەکەوێت، کە هەموویان لەرێی زانستی پزیشکی‌یەوە وەك راستی‌یەکی دانپێدانراو وەرگیراون و سەلمێنراون، هەروەها بۆ بیروباوەڕی موسوڵمانیش چەندین سوودی هەیە، لەو سوودانە:

١- ئەو تەنینەوەیە (عدوی)یەی کە پێغەمبەر باسی کردووە لە فەرموودەی (لا عَــــدوی)دا، تەنها نەخۆشی‌یە نەگوێزراوەکان دەگرێتەوە، کە نابێت ئەوەندە زیادڕەوەی لە ترس لێی بکەین کە ئەم ترسە خۆی ببێت بە نەخۆشی‌یەکی تر.

٢- پێویستیی گێڕانەوەی هەموو شتێك بۆ خوای گەورە، لە دەوروبەرێکی پڕ لە کوفر و شیرك و سیحر و جادووگەریی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)، هەر بۆیە پێغەمبەر بۆ دەمکوت کردنی رەشۆکی‌یەك کە رەخنەی لە ووتەکەی پێغەمبەر: (لا عَدوی و لا هامّة و لا صَفَر) گرت و ووتی: ئێمە دەبینین ووشترێکی گەڕ کە دەچێتە

ناو ووشتری ساغەوە هەموویان تووش دەکات، پێغەمبەریش فەرمووی: ئەی کێ ئەو ووشترەی یەکەمی تووشکرد؟ ئەمە مانای ئەوەیە کە هەموو شتێك بە نەخۆش کەوتنیشەوە دەبێت بگێڕینەوە بۆ وویستی پەروەردگار، چونکە هیچ هۆکارێك بەبێ وویستی خودا کارناکات، بۆیە دەبێت بەردەوام داوای پشتیوانی لەخودای بەدەسەڵات بکەین.

٣- لەهەمان کاتدا دەبێت هەموو هۆکارێکی پێویستیش بگرینە بەر بۆ جێبەجێ کردنی کارەکانی ژیانمان، کە ئێمە دەزانین نەخۆشی درم دەبێتە هۆی تووشبوونی ساغ، بۆیە دەبێت جیای بکەینەوە.

٤- دەبێت نەخۆشەکانیش رادەی مەترسی حاڵەتەکانیان بزانن و ئازاری خەڵکی نەدەن و نەبنە هۆکاری تووشبوونی هاووڵاتیانیان، لەرێی تێکەڵاو بوونیان لە بازار و شوێنە گشتی یەکاندا، نابێت لە خواردن و خواردنەوەشدا تێکەڵاوی یان بکەن، ئەمە هەمووی بۆ رێگرتنە لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشی یە درمەکانی وەك: کۆلێرا، وەناق، گرانەتا، سەحایا، سیل و تەنانەت ئینفلوەنزاش، دەبێت نەخۆش لە ماڵەوە ئیسراحەت بکات بۆ ئەوەی رێبگرێت لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشی یەکەی.

-هەر لەبارەی جیاکردنەوەی نەخۆش، لە فەرموودەیەکی تردا کە پێشتر باسکرا دەفەرموێت: ﴿لا تُديموا النَّظَرَ الى المَجذومين﴾، واتە: نزیکی مرۆڤی گول مەکەون بە شێوەیەك کە بەردەوام بیان بینن، هەر کاتێکیش بینیتانن زۆر سەیریان مەکەن، ئەم ئاگادارکردنەوەیەی پێغەمبەر (ﷺ) لە سەیر کردن و تێکەڵاوی مرۆڤی گول لەبەرئەوەیە کە نەخۆشی گولیی بەهۆی تێکەڵاوی یەوە بڵاودەبێتەوە، ئەمە هەمووی لەبەر کەمکردنەوەی چانسی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی یە، لێرەوە دەگەینە ئەو راستی یەی کە جیاکردنەوە و عەزلی نەخۆشە درمەکان زەروورەتێکە کە ئیسلام هانیداوە بۆ پاراستنی ژیان، و دوورخستنەوەی زەرەر و ئەو شتانەی کە روونیی ژیان لێڵ دەکەن.

-لە فەرموودەیەکی تریشدا دەفەرموێت: ﴿إنَّ مِنَ القَرَفِ التَّلَفُ﴾ رواه احمد و أبو داود و البيهقي، زانا (إبن قتيبة) لە راڤەی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێت: (القَرَف) واتە: نزیك

بوونەوە لە نەخۆشیی یان نزیك بوونەوە لە نەخۆش، کەواتە مانای تەواوەتی فەرموودەکە ئەوەیە کە: نزیك بوونەوە لە نەخۆشیی یان لە نەخۆش دەبێت هۆی تیاچوون یان فەوتان، لێرەوە پێغەمبەر (ﷺ) فێری وەرگرتنی هۆکارەکانی خۆپارێزیمان دەکات هەروەك چۆن خۆیشی پابەندی هۆکارەکانی خۆپاراستن بووە، ئەبو نەعیم لە کتێبی (الطب النبوي)دا بۆمان دەگێڕێتەوە، کە ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) بیزانیایە کە هاوسەرێکی نەخۆشی هەیە وەك هەوکردنی چاوی، نەدەچووە لای بۆ مانەوە تاوەکو چاك نەبووایەتەوە.

**کۆتایی:**

فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هەمووی پڕن لە بابەتی بەسوود و راستیی زانستی کە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا زانایان و پزیشکانی سەرسام کردووە، و بووەتە مایەی رێزلێنان و پێزانینیان بەو ووتە بە نرخ و درەوشاوانە، ئێمە هەرچەند باسی ئەو فەرموودانە بکەین هەرگیز ناتوانین حەقی خۆیان بدەینێ و بگەینە مانا قووڵە بێکۆتایییەکانیان، لە کۆتاییدا دەگەینە ئەوەی کە بڵێین: لەبەرئەوەی ئەم فەرموودانەش هەر وەحیی خوداین، بۆیە ئێمە هەمیشە ملکەچین بۆیان.

فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بە بابەتی تەنینەوەی نەخۆشی و هۆکارەکانی خۆپاراستن لێیان، هەروەها دەربارەی مەترسی نەخۆشییەکان و هۆکانی رێگرتن لە بڵاوبوونەوەیان، وەك: ئابڵوقە و جیاکردنەوەی نەخۆشەکان، تیشکێکن لەو دەریا پڕ نوورە، کە وەك باسکرا هەمووی راستیی زانستین و پڕن لە سوود بۆ هەموو مرۆڤایەتی، هەروەها دەستپێشخەری ئیسلام و موسوڵمانانیشمان بۆ دەردەخەن لە بواری پاراستنی تەندروستی مرۆڤەکان و رێگرتن لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشیدا.

**سەرچاوەکان:**


١- صحيح البخاري، صحيح مسلم.

٢- كتێبی: الطب النبوي/ دانراوی: إبن القيم الجوزية.

٣- گۆڤاری (الإعجاز)/ ژمارە ٣ی (رەبیعی دووەمی ١٤١٨ك)/ دەرکراوی: (هيئة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة).

٤-گۆڤاری (الإعجاز العلمي)/ ژمارە ٤ی ساڵی (١٤٢٠ك - ١٩٩٩ز)/ دەرکراوی: (هيئة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة).

٤-الطب الوقائي في الإسلام/ الصيدلي عمر محمود عبدالله/ الموصل ١٩٩٠.

٥-الإعجاز العلمي في القرآن و السنة النبوية/ د.محمد كامل عبدالصمد.

**6- Davison's Principles & Practice of Medicine\19th Edition 2002\Churchill Livingstone-UK.**

**7- www.tasabeeh.com.**



# سیستمێکی هۆرمۆنی یەکتری تەواوکەر لە سەرەتای سوورەتی (مریم)دا

## سەرەتا:

موعجیزەی قورئانی پیرۆز لەوەدایە کە کتێبێکە لە چەند ووتەیەك پێکهاتوو، کە بە زمانێکی عەرەبی پڕ لە رەوانبێژی هاتووە، ئەم ووتانە چەند سیفاتێکیا لەخۆگرتووە کە هیچ کەسێك نەیتوانیوە و ناتوانێت هاوشێوەیان بهێنێت: ﴿قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنسُ وَ الْجِنُّ عَلَى أَن يَأْتُواْ بِمِثْلِ هَـذَا الْقُرْآنِ لاَ يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَ لَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا﴾ (الإسراء،٨٨)، سیفەتی یەکەمی لە بەهێزی زمانەوانی و ووردی شیرینی ووتەکانی‌دایە، هەروەها لە وێنەگرتن و پیشاندانی شەپۆلە دەروونی‌یەکا و بارەکانی ژیانی خەڵکی بەشێوەیەکی گونجاو و نموونەیی لەگەڵ یاساکانی زما و نەحو و صەرف ورەوانبێژی زمانی عەرەبی‌دا، ئەمە لە رووی زمانەوانی‌یەوە سیفەتی دووەم بریتی‌یە لە ناوەڕۆکی ئەم ووتانە، کە بەشێوەیەکی لێکۆڵینەوەی هەموو لقەکانی زانستە مرۆڤایەتی‌یەکانی لەخۆگرتووە و سەلماندوویەتی ک ئاگاداری‌یەکی قووڵی هەیە لە هەر یەکێك لەو لقانەدا، سەبارەت ب وورده‌کاری‌یەکانی زانستە گەردوونی‌یەکانیش تەنها ئیشارەتی پێ‌داون.

مەبەست لەم ئامارژە پێدانە ئەوە نی‌یە کە مرۆڤ هەموو وورده‌کاری‌یەکان نهێنی‌یەکانی ئەو زانستانە بزانێت لە قورئانی پیرۆزەوە، بەڵکو تەنها ئەوەیە ک بۆیان روون ببێتەوە و گومانیان لەوەدا نەمێنێت کە سەرچاوەی ئەم زانیاری‌یانەی ناو قورئانی پیرۆز بریتی‌یە لەو کەسەی کە بەدیهێنەر و ئاگاداری هەمو زانستەکان و نهێنی‌یەکانیانە، چونکە ئەو زانیاری‌یانەی کە باسی کردوون مەحاڵ بووە لەو سەردەمەدا کەس بیزانێت، تەنانەت پێغەمبەریش (ﷺ)، ئەگەر وەحی نەبوایە: ﴿وَ كَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَ لَا الْإِيمَانُ وَ لَكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاء مِنْ عِبَادِنَا وَ إِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ (الشورى،٥٢). لێرەوە دەبێت کەسانی خاوەن ئینصاف دان بە راستیی و گەورەیی ئەم پەیامەد بنێن کە تارۆژی دوایی و رۆژ لەدوای رۆژ موعجیزەکانی ئاشکرا دەبن و هەگیز کۆن نابێت، ئەم دان پێدانەشیان رەنگ بداتەوە لە کرداریاندا و ببنە شوێن کەوتەیەکی ئەم رووناکی و رێگا راستە.

لەم باسەماندا دەچینە خزمەتی گەنجینەیەك لە دەربڕینە قورئانییەكان، كە گەڵ جوانیی شێوازی دەربڕین و ڕەوانبێژی بێهاوتادا، باسی بابەتێكی ووردی نستیی دەكات كە پەیوەندە بە بابەتێكی پزیشكیی زۆر هەستیار و تازە ێزراوەوە هەیە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا، ئەویش سیستەمی دەماری هۆرمۆنییە Neuro Endocrinal System) لە لەشی مرۆڤدا، ئەم بابەتە بەشێوازێكی ێك و پێكی سەرسوڕهێنەر لە ئایەتەكانی سەرەتای سوورەتی (مریم)دا هاتووە، ە دەفەرموێت:

﴿كهيعص{١} ذِكْرُ رَحْمَةِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا{٢} إِذْ نَادَى رَبَّهُ نِدَاء خَفِيًّا{٣} قَالَ
بِّ إِنِّي وَهَنَ الْعَظْمُ مِنِّي وَ اشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْبًا وَ لَمْ أَكُن بِدُعَائِكَ رَبِّ شَقِيًّا{٤} وَ إِنِّي
فْتُ الْمَوَالِيَ مِن وَرَائِي وَ كَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِرًا فَهَبْ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا{٥} يَرِثُنِي وَ
رِثُ مِنْ آلِ يَعْقُوبَ وَ اجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا{٦} يَا زَكَرِيَّا إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ اسْمُهُ يَحْيَى لَمْ
جْعَل لَّهُ مِن قَبْلُ سَمِيًّا{٧} قَالَ رَبِّ أَنَّى يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَ كَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِرًا وَ قَدْ
لَغْتُ مِنَ الْكِبَرِ عِتِيًّا{٨}﴾، واتە*: باسی ڕەحمەتی خواتان بۆ دەكەین لەگەڵ

ەكەریای بەندەیدا، كاتێك بە بێدەنگی و بە نهێنی لەخودا پاڕایەوە، ووتی: ودایە من ئێسكم لاواز بووە و سەرم بە سپییەتی گڕی گرتووە و هیچ كاتێك من ە داواكردن و ئومێد بوون بە ڕەحمەتی تۆ كافر نەبووم و تۆش وەڵامت داومەتەوە، ن دەترسم لە دوای من خەڵكی بێڕێز ببنە پێشەوای خەڵك و خێزانەكەشم نەزۆكە ۆیە خودایە منداڵێكی صاڵحم لەلایەن خۆتەوە پێبدە، بۆ ئەوەی ببێتە میراتگری ێغەمبەرایەتی و زانیاری من و نەوەی یەعقوب، و خودایە بیكەرە كەسێك كە خۆت اشان بەندەكانیشت لێی ڕازیبن لە دین و ڕەوشتیدا، ئەی زەكەریا ئێمە مژدەت ێدەدەین كە منداڵێكت دەدەینێ ناوی (یەحیا)یە كە هیچ كەسێك پێش ئەم ئەو اوەی نەبووە و لەمیش نەچووە، زەكەریا (لە گەرمەی خۆشیدا و بە ەرسوڕمانەوە!!) ووتی: خودایە من چۆن منداڵم دەبێت كە خێزانەكەم نەزۆكە و

* بۆ روون كردنەوەی زیاتری تەفسیری ئایەتەكان بڕوانە: تفسير القرآن العظيم لابن كثير/ سورة مريم.

خۆشم گەیشتورمەتە ئەوپەڕی پیریی (کە لەش و ئێسکەکانم لاواز بوون و ووشک بوونەتەوە)!! پاشان پەروەردگار لە ڕێی مەلائیکەتەوە وەڵامی دایەوە: ﴿قَالَ كَذَٰلِكَ قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَ قَدْ خَلَقْتُكَ مِن قَبْلُ وَ لَمْ تَكُ شَيْئًا﴾ (مریم،٩)، واتە: خوای گەورە فەرموویەتی ئەم کرداری دروست کردنی ئەوەیە لە تۆوە لەلای ئەو زۆر ئاسانە، وەك چۆن سەرەتا تۆشی دروست کرد لە سکی دایکتدا کە هیچ نەبوویت.

ئەم هەشت ئایەتە بەیەکەوە باسی پێنج نیشانە دەکەن کە لە پیاودا روودەدەن کە هەر نیشانەیەکیان پەیوەندی بە پسپۆڕییەکی پزیشکیی تایبەتییەوە هەیە:

١- لاوازبوونی ئێسکەکان (وهن العظام)؛ ئەمە پەیوەندی بە پسپۆڕی ئێسك وشکاوییەوە (Orthopedics) هەیە.

٢- سەرسپیبوون (شیب الرأس)؛ پەیوەندی بە پسپۆڕی پێستەوە (Dermatology) هەیە.

٣- ترسان (الخوف)؛ پەیوەندی بە زانستی دەمار و دەروونەوە (Neurology & Psychology) هەیە.

٤- لاوازی وەچە خستنەوە (ضعف الخصوبة)؛ پەیوەندی بە زانستی نەزۆکییەوە (Fertility) هەیە.

٥- پیری زۆر (الكبر الشديد)؛ پەیوەندی بە زانستی پیرناسییەوە (Geriatrics) هەیە.

پەیوەندی هاوبەشی نێوان پێنج نیشانەکەی سەرەتای سوورەتی (مریم)

+ لێرەدا پرسیارێك دێتە مێشكمانەوە دەربارەی كۆبوونەوەی ئەم نیشانانە لە سەرەتای سوورەتی (مریم)دا؟ و ئایا بۆ تەنها ئەم نیشانانەی پیریی باس كراون لەناو دەیان نیشانەی تر كە لە كاتی پیربوونی مرۆڤدا دەردەكەون؟ ئایا ئەم نیشانانە بە تایبەتی پەیوەندی‌یەكی زانستی لەنێوانیاندا هەیە كە لە یەكەیەكی پزیشكی رێك وپێكدا كۆیان كاتەوە؟

– بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە دەڵێین: بەڵێ، ئەم نیشانانە كە بە تایبەتی باس كراون بەیەكەوە حیكمەتێكی گەورەی تێدایە كە تەنها خوای گەورە بە تەواوەتی دەیزانێت، و ئێمەش لە رۆژگاری ئەمڕۆدا و بەهۆی ئەو زانستانەی لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا، و هەروەها بە یارمەتی زانستی كارئەندامزانی یان فیسیۆلۆژی (علم الفسلجة Physiology)یەوە گەیشتووینەتە راستی‌یە زانستی‌یەكان لەم بارەیەوە.

## لێكۆڵینەوەی نیشانە پزیشكی‌یەكانی سەرەتای سوورەتی (مریم):

ئەو نیشانە پزیشكی‌یانە لەوانەیە بەسەر هەموو مرۆڤێكدا بێت و تایبەت نی‌یە بە تەنیا زەكەریا پێغەمبەرەوە (سەلامی خودای لێبێت)، هەموو مرۆڤێك كە دەچێتە تەمەنەوە سكاڵای لاوازی ئێسكەكانی و سەرسپی بوون دەكات و توانای وەچە خستنەوەی كەم دەبێتەوە، هەروەها ترسیش دایدەگرێت لە مردن (كە چەندین هۆكاری هەیە)، دەبینین لێرەدا هۆكاری ترسی زەكەریا پێغەمبەر بریتی بوو لە ئەگەری بەردەوام نەبوونی بانگەوازەكەی و شڵۆق بوونی باری خێزانەكەی، ئەگەر كوڕێكی نەبێت پاش خۆی بەو كارانە هەستێت، ئەو رەحمەت و بەخشینەی خوداش بۆ زەكەریا بریتی بوو لە موعجیزەیەك، چونكە منداڵ بوون و وەچەخستنەوە لەگەڵ پیری زۆری خۆی و نەزۆكی خێزانەكەی‌دا ناگونجێت لەگەڵ باری ئاسایی باوی خەڵكی‌دا، چونكە وەچەخستنەوە لەگەڵ ئەو نیشانانە (ئێسك لاوازی، سەرسپی بوون، نەزۆكی، ترسان و پیری زۆر) زۆر زەحمەتە و مەحاڵە، ئەم نیشانانە تایبەت نین بە پێغەمبەرانەوە و تووشی خەڵكانی تریش دەبن بۆیە ئێمە بە گشتی وەك چەند نیشانەیەكی پزیشكی باسیان دەكەین كە بە یاسایەكی رێك وپێك و ووردی لەشی مرۆڤ بەڕێوە دەچن.

## ١- پیری زۆر (الشیخوخة):

مرۆڤ لە ژیانیدا بە چەند قۆناغێکدا دەڕوات، وەك خودا دەفەرموێت: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ يُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ ثُمَّ لِتَكُونُوا شُيُوخًا وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّى مِن قَبْلُ وَلِتَبْلُغُوا أَجَلًا مُّسَمًّى وَلَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ (غافر:٦٧)، ئەم قۆناغانە هەر لە کۆرپەلەوە لە سکی دایکیدا دەست پێدەکات، پاشان لەدایك بوون و منداڵی و دوایی گەنجێتی و لە کۆتاییدا پیربوون و پاشانیش مردن، قۆناغی پیریی کۆتایین قۆناغەکانی ژیانە و بریتییە لە قۆناغی چوونە دواوەی هەموو چالاکییەکانی لەش و دەرکەوتنی عەیب و نوقسانی لە توانای کۆئەندامە جیاوازەکانی لەشدا، لەگەڵ ئەوەشدا کە تا ئێستا لە رووی زانستییەوە بە تەواوەتی هۆکارە راستەوخۆکانی پیربوون نەزانراوە بەڵام چەندین بیردۆز و روونکردنەوە دانراون، لەو روونکردنەوە پەسەندکراوانە:

کەڵەکە بوونی عەیب و نوقسانی لەسەر ئاستی ماددەی بۆماوەیی کە ترشەڵۆکە ناوکییەکانە (الأحماض النووية DNA) لە ناوکی خانەدا دەبێتە هۆی بێتوانایی خانەکان لە دروست کردنی پرۆتینی ساغ و بێعەیب (ئەم پرۆتینانە یەکەی سەرەکین لە بەڕێوەبردنی چالاکییەکانی لەش بە شێوەیەکی رێك وپێك)، بەهۆی ئەمەوە ئەم پرۆتینانە ناتوانن کارەکانیان بەرێك وپێکی لەناو لەشدا ئەنجام بدەن و ئەمە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی نیشانەکانی پیریی.

لە لایەکی ترەوە توێژینەوەکان لەم بوارەدا گەیشتوونەتە ئەوەی کە:

ڕەگە بەرەڵاکان (الجذور الحرة Free Radicals) کە چەند ماددەیەکی ژەهراوین بۆ لەش و لە ئەنجامی زیندە چالاکییەکانەوە پەیدا دەبن، بەرپرسن لەو زەرەرانەی کە لە خانەکاندا روودەدەن و دەبنە هۆی پیریی، لەگەڵ ئەمانەشدا رەقبوونی دیواری خوێنبەرەکان (ئەستوور بوونی دیواری لوولەکانی خوێن بەهۆی نیشتنی چەوری لەژێر ناوپۆشی دیوارەکانیاندا) دەبنە هۆی کەمیی گەیشتنی خۆراك و ئۆکسجین بۆ شانە و خانە جیاوازەکانی لەش بە تایبەتی مێشك کە دەبێتە هۆی پووکانەوەی بە هێواشی، و پاشان دەرکەوتنی نیشانەکانی پیریی.

**نیشانەکانی پیربوون:**

وەك بینیمان پیری قۆناغێکی ئاسایییە لە ژیاندا، کە تێیدا چالاکییەکانی سیستەمەکانی لەش دەچنە دواوە و گورجییان نامێنێت، پیری خۆی جیاوازە لەو نەخۆشیانەی تێیدا روودەدەن، لە نیشانەکانی پیربوون:

لاوازی لە: بینین و بیستن و بیرهاتنەوە و ماسولکەکانی لەشدا، هەروەها کەم نوستن، لەرزین، چرچ بوونی پێست و لاوازی ئێسکەکان و سەرسپی بوون.

ئێمە تەرکیز دەخەینە سەر ئەو دوو نیشانەیەی کۆتایی و پەیوەندییان بە نیشانەیەکی ترەوە کە ئەویش کەمتوانایی وەچەخستنەوەیە لە مرۆڤی پیردا، هەروەها لێکۆڵینەوە دەکەین لەسەر پەیوەندی: لاوازی ئێسکەکان و سەرسپی بوون و پیری زۆر و ترسان لەگەڵ کەمتوانایی منداڵبوون و نەزۆکیدا.

**٢- لاوازی ئێسکەکان (وَهَنُ العظام):**

لاوازی ئێسکەکان بەوە پێناسە دەکرێت کە بریتییە لە نوقسانییەکی بەرچاو لە بڕی ماددەی ئێسکیی لە لەشی مرۆڤدا، لەگەڵ ئەوەشدا کە بڕی ماددەی ئێسکی دەگاتە زۆرترین ڕێژەی لە سەرەتای پیریدا، بەڵام دابەزینی ئەم ڕێژەیە لەم کاتەوە دەست پێدەکات (دوای تەمەنی ٤٠ساڵی)، ئێسکەکان بەشێکی زیندووی گرنگی لەشن کە کردارەکانی بنیاتنانی ئێسک {بەهۆی خانە بنیاتنەرەکانی ئێسکەوە (Osteoblasts)} و رووخانی ئێسک {بەهۆی خانە خۆرەکانی ئێسکەوە (Osteoclasts)} بە بەردەوامی تێیاندا روودەدات، ئەگەر بێتو کرداری رووخان و نەمانی ئێسك زیاتر ببێت لە کرداری دروست کردنی ئێسك ئەوا لێرەوە کەمبوونەوە روودەدات لە بڕی ماددەی ئێسکیدا.

**پەیوەندیی نێوان پیریی و لاوازبوونی ئێسکەکان:**

لاواز بوونی ئێسك لە پیریدا دەگەڕێتەوە بۆ کەم بوونەوەی چالاکی خانە بنیاتنەرەکانی ئێسك (Osteoblasts)، هەروەها کەمیی لە ڤیتامین (D) لە پیریدا، کە ئەمەش دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی مژینی کانزای کالیسیۆم لە ریخۆڵەکانەوە و کەمیی ڕێژەکەی لەخوێندا، ئەمەش دەبێتە هۆکاری زیادبوونی




هۆرمۆنی پاراثایرۆید (Parathyroid Hormone) لە رژێنی هاوپەڕی ئەرەقی‌یەوە (Parathyroid Gland).

ئەم هۆرمۆنە کاردەکاتە سەر ئێسکەکان و دەبێتە هۆی زیادبوونی کرداری تێکشکان و کەمبوونەوەی رێژەی ماددەی ئێسکیی، لە پیاودا هۆکارێکی زیاتر هەیە بۆ کەمبوونەوەی ماددەی ئێسکیی، ئەویش هۆرمۆنی نێرینە یان تێستۆستیرۆنە (Testosterone)، ئەم هۆرمۆنە کاریگەری‌یەکی پۆزەتیڤانەی هەیە و چالاکی خانە بنیاتنەرەکانی ئێسک زیاد دەکات، کاریگەری‌یەکەی ئەوەندەی کاریگەری نێگەتیڤانەی هۆرمۆنی کۆرتیزۆن (Cortisone) دەبێت کە چالاکی خانە بنیاتنەرەکان کەم دەکاتەوە، لە مرۆڤی ئاسایی‌دا هاوسەنگی‌یەک هەیە لەکاری ئەم دوو هۆرمۆنەدا.

چالاکی جنسی و هۆرمۆنی تێستۆستیرۆن لە پیریـدا کەم دەبێتەوە و دەبێتە هۆی تێکچوونی هاوسەنگییەکە، و زاڵ بوونی کاری کۆرتیزۆن کە چالاکی خانە بنیاتنەرەکان کەمدەکاتەوە، لێرەوە خانە خۆرەکان (Osteoclasts) چالاکتر دەبن و بە بەردەوامی ئێسك دادەخورێنن، بەبێ ئەوەی ئەو ئێسکە داخوراوە جێی بگیرێتەوە بە ئێسکی نوێ لە رێی خانە بنیاتنەرەکانەوە، چونکە ئەمان چالاکییان کزبووە بەهۆی نەمانی تێستۆستیرۆن و کاریگەریی کۆرتیزۆنەوە.

**پەیوەندیی نێوان ترس و لاوازی ئێسك:**

ترسانی بەردەوام و کاریگەر حاڵەتێکی هەژان دروست دەکات کە دەبێتە هۆی روودانی چەندین گۆڕانکاری لە لەشدا، لەو گۆڕانکارییانە بریتییە لە زیاتر رژاندنی هۆرمۆنی کۆرتیزۆن لە کوێرەڕژێنی سەر گورچیلەوە، رادەی ئەم رژاندنە لە حاڵەتی ترس و دڵەراوکێی زۆر و تۆقیندا ئەوەندە زۆر دەبێت وەك هاوشێوەی رژاندنی لێدێت لە حاڵەتی وەرەمی رژێنی سەر گورچیلەدا، وەك باسمان کرد بەهۆی کاریگەریی کۆرتیزۆنەوە بنیاتنانی ئێسك دەوەستێت لەگەڵ بەردەوام بوونی تێکشکانیدا، ئەم حاڵەتە راستەوانە دەبێت لەگەڵ رادەی رژاندنی هۆرمۆنی کۆرتیزۆندا، سەرەنجامی گشتی ئەم پرۆسانە لاواز بوونی ئێسکەکانە.

**٢- سەرسپی بوون (الشَّیب):**

بریتییە لە سپی بوونی رەنگی مووەکان بەهۆی لەدەستدانی ماددە رەنگ کەرەکەیەوە، ئەم ماددە رەنگکەرە لە چینی ناوەڕاستی ئەو سێ چینی خانە ووشکەوەبووە (یان کیراتینییەدایە) کە مووی لێپێك دێت لەسەر رووی لەشەوە، سەرچاوەی ئەم ماددە رەنگکەرە لەو خانە رەنگییانەوەیە (کە پێیان دەووترێت میلانۆسایت Melanocytes) و دەکەونە بنکی سەلکی مووەکەوە (کە رەگی مووەکەیە)، ئەم خانانە ماددەی رەنگیی یان میلانین (Melanin) دەگوێزنەوە بۆ خانە کیراتینییەکان لە پێست و موودا، لە خوار ئەم سەلکی موانەوە چەندین موولوولەی خوێن و کۆتایی دەمار و گورزی کۆلاجین هەیە لە پاڵ خانە رەنگکەرەکاندا.

لەسەر رووی پێست زیاتر لە ٢ملیار خانەی رەنگکەر (Melanocytes) هەیە کێشی ئەو خانانە پێکەوە بریتی‌یە لە (١گرام) و رادەی چڕی‌یان ١٥٦٠خانەیە هەموو میللیمەتر سێ‌جایەك لە پێست، ئەم رێژە و چڕیی‌یە ئەگۆڕێ بۆ هەم رەگەزەکان و تیرەکانی مرۆڤ، جیاوازی رەنگیان تەنیا لە چڕی ئەم مادده رەنگک (Melanin) میلانینەیە لەناو هەر خانەیەکی میلانۆسایتدا.


پێست و چینەکانی

پەیوەندیی نێوان پیریی و سەرسپی بوون:

تا مرۆڤ بە تەمەندا بچێت نیشانەی پیریی زیاتر لە سەری‌دا دەردەکەوێت وورده وورده قژی سەری سپی دەبێت، هەندێ کەس کە دەگاتە تەمەنی ٥٠سە ٥٠٪ی زیاتری سەری سپی دەبێت، لەگەڵ کەمبوونەوەی ماددەی رەنگکەر لەگ بەرەوپێش چوونی تەمەندا، بە هێواشیش چالاکی ئەنزیمی ثایرۆکسین لەناو خا رەنگ کەرەکاندا کەم دەکات، و هەروەها خانە رەنگکەرەکان یان میلانۆسایتەک خۆشیان ژمارەیان کەمدەبێتەوە، ئەویش بە رێژەی ١٪ بۆ هەموو ساڵێك.

چالاکی خانە رەنگکەرەکان لەژێر کۆنترۆڵی هۆرمۆنێکی تایبەتی‌دایە کە کوێ رژێنی ژێرمێشك دەری دەدات، و بە هۆرمۆنی چالاك کەری خانە رەنگ کەرەکا (Melanocyte Stimulating Hormone یان MSH) ناسراوە، گوما تێدانی‌یە لەگەڵ بەرەوپێش چوونی تەمەندا رژاندنی هۆرمۆنی (MSH

کەمدەکات و دەبێتە هۆی کەمبوونی ژمارەی خانە رەنگ کەرەکانی پێست و خاوبوونی چالاکی‌یان، پاشان دەرکەوتنی سپێتی لە مووی سەردا.

**پەیوەندی نێوان ترسان و سەرسپی بوون:**

زانراوە کە غەم و دڵەڕاوکێی درێژخایەن سەری مرۆڤ سپی دەکات، تاقی کردنەوەکانیش پەیوەندی کۆئەندامی دەماری خۆنەویستی بەسۆز (Sympathetic Nervous System)یان سەلماندووە لەگەڵ دیاردەی سەرسپی بوون، چالاکی زیادبووی ئەم کۆئەندامە لەکاتی هەڵچوونەکاندا دەبێتە هۆی سەرسپی بوون، زانا لورنەر (Leurner) تێبینی ئەوەی کرد کە ئەو شوێنانەی پێستی سەر کە پەیوەندی ئەم سیستەمەی لێدەبڕدرێت درەنگتر سپی‌دەبن، زانا (ئارتون) و هاوەڵەکانیشی گەیشتنە هەمان ئەنجام لە تاقی کردنەوەکانیاندا، ئاشکرایە کە گرفتە دەروونی‌یە ئاڵۆزەکانیش دەبنە هۆی زۆر خێراتر دەرکەوتنی سپێتی لەسەردا، ئەمە ئەوەیە کە قورئان بە دەستەواژەی (وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْبًا) واتە (سەر گڕی گرتووە بەسپێتی) دەری‌بڕیوە.

زانا (لورنەر) گەیشتۆتە ئەو باوەڕەی کە لەدەستدانی رەنگی قژ بەهۆی ژەهراوی بوونی خانەکانی رەنگکەری پێستەوە دەبێت بە ماددەیەکی ژەهراوی بۆ ئەو خانانە، کە لە سیستەمی دەماری بەسۆزەوە دەردەدرێت لە نزیک ئەو خانانەوە، ئەم ماددەیەش بریتی‌یە لە ئەدرینالین (Adrenaline)، کە بریتی‌یە لە یەکێك لە زۆرترین دەردراوەکان لە کاتی هەڵچوونە دەروونی‌یەکاندا، بە تایبەتی دڵەڕاوکێی زۆر.

**٤- لاوازی وەچەخستنەوە ( ضعف الخصوبة ):**

بەهێزی وەچەخستنەوە لە پیاودا لە رووی بایۆلۆجی‌یەوە خۆی لە دروست کردنی تۆو (سپێرم)دا دەبینێتەوە لە گونەکاندا، گون لە پیاودا پێك هاتوون لە لوولە پێچاوپێچە سپێرمی‌یەکان: کە خانە سپێرمی‌یە سەرەتایی‌یەکانی تێدایە، ئەم خانانە وردە وردە گەشە دەکەن لەناو ئەو لوولانەدا و پێدەگەن و دەردەپەڕنە دەرەوە، پێکهێنەری دووەمی لوولە سپێرمی‌یەکان بریتی‌یە لە شانە نێوەندەکان

(یان شانە بەستەرەکان) لە نێوان خانە سپێرمی یەکاندا، لەناو ئەم شانانە، خانەکانی لایدیگ (Interstitial Cells of Leydig) هەیە، کە هەڵدەستن بە رژاندنی هۆرمۆنی نێرینە (تێستۆستیرۆن)، کە کاردەکاتەسەر کرداری گەشەکردنی خانە سپێرمی یەکان، ئەویش بە کاریگەریی بۆ سەر چەند خانەیەکی ناوپۆشی لوولە سپێرمی یەکان کە پێیان دەووترێت خانەکانی سێرتۆلی (Sertoli cells) کە رۆڵێکی سەرەکی لە پێگەیاندنی سپێرمەکاندا هەیە، لە هەمان کاتدا خانەکانی سێرتۆلی پێویستی یان بە هۆرمۆنێکی تر هەیە بۆ چالاک بوونیان کە لە ژێرمێشک رژێنەوە دەردەرێت و راستەخۆ دێت بۆ لوولەکانی گون، ئەویش هۆرمۆنی چالاککەری رژێنەکانی زاووزێیە (Follicular Stimulating Hormone یان FSH)، هەروەها ژێرمێشکە رژێن هۆرمۆنێکی تر دەڕێژێت کە کاریگەریی بۆ سەر خانەکانی لایدیگ هەیە و هانیان دەدات بۆ دروست کردنی تێستۆستیرۆن، ئەم هۆرمۆنەش بریتی یە لە (LH) یان (Luteinizing Hormone).

## الفصول الرئيسية في خلق الجنين





لا يزال تضارب الأطباء قائما حتى يومنا هذا في تحديد الفصول الأساسية لعملية خلق الجنين والتي تمر عبر مئات المراحل.
في حين أن كتابنا منذ ١٤٠٠ عام حدد أنها خمسة فصول أساسية:
١- نطفة.
٢- علقة. وتعني الشيء العلق... انظر الصورة ولاحظ كيفية التعلق بجدار الرحم..
٣- مضغة، قبل العظام واللحم..
٤- عظام.
٥- اللحم.
لقد أصيب العلماء بالذهول فمنهم من أقر بالإسلام ومنهم من جحد الحق وهو يعلم.






﴿حَتَّىٰ إِذَا جَاءُو قَالَ أَكَذَّبْتُم بِآيَاتِي وَلَمْ تُحِيطُوا بِهَا عِلْمًا أَمَّاذَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾
(سورة النمل: ٨٤)

**پیری و لاوازی وەچەخستنەوە:**

لە نێوان تەمەنی ٢٠ بۆ ٦٠ساڵیدا بەرەوپێش چوونی تەمەن کاریگەری‌یەکی گرنگی دەبێت لەسەر دروست کردنی تۆو لە پیاودا، لە تەمەنێکی سەرووتردا توانای وەچەخستنەوە لاواز دەبێت بەهۆی چەندین فاکتەرەوە، پیری تووشی زوربەی شانەکانی لەش دەبێت، لەوانە ئەو دیوارە تفتەی چواردەوری لوولە سپێرمی‌یەکان دەدات بە شێوەیەك ئەستوور دەبێت کە رێ‌دەگرێت لە چوونی خۆراك لە خوێنەوە بۆ خانە سپێرمی‌یەکان، و لە هەمان کاتدا چوونی هۆرمۆنەکانیش لە خوێنەوە بۆیان لاواز دەبێت، لەمانەش گرنگتر بریتی‌یە لە کەمبوونی هۆرمۆنی (تێستۆستیرۆن) و هۆرمۆنێکی تریش کە لە ژێرمێشکە رژێنەوە دێت کە بریتی‌یە لە هۆرمۆنی چالاك کەری خانە رەنگکەرەکان (MSH) یان هۆرمۆنی رەنگکەر، کە ئەمەیش رۆڵێکی گرنگی هەیە لەم کردارەدا.

**کاریگەری کەمبوونی تێستۆستیرۆن:**

تیمێکی پزیشکی لە سەنتەری (ماساشوستس)ی ئەمریکی بۆ لێکۆڵینەوەی بەتەمەنا چووەکان، گەیشتنە ئەوەی کە کەمبوونی رێژەی تێستۆستیرۆنی سەربەست و ئەوەی کە بەندە بە ئەلبۆمینەوە لە خوێندا ساڵانە بەرێژەی ١٪ دادەبەزێت لەنێوان تەمەنی ٤٠ بۆ ٧٠ساڵیدا، واتە لە سەروو ٧٠ساڵیدا رێژەی تێستۆستیرۆن بە رادەی ٣/١ دادەبەزێت، لەگەڵ ئەم دابەزینی تێستۆستیرۆنەدا چەندین نیشانەی پزیشکیی پەیدا دەبێت، لەوانە: کەمبوونی رێژەی ماددەی ئێسکی و ماسولکەیی، کەمبوونەوەی ئارەزوو بۆ رەگەزی بەرامبەر و دابەزینی چالاکی سێکسی بە رادەی ٣/٢ لە تەمەنی ٧٥ساڵیدا، ئەم چوونە دواوەیە بەهۆی ئەمانەوە دەبێت:

کەمبوونەوەی ژمارە و چالاکی خانەکانی لایدیگ کە تێستۆستیرۆن بەرهەم دێنن، بەهۆی کەمبوونی رێژەی هۆرمۆنی (LH) لە ژێرمێشکە رژێنەوە، ئەمیش بەهۆی بەرەو پێش چوونی تەمەنەوە، هەروەها ئەستوور بوونی دیواری لوولە سپێرمی‌یەکان وەك پێشتر باسکرا.

**کاریگەریی کەمبوونی هۆرمۆنی ( MSH ):**

پێشتر باسمان کرد کە ژێرمێشکە رژێن هۆرمۆنی (MSH) دەرێژێت کە دەبێتە هۆی رەنگکردنی پێست و قژ، کەمبوونی ئەم هۆرمۆنە دەبێتە هۆی سپیبوونی تووکی سەر لە پیریدا، ئەوەی سەرسوڕهێنەرە ئەو پەیوەندییەیە کە لەنێوان کەمبوونی ئەم هۆرمۆنە و لاوازی وەچەخستنەوەدا هەیە، باشە چۆن سەرسپی بوون لەهەمان کاتدا دەبێتە هۆی لاوازی لە توانای منداڵ خستنەوەدا؟! با بزانین رۆڵی ئەم هۆرمۆنە چییە وەك زانستی فیسیۆلۆژی نوێ بۆی دەرخستووین:

هەردوو زانا (کارلا پواتنی و جینی ماثر) لە دوای توێژینەوە لەم بوارەدا دەڵێن: خانەکانی لایدیگ لە گونی پیاودا هۆرمۆنی (MSH) دروست دەکەن هەروەك رژێنی ژێرمێشك، ئەم هۆرمۆنە رۆڵێکی گەورەی هەیە لە چالاك کردنی خانەکانی سێرتۆلدا، کە وەك پێشتر باسمان کرد ئەم خانانەی سێرتۆل بریتین لە کارگە و دایەنی دروست کردنی سپێرمەکان بەهۆی کاریگەریی هەردوو هۆرمۆنی تێستۆستیرۆن و (FSH)، هەروەها سەلمێنراویشە کە بوونی هۆرمۆنی (MSH) لە پاڵ خانەکانی سێرتۆلدا دەبێتە هۆی زیاتر کردنی وەڵامی ئەم خانانە بۆ هۆرمۆنی (FSH) و زیاتر کردنی دروستبوونی سپێرم لە گوندا، لێرەوە گرنگی هۆرمۆنی (MSH)مان بۆ دەردەکەوێت لە دروست کردنی سپێرمدا، هەر بۆیە کەمبوونی ئەم هۆرمۆنە لە پیریدا دەبێتە هۆی سەرپی بوون و هەروەها لاوازیش لە توانای وەچەخستنەوەدا.

**ترسان و رۆڵی لە لاواز بوونی وەچەخستنەوەدا:**

توێکڵی مێشك (Cerebrum) بریتییە لە بەرزترین دەسەڵات لە کۆئەندامی دەماردا، هەر ئەمە کە کۆنترۆڵی رژاندنی هۆرمۆنە جنسییەکان دەکات بەهۆی کاریگەریی لەسەر گەورەی هەموو کوێرە رژێنەکانی لەش کە رژێنی ژێرمێشکە (Pituitary Gland)، ژێرمێشکە رژێنیش وەك پێشتر ئاماژەی پێدرا بەهۆی کاریگەریی هەردوو هۆرمۆنی (FSH) و (LH) کە دەیڕژێنێت کۆنترۆڵی بەرهەمهێنانی سپێرم دەکات لە گوندا. هەڵچوون و تێکچوونە دەروونییەکان

کاریگـەریی راسـتەوخۆیان دەبێـت بـۆ سـەر تـوێکڵی مێشـک و کەمکردنـەوەی چالاکی‌یەکانی، لێرەوە و بە زنجیرە ئەم کاریگەریی‌یە دادەبەزێت بۆ کەم کردنەوەی چالاکی ژێرمێشکە رژێن، و لە کۆتایی‌دا بۆ کارگەی دروست کردنی سپێرمەکان لە گوندا و دەبێتە هۆی کەمبوونی دروستبوونی سپێرم.

لە لایـەکی تـرەوە بینـراوە کـە تـرس و دڵـەڕاوکێ دەبێتـە هـۆی کەڵەکـە بـوونی ماددەیـەکی زیانبـەخش بـۆ دروسـتبوونی سـپێرم، ئـەویش مـاددەی سـیرۆتۆنینە (Serotonin) لـە لوولـە سـپێرمی‌یەکانی گونـدا، و دەبێتـە هـۆی کاریگـەریی‌یـەکی نێگەتیڤانە بۆ سـەر لوولە سپێرمی‌یەکان و کەمبوونەوەی رێـژەی دروسـت کردنـی تۆو لە پیاودا.

هەروەها سەلمێنراوە کە هەندێك لەو نەخۆشـانەی تووشـی کـەم بەرهـەمهێنانی سپێرم بوون رێژەیەکی بەرز لەم ماددەی سیرۆتۆنینەیان هەیـە، لـە توێژینەوەیـەکی تردا کە لەسەر ئەو کەسانە کرا کە چاوەڕێی حوکمی لـە سـێدارەدران بـوون بینـرا کـە بـە رادەیـەکی زۆر دروسـتبوونی سـپێرم تیایانـدا هاتووەتـە دواوە تـا رادەی وەستانی تەواو، ئەویش بە هۆی کاریگەریی ترسەوە، لـە نموونەیـەکی تـردا کـە لـە رووی پزیشکی‌یەوە تۆمـار کـراوە پیاوێك لەگەڵ برایەکی‌دا تووشـی کارەسـاتێکی سـەیارە بوون، ئـەوە بـوو یـەکێکیان لـە رووداوەکـەدا گیـانی لەدەسـتدا، پـاش دوو مـانگ لـە روودانـی ئـەم کارەسـاتە شـیکاری شـلەی سـپێرمی ئـەو کەسـەی مـابوو کـەمبوونێکی سـەیری نیشـاندا لـە ژمـارەی تۆوەکـانی‌دا کـە لـە ۳۰ملیـۆن لـە پـێش رووداوەکـەوە دابـەزیبوو بـۆ تـەنها ٤ملیـۆن لـە یـەك سـانتیمەتر سێ‌جادا لـە دوای رووداوەکـە، لـەم نموونەیـەدا بەڵگەیـەکی ئاشـکرا هەیـە لەسـەر کاریگـەریی ئـەو داڕووخانـەی کـە تێکچـوونی دەروونـی سـەخت دروسـتی دەکـات لەسـەر توانـای وەچەخستنەوە لە پیاودا.

لەگەڵ زیادبوونی سیرۆتۆنین لـە گونەکانـدا، بەرزبوونـەوەی رێـژەی هۆرمـۆنێکی تـریش کـە (کـۆرتیزۆن)ە لـە کـاتی ترسـدا کاردەکاتـە سـەر کەمکردنـەوەی بەرهـەم هێنـانی خانـە سـپێرمی‌یەکان، تاقی‌کردنـەوەکان سـەلماندوویانە کـە ئەگـەر بـڕی

٣٠ميلليگرام لە كۆرتيزۆن بدرێت بە كەسێك بۆ ماوەی ٤هەفتە دەبێتە هۆی دابەزینێكی مەترسیدار لە رادەی بەرهەمهێنانی سپێرم، ئەوەش زانراوە كە دڵەراوكێ ئەگەر درێژخایەن و بەهێز بێت ئەوندە كۆرتيزۆن دروست دەكات بە رادەیەك لە ئاستی بەرهەمهێنانی كۆرتيزۆن لە وەرەمی رژێنی سەر گورچیلەش زیاتر دەبێت.

## ٥- پەیوەندی هاوبەشی نێوان ترس و پیری:

### ترسان مرۆڤ پیردەكات:

ترسانی زۆر و درێژخایەن لە رژاندنی چەندین هۆرمۆن زیاد دەكات لە لەشدا لەوانە هۆرمۆنی ئەدرینالین، توێژینەوەكان سەلماندوویانە كە زیادبوونی ئەدرینالین دەبێتە هۆی بەرز بوونی ئاستی كۆلیسترۆڵ و پەیدابوونی نیشانەكانی رەقبوونی خوێنبەرەكان، ئەمە روودەدات لەكاتی داباریینی مەترسییە ماددییەكاندا، چونكە ئەدرینالین رێژەی شەكر و چەوری لە خوێندا بەرز دەكاتەوە، بۆ ئەوەی لەكاتی ئەو پێویستییە لەشییەدا سەرف بكرێت، چونكە چالاكی لەش چەندجارە دەبێتەوە.

بەڵام لەلایەكی ترەوە لە كاتی زوربەی قەیرانە دەروونییەكاندا پێویست بەو رووبەڕوو بوونەوە و ئەركە جەستەییە ناكات كە لەش خۆی بۆ ئامادە دەكات، لێرەوە ئەو چەورییە زیادەیەی لەم خۆئامادە كردنانەوە دروست دەبێت لە دیواری لوولەكانی خوێندا دەنیشێت و چینێكی كۆلیسترۆڵ دروست دەكەن، ئەم چینە بە كەڵەكەبوونی بەردەوامی چەوری تیرەی دیواری لوولەكانی خوێن تەسك دەكاتەوە و دەبێتە هۆی نەچوونی خۆراك و ئۆكسجین بۆ شانەكانی دوای و دەوروبەری ئەم شوێنی نیشتنە، لێرەوە ئەم شانانە دەپووكێنەوە و حاڵەتێك دروست دەكات پێی دەووترێت رەقبوونی خوێنبەرەكان، توێژینەوەكان سەلماندویانە كە دڵەراوكێ و دوودڵی دەروونی دەبێتە هۆی زیادبوونی جۆرێكی تایبەت لە چەوری لە خوێندا پێی دەووترێت (Very Low Density Lipoprotein) یان (VLDL) ئەمیش دەبێتە هۆی زیادكردنی كۆلیسترۆڵ و پاشان نیشتنی لە دیواری

خوێنبەرەکاندا، لەگەڵ ئەوەشدا کە نەخۆشی ڕەقبوونی خوێنبەرەکان هۆکاری سەرەکی بریتی‌یە لە چوون بەتەمەنا، بەڵام بینراوە کە هۆکاری پەیدا بوونی لە تەمەنێکی گەنجتردا بریتی‌یە لە دوودڵی و دڵەڕاوکێ لەگەڵ خواردەمەنی چەور و کەمجووڵان و چەند فاکتەرێکی تر، کەواتە بۆمان دەرکەوت کە ترسان و دڵەراوکێ مرۆڤ زووتر پیردەکات لەرێی کرداری ڕەقبوونی خوێنبەرەکانەوە.

**پیربوون ترس زیاد دەکات:**

لەلایەکی ترەوە توێژینەوەکان لەسەر مرۆڤە بەتەمەنە ئاسایی‌یەکان دەریان خستووە کە ڕێژەیەکی زیاتر لە ئەدرینالین لە لەشیاندا دەڕێژرێت بە بەراورد لەگەڵ کەسانی گەنج، ئەم زیادەیە دەگاتە ٧٥٪، کە ڕێژەیەکی بەرچاوە ئەگەر بزانین ڕێژەی ٤٠٪ی زیادە لە ڕاددەی ئاسایی لە ئەدرینالین کاردەکاتە سەر چالاکی‌یە ئاسایی‌یەکانی لەش، ئەم زیادبوونی ئەدرینالینە بەهۆی بارێکی قەلەقی و دڵەڕاوکێوە نی‌یە، بەڵام هەر ئەمیشە کە وا دەکات مرۆڤی پیر زیاتر دووچاری هەڵچوونە دەروونی‌یەکانی وەك ترس ببێت، چونکە دەبێتە هۆی هەستیارکردنی سیستمی دەماری بەسۆز تیایاندا بۆ هەڵچوون و تێکچوونی دەروونی، ئەمەش هەر بەهۆی زیادبوونی ئەدرینالینەوەیە.

لێرەوە پەیوەندی هاوبەشی دڵەڕاوکێ و ترسانمان لەگەڵ پیربووندا بۆ دەردەکەوێت، کە چۆن کاردەکەنە سەر یەکتری و هۆکاری دروست بوونی یەکترین، چونکە ئەگەر بێتو ترسان ببێتە هۆی زوو پیربوون، پیربوون خۆیشی چانسی تووشبوون بە ترس و دڵەڕاوکێ زیاتر دەکات، و ئەم دوانە بەردەوام یەکتری گەرم دەکەن و هەردوو لایان بەرەو زیادبوون دەڕۆن، کەواتە کاریگەریی ئەم دووانە لەسەر یەکتر وەك بازنەیەکی داخراوی لێدێت کە بەردەوام هۆکاری دروست بوونی یەکترین.

## پوختەی هاوناهەنگی هۆرمۆنی لە سەرەتای سوورەتی (مريم) دا:

ئەو پێنج نیشانەیەی لە سەرەتای سوورەتی (مريم)دا هاتووە کە بریتین ل لاوازی ئێسك، سەرسپی بوون، ترسان، پیریی زۆر و لاوازی وەچەخستنەو بریتین لە پایەکانی پەیوەندییەکی هۆرمۆنی یەکتری تەواوکەر، ئەم روونکەرەوەی ئەوەیە کە بۆ ئەم نیشانانە بە تایبەتی باس کراون لەناو هەم نیشانەکانی چوون بەتەمەندا، ئەویش بەهۆی ئەم پەیوەندییەی کە بەیەکیانە دەبەستێتەوە لە یەکەیەکی لۆژیکی و پڕ لە حیکمەتدا، ئەمەش پوختەی ئ پەیوەندییەیە:

لە سەرەتای دوعاکەی زەکەریا پێغەمبەردا باسی لاوازی ئێسك و پاش سەرسپی بوون و دوایی ترسان کراوە، لەرووی زانستییەوە لاوازی ئێسك لەکا ترساندا روودەدات بەهۆی زیادبوونی هۆرمۆنی کۆرتیزۆن کە لە کاتی دڵەڕاوکێ بەردەوامدا بەرزدەبێتەوە، هەروەها کۆرتیزۆن دەبێتەهۆی لاوازی لە وەچەخستنەوەدا، سەبارەت بە سەرسپی بوونی خێرا کە روودەدات و ئەوەی ک قورئان باسی لێوە کردووە بە گرتێبەر بوون (وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْبًا) کە هیچ شت وەك سووتانی گڕێك خێراتر نییە لەبەر چاودا، ئەم سەرسپی بوونەش بەهۆ قەلەقییەوە روودەدات، کە دەبێتە هۆی رژاندنی ماددەیەکی زیانبەخش بە خا رەنگکەرەکانی پێست و قژ، کە ماددەی ئەدرینالینە لە کۆتاییە دەمارییەکا سیستمی دەماری بەسۆزەوە لە نزیك رەگی مووەکاندا، هەر لە حاڵەتی قەلەقی ماددەیەکی زیانبەخشی تر بەڵام زیاتر بۆ سپێرمی پیاو دەرێژرێت کە ئەوی ماددەی سیرۆتۆنینە.

کەواتە سەرەنجامی کۆتایی دڵەڕاوکێ بریتییە لە زیاتر رژاندنی هەر س هۆرمۆنی: کۆرتیزۆن، ئەدرینالین و سیرۆتۆنین، لەلایەکی ترەوە و بەهۆی چوو تەمەنەوە کەمکردنێکی زۆر لە رژاندنی هەردوو هۆرمۆنی تێستۆستیرۆن هۆرمۆنی هاندانی رەنگکردن (MSH)دا روودەدات، کە لەگەڵ زیاتر رژاند ماددە زیانبەخشەکاندا هەموویان بەیەکەوە کاردەکەنە سەر سپێرمەکان و زیان

ێگەیشتنیان دەگەیەنن، ئەگەر پەیدابوونی یەك هۆكار لەوانەی سەرەوە بەس بێت
ۆ وەستاندنی بەرهەمهێنانی سپێرم، ئایا كۆبوونەوەی ئەو هەموو هۆكارە
ەیەكەوە چی دروست بكەن؟!

دوای روونكردنەوەی ئەم یەكە هۆرمۆنی‌یە زۆر جوانە سەرسوڕهێنەرە یەكتری
ەواوكەرە، ئایا هیچ گومانێك لەوەدا دەمێنێت كە زەكەریا پێغەمبەر لە حاڵەتێكدا
بووە كە زۆر مەحاڵە توانای منداڵ خستنەوەی هەبووبێت؟!

العوز والخوف المزمن
ترسانی درێژخایەن

آحادي الأمين

الكورتيزول

Adrenaline

Noradrenaline

Corticosteroid

لاوازی وەچەخستنەوە

ادرينالين

ضعف الخصوبة

وهن العظم لاوازی ئێسك

MSH

Testosterone

هرمون الميلانين MSH

التستوستيرون TESTO

Aldosterone

كبر السن
پیری زۆر

MSH = Melanocyte Stimulating Hormone

پەیوەندی هاوبەشی نێوان پێنج نیشانەكەی سەرەتای سوورەتی (مریم)

هەر بۆیە و لەبەر ئەم بارە قورسەی لەشی بوو كە خودا خستی‌یە دڵی‌یەوە كە
پاڕێتەوە بۆ ئەوەی كوڕێكی ببێت، ئەوەبوو موعجیزە هاتەدی و كوڕێكی بوو لەو
پیری‌یە زۆرەی خۆی و نەزۆكی خێزانەكەی‌دا، زەكەریا (سەلامی خوای لێبێت)
حاڵی خۆی بە دوو نیشانە باس كرد (لاوازی ئێسك و سەرسپی بوون) كە
هەردووكیان پەیوەندی‌یان هەیە بە توانای منداڵبوونەوە، لاوازی ئێسك لەگەڵ
لاوازی وەچەخستنەوەدا لەوەدا بەشدارن كە هەردووكیان بەشدارن لە
هۆكارەكانیاندا، كە كەمیی رژاندنی تێستۆستیرۆنە بەهۆی پیری‌یەوە و زیادبوونی
رژاندنی كۆرتیزۆنە لە حاڵەتی ترس و قەلەقی‌دا، هەروەها سەرسپی بوون بەشدارە
لەگەڵ كەمتوانایی منداڵبوون لە هەمان هۆكاردا، كە بریتی‌یە لە كەمیی رژاندنی

هۆرمۆنی (MSH) له ژێرمێشکه ڕژێن و گونەکاندا و زیادبوونی دوومادده‌ی تا ئەمین کە ئەدرینالینە لە قژ و پێستدا و سیرۆتۆنینە لە گوندا.

لەلایەکی ترەوە هەریەك لە ترسان و پیریی کار لەیەك دەکەن و یەکتری ب ئاراستەی زیادبوون زۆردەکەن، کە دەبێتە هۆی چەندجار بوونی شوێنەوارەکانیا کە بریتین لە: سەرسپی بوون و لاوازی ئێسك، هەر کاتێکیش ئەم دوو نیشا ئاشکرایە (سپێتی سەر و لاوازی ئێسك کە پشت دەچەمێنێتەوە) زیاتر دەرکەوتز ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نیشانە شاراوە سەرەکی‌یەکە کە بریتی‌یە ل کەمتوانایی وەچەخستنەوە و بەرهەمهێنانی سپێرم بەرەو خراپتر ڕۆیشتووە.

لێرەوە دەبینین کە سەرەتای سوورەتی (مریم) چەند موعجیزەیەکی زۆ گەورەی لەخۆ گرتووە: هەر لەجوانی و کورتی و پڕ مانایی دەستەواژەکەی وردی وەسفەکەی بە شێوازێکی زۆر ڕەوانبێژ، پاشان لە سەرووی هەموویەو بوونی پەیوەندی‌یەکی زانستی ورد لە نێوانیاندا.

باشە کێ دەتوانێت ئەم وەسفە پڕ لە ڕەوانبێژی و زانستی‌یە بکات تەنه خودای پەروەردگار نەبێت!! ئەم ئایەتانە چەند زانیاری‌یەکیان لەخۆگرتووە کە ل پێش ١٤سەدە لەمەوپێش لەسەردەمی هاتنە خوارەوەی قورئاندا و لە نیوەدورگەیەکی بیباندا وەك ڕاستی‌یەکی بێگومان داوێتی بەگوێی خەڵکیدا!!

بەڵێ تەنها خودای تاك و تەنها و دانا و زانایە بە هەموو نهێنی‌یەکانی بوونەوەر و مرۆڤ، هەر ئەوە کە توانای وەچەخستنەوە لە مرۆڤدا و لاواز بوونی بەپێی چەند یاسایەك داناوە، کە خۆی ویستی لێبووە، و هەر ئەویشە بەو شێو بەلاغی‌یە ئاماژەی بەو یاسایانە داوە لە سەرەتای سوورەتی (مریم)دا، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە ئێمە لەم سەردەمەماندا بزانین کە ناتوانین پێش زانیاری‌یا قورئانی‌یەکان بدەینەوە بە زانستە گەردوونی‌یەکانمان، بەڵام ئێمە تەنها پاش هەوڵێکی زۆر کە عەقڵەکان و ئامێرە زانستی‌یە وردەکان ڕۆڵیان تێدا بینیوە ئینجا بە هەندێك لەو زانیاری‌یانە و ئاماژە زانستی‌یانە گەیشتووین، کە ئەمانەیش تەنها خوای گەورە ڕێی پێداوین بیدۆزینەوە، بەڕاستی پەروەردگار جوانی فەرمووە:

﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت:٥٣).




**سەرچاوەکان:**

١- تفسير للقرآن العظيم/ الإمام إسماعيل إبن كثير/ دار الكتاب العربي-بيروت.

٢- گۆڤاری (الإعجاز)/ ژمارە ٣ی (رەبیعی دووەمی ١٤١٨ك)/ دەرکراوی: (هيئة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة).

3- Review of Medical Physiology - William F. Ganong - eighthteenth Edition - 1997.

4- Clinical Review - Androgens in the Angina male\ A. Vermeulen - Endocrinology Magazine - 1991.



# چەند نموونەیەك لە ئیعجازی زانستیی پزیشكیی لە سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەر (ﷺ)

بسم الله الرحمن الرحيم

**الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على أشرف الأنبياء والمرسلين ( محمد ) و على آله و صحبه و أمته أجمعين**

## پێشەکی:

ئامادەبووانی بەڕێز *......

سەرەتا لەکانگای دڵمانەوە و بەناوی دەستەی باڵای ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا بەخێرهاتنێکی گەرمی بەڕێزتان دەکەین، هیوادارین ئەم هاتنەتان لەم مانگەدا** کە یادێکی زۆر پیرۆزی تێدایە ببێتە مایەی خێر و بەرەکەت و خۆشی بۆ هەموو لایەکمان.

پەروەردگار وەك پێغەمبەرانی پێشوو پێغەمبەری خۆمانی ناردووە، تاوەکو ڕێنوماییکەری مرۆڤەکان بێت: ﴿وَ لِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ﴾ (الرعد: ٧)، بۆ هەموو خەڵکی سەر زەوی، بۆ مرۆڤەکان بەگشتی، بۆ ئەوەی خەڵکی لە ژیانیاندا بەپێی فەرمانەکانی خودا ڕەفتار بکەن و تووشی سەرگەردانی نەبن و ژیانی خۆیان و خەڵکانی تریش تاڵ و ناخۆش نەکەن.

ناردنی پێغەمبەر(ﷺ) منەتێك و (فضل)ێکی گەورەی پەروەردگارە، خوای پەروەردگار منەت بەسەر ئیماندارانەوە دەکات و دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِه وَ يُزَكِّيهِمْ وَ يُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَ الْحِكْمَةَ وَ إِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِي ضَلالٍ مُّبِينٍ﴾ (آل‌عمران:١٦٤)، واتە: خودا منەت بەسەر ئیمانداراندا دەکات چونکە نیعمەتێکی زۆر گەورەی پێ بەخشیون، کە هەر لە خۆیان (واتە مرۆڤە) پێغەمبەرێکی بۆ ناردوون کە ڕێنومایکەریان بێت،

---

* ئەم بابەتە بە سیمینارێك پێشکەش کرا ڕۆژی ٢٠٠٢/٦/٧ لەهۆڵی هۆتێل میر، لەژێر ناونیشانی: چەند نموونەیەك لە ئیعجازی زانستی پزیشکیی لە سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەردا، کە لەلایەن: ناوەندی کوردستان بۆئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا بۆ نووسەر ساز کرا بوو.

** ئەم سیمینارە لە مانگی لەدایك بوونی پێغەمبەردا(ﷺ) (مانگی ربیع الأول) پێشکەش کرا.

پەروەردگار بۆ ئەوەی راستی ئەوە بسەلمێنێت کە ئەم پێغەمبەرە لەلایەن خواوە هاتووە چەندین بەڵگەی پێداوە، و گەورەترین بەڵگەی کە تا رۆژی دوایی دەمێنێتەوە بریتی‌یە لە قورئانی پیرۆز و فەرمووده پیرۆزەکانی، کە فەرموودەکانی پێغەمبەریش (ﷺ) بەهەمان شێوە بریتی‌یە لە وەحی لەلایەن خوداوە و پێغەمبەر(ﷺ) لەخۆیەوە نەیوتووە: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى، إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى﴾ (النجم:٣-٤).

به تێپەڕبوونی رۆژگارەکان مرۆڤەکان بۆیان دەرکەوتووە و دەردەکەوێت کە ئەم پەیامە پیرۆزە لەلایەن خوداوە بۆمرۆڤەکان هاتووە، ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا گەورەترین سەلمێنەری ئەم راستی‌یەیە و بەڵگەیەکی زۆر رۆشنە لەم رۆژگارەماندا لەسەر راستی پەیامی پێغەمبەر (ﷺ).

له رۆژگاری ئەمڕۆماندا کە کوفر و ئیلحاد جیهانی داگرتووە ئێمەی موسوڵمان دەبێت بزانین چۆن خەڵکانی ئەمڕۆ دەدوێنین و بەزمانی سەردەم گفتوگۆ بکەین کە بێگومان سەردەمی ئەمڕۆ سەردەمی پێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆژیایە، ئێمەش هەوڵ دەدەین کە بەزمانی ئەمڕۆ قسە لەگەڵ خەڵکدا بکەین و لەهەمان کاتدا بیروباوەڕی خۆمان پتەوتر بکەین.

ئەو سەردەمەی پێغەمبەری تێدا نێردرا سەردەمی تاریکیی و جەهل و نەفامی بوو، نەزانی و جەهل و نەخوێندەواری هەموو دونیای داگرتبوو، مرۆڤەکان بیروباوەڕێکی زۆر سەرەتایی‌یان هەبوو لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، بۆنموونە: کاتێك کە مانگ دەگیرا خەڵك دەیانوت ئەوە ئەژدیهایەك لە ئاسماندا هەیە کە مانگ ووردە وورده دەخوات و بەوشێوەیە بچووکی دەکاتەوە تاوەکو دیارنامێنێت، یان لە بارەی زەوی‌یەوە دەیانووت زەوی تەختە و لەسەر پشتی گایەکە کە ئەم گایەش لەسەر ماسی‌یەکی گەورەیە و ئەم ماسی‌یەش لەسەر دەریایەك راوەستاوە.

ئەمانە بریتی‌بوون لە بیروبۆچوونی خەڵکانی ئەو سەردەمەی پێغەمبەری تێدا نێردرا، بەڵام کاتێك کە قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە و چەندین ئیشارەت و ئاماژەی سەرسوڕهێنەری تێدابوو بۆ زۆرێك لە راستی‌یە زانستی‌یەکان لە

ئاسۆکانی گەردوون و لە لەشی مرۆڤیشدا، تەنانەت زانایانی موسوڵمانیش ا سەردەمەدا لە بەرامبەر ئەم فەرموودانەدا سەرسام بوون، و نەیاندەزانی چ بتوانن بەتەواوەتی راڤە(تفسیر)ی بکەن، و لەزۆر شوێندا دەیانووت (الله ورس أعلم بمراده) واتە: خوا و پێغەمبەری خوا باشتر دەزانن کە واتای تەواوەتی ف فەرموودانە چی‌یە، لەهەمان کاتدا باوەڕی تەواویان پێ‌ی هەبووە چونکە (یقین تەواویان هەبووە کە لەلایەن خوداوە ئەم قورئان وسوننەتە پیرۆزە هاتووە.

بەڵام لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا پاش ئەو پێشکەوتنە بێ‌ئەندازەیەی زانست تەکنۆلۆژیا مانا و راڤەی تەواوەتی ئەو فەرموودانە بۆ ئێمە دەرکەوتوون، کە خ لەخۆی‌دا سەلمێنەری راستی ئەو فەرموودانەیە و موعجیزەیەکی بێ‌هاوتای گەورەیی قورئان و سوننەت دەردەخات.

پێغەمبەر(ﷺ) خۆی نەخوێندەوار بووە و لەناو گەلێکی نەخوێندەواردا هاتو ﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِّنْهُمْ﴾ (الجمعة:٢)، لەناو ڕۆژگارێکی تاریکستا کە هیچ جۆرە پێشکەوتنێکی زانستی و تەکنۆلۆژی ئەووتۆ لەو کاتەدا نەبو لەلای هیچ میللەتێکی ئەو سەردەمە تاوەکو خەڵکی بڵێن کە پێغەمبەر (ﷺ) لەوانەوە ئەم وتانەی وەرگرتووە یان خۆی دایناوە.

هەروەها با بزانین کە سوننەتی پیرۆزیش لە پلەی قورئاندایە، ئەوەتا پێغەمبە (ﷺ) خۆی دەفەرموێت: ﴿ألا إني أوتيت القرآن ومثله﴾ رواه احمد و الطبراني و الشوكا قال المباركفوري في التحفة: هو حديث صحيح، واتە: من قورئان و هاوتایەکی قورئانیش پێدراوە کە سوننەتی خۆمە، کەواتە فەرموودەکان و سوننەتی پێغەمبەریش (ﷺ) هەر نیگایە و لەلایەن خواوەیە و وەك قورئان ئێمە سەیری دەکەین.

بەڕێزان با ئێستەش دەست پێ‌بکەین بە باسکردنی چەند نموونەیە ئیعجازی پزیشکی لە سوننەتی پێغەمبەردا، نموونەی یەکەممان بریتی‌یە ا دیاردەیەکی لەشی مرۆ کە لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) ئاماژەی بۆ هاتو کە ئەویش بریتی‌یە لە:

## دیاردەی سکاڵا و گەلەکۆمەکی لە لەشی مرۆڤدا:




تداعي الجسد لإصابة عضو من أعضائه

**دەقی فەرموودەکان؛**

- عن النعمان بن بشير رضي الله عنهما قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿مثل المؤمنين في توادهم و تراحمهم و تعاطفهم مثل الجسد الواحد إذا أشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر و الحمى﴾ رواه مسلم.

- و لفظ البخاري: ﴿ترى المؤمنين في تراحمهم و توادهم و تعاطفهم كمثل الجسد إذا اشتكى عضوا تداعى له سائر جسده بالسهر والحمى﴾.

- و رواية الإمام احمد: ﴿مثل المؤمنين في توادهم و تعاطفهم و تراحمهم مثل الجسد إذا اشتكى منه شيءٌ تداعى له سائر الجسد بالسهر و الحمى﴾.

مانای فەرموودەکە: نوعمانی کوڕی بەشیر کە هاوەڵێکی پێغەمبەر بووە بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: نموونەی ئیمانداران لە خۆشەویستی

و بەزەیی و هاوسۆزیی‌یان بۆ یەکتری وەکو نموونەی لەشێك وایە، کاتێ
ئەندامێکی ئەو لەشە تووشی زەرەرێك دەبێت و سکاڵا دەکات، و هەم
ئەندامەکانی لەش بە گشتی گەلەکۆمەکی بۆدەکەن و یارمەتی دەدەن و هەم
لەش تووشی شەونخوونی و خەوزڕان و تا دەبێت.

پێغەمبەر (ﷺ) لەم فەرموودەیەدا باسی برایەتی و تەبایی و یەکڕیزی ن
موسوڵمانان دەکات، کە دەبێت چۆن بن لە نێوان یەکتری‌دا، و بۆ ئەوەی لەم بابە
تێبگەین نموونەیەکمان لە لەشی خۆماندا بۆ دێنێتەوە، ئەویش نموونەی لەش
مرۆڤە بە گشتی و چی تێیدا روودەدات کاتێك کە ئەندامێکی تووشی زەرەرێ
دەبێت، بۆمان باس دەکات کە لەم کاتەدا هەموو لەش تووشی شەونخوونی و ت
دەبێت لە پێناوی ئەم ئەندامەدا و ئەم حاڵەتە کۆتایی نایەت تاوەکو ئەو ئەندا
ناڕەحەتی‌یەکەی چارەسەر دەکرێت.

ئەم فەرموودە پیرۆزە چەند نموونەیەکی زۆر گەورەی لەخۆ گرتووە، کە لە س
رووەوە موعجیزەیە: ئیعجازی زمانەوانی و رەوانبێژی و ئیعجازی زانست
ئیعجازی زمانەوانی و رەوانبێژی لەو رووەوەیە کە ئەم فەرموودەیە چە
ووشەیەکی زۆر گونجاوی بەکار هێناوە بۆ وەسف کردنی ئەم دیاردەیەی لەش
مرۆڤ، بە تایبەتی فرمانەکانی (إشتکی، تداعی).

ئەگەر بێت و لەزمانی عەرەبی‌دا بگەڕێین ئەوا پێویستیمان بە چەندین فرما
دەبێت بۆ جێگرتنەوەی ئەم دوو ووشەیە، هەروەها بە چەند ووشەیەکی کا
بابەتێك روون دەکاتەوە کە بە چەند کتێبێك نەبێت ناتوانرێت باس بکرێت ک
ئەویش بنەماکانی یەکڕیزی و برایەتی و تەبایی موسوڵمانانە، بەکارهێنان
نموونەیەك لە لەشی خۆماندا تێگەیشتنی ئەم دیاردەیە و مانای فەرموودەکەما
زۆر بۆ ئاسان دەکات، چونکە هیچ کەسێك نی‌یە لە ئێمە کە تووشی ناڕەحەت
نەبوو بێت لە ئەندامێکی‌دا، تەنانەت بۆ نموونە کە درکێك چوو بێت بە دەستمان
لە ئەنجامی ئەمە ئازار و ئاوسان و هەوکردن و هەستکردنێکی گشتی لە هەمو
لەشدا بە ئازار و ناڕەحەتی رووی‌داوە.

تا ئێستا موسوڵمانان مانا ئاشکرا و ظاهری‌یەکەی تێگەیشتبوون، بەڵام لە هەمان کاتدا فەرموودە پیرۆزەکە ئاماژەیەکی سەرسوڕهێنەری تێدایە بۆ دیاردەیەک کە لە لەشی مرۆڤدا ڕوودەدات، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا و لەژێر ڕۆشنایی زانستی نوێدا بۆمان ڕوون بووەتەوە.

لەمڕۆدا زانستێکی تایبەت پەیدا بووە کە باس لە کار و ئەرکی ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ دەکات کە ئەویش زانستی کارئەندامزانی‌یە (علم الفسلجة – Physiology) کە ئێستا لە پاش ١٤سەدە بەسەر وتنی ئەم فەرموودەیەدا بۆمان دەرکەوتووە کە ئەم فەرموودەیە چ ئاماژەیەکی زانستیی ووردی تێدایە.

## ڕوون کردنەوەی زانستی:

لە فەرموودەکەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەگەر ئەندامێکی لەشی مرۆڤ تووشی زەرەر ببێت، سەرەتا ئەو ئەندامە خۆی سکاڵا دەکات کە دەفەرموێت (إشتكى)، لە زمانی عەرەبی‌دا ئەم ووشەیە بەم مانایە دێت: (إشتكى: هو إظهار مابك من مكروه أو مرض للجهة التي تظن أنها تتحكم بمجريات الأمور وتملك الإمكانات لإنقاذ الشاكي). واتە: دەرخستنی هەر زەرەرێك یان نەخۆشی‌یەکت بۆ ئەو لایەنەی کە دەزانیت کۆنترۆڵی چارەنووس و کارەکانتی لە دەستدایە و توانای هەیە کە لەو زەرەرە ڕزگارت بکات.

پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگار و پێغەمبەرە ڕاستگۆکەی، زانستی فیسیۆلۆژی نوێی ئەمڕۆ چەندین زانیاری زۆر سەرسوڕهێنەری بۆ دۆزیوینەتەوە سەبارەت بە کارلێکەکانی لەش بەرامبەر بە مەترسی‌یە جۆراو جۆرەکان، و ڕێگاکانی بەرگری و وەڵام دانەوە لە بەرامبەر ئەم مەترسی‌یانەدا، هەروەها ئەو ڕاستی‌یەی بۆ سەلماندووین کە هەر ئەندامێکی لەشی مرۆڤ کە تووشی زەرەرێك یان نەخۆشی‌یەك دەبێت، سەرەتا ئەو ئەندامە چەند وەڵامێکی دەبێت و چەند ئیشاراتێك دەنێرێت کە خۆی لەخۆی‌دا بریتی‌یە لە سکاڵاکردن، کەواتە زانستی ئەمڕۆ بۆی سەلماندووین کە ئەم فەرموودەیە ١٠٠٪ بەووردی باسی ئەم بەسەرهاتەی بۆ کردووین لە لەشی‌مرۆڤدا، ئێمە لە باس کردنی ئەم بابەتەدا لە



ڕووی زانستی‌یەوە پشت دەبەستین بە چەند کتێبێکی ناسراوی زانستی کارنەندامزانی (فیسیۆلۆژی).

دەبا ئێستا بچینە نێو وورده‌کاری بابەتەکەوە:

زانستی فیسیۆلۆژی بۆمان باس دەکات کە لە کاتی تووش بوونی هەر بەشێك یان ئەندامێکی لەشی مرۆڤ بە زەرەرێك، لەوانە: برینداری سووتان، شکاوی، تەنانەت کە درکێکیش دەچێت بە لەشماندا، یان تووش بوونی بە نەخۆشی‌یەك، ئەوا سەرەتا ئەو شوێنەی کە تووشی ئەو زیانە هاتووە وەڵامی خۆی دەبێت، و سەنتەری کۆنترۆڵکردنی هەموو چالاکی‌یەکانی لەشی لێ‌ئاگادار دەکاتەوە کە مێشکی مرۆڤە، ئەمە بریتی‌یە لە سکاڵاکردن، مێشکی مرۆڤیش وەڵامی خۆی دەبێت بۆ ئاگادارکردنەوەی هەموو لەش بۆ بە هاناچوونی ئەو ئەندامە، دیارە ئەم سکاڵاکردن و بەهانا چوونە راستەوانە دەگونجێت لەگەڵ رادەی ئەو زیانەی کە رووی داوە، ئێمە لێرەدا باسی برینداری دەکەین وەکو نموونەیەك بۆ ئەو زیانەی کە تووشی لەش دەبێت.



سەرەتای ئەم سکاڵایە لە شوێنی بریندارەوە دەست پێ‌دەکات، بەهۆی بڕان و بریندار بوونی ماسولکە و لوولە خوێنەکان و پچڕانی وورده دەمارەکان، لەم شوێنی برینداری‌یەوە

چەند ئیشارەت و تەزوویەکی دەماری دەردەچێت بۆ لایەنە جیاوازەکانی لەش، لەگەڵ ڕوودانی چەندین گۆڕانکاری و کارلێکی کیمیایی (ئەمانە لە ڕاستیدا هاواری سکاڵاکردنن)، کەواتە بە گشتی هەر شوێنێکی مرۆڤ کە تووشی برینداری دەبێت، لە شوێنی برینداری‌یەکەدا چەند چالاکی‌یەك و وەڵامێك ڕوودەدات بۆ ئەم زەرەرە، کە بە زاراوەی زانستی پزیشکی ئەمڕۆ پێی دەووترێت وەڵامی دەماری و کیمیایی (Neuro - Endocrinal Response)، ئەم وەڵامانە دەبنە هۆی ڕوودانی گۆڕانکاری لە زیندە چالاکی‌یەکانی لەشدا (Metabolic activities)، ئەنجامی گشتی ئەم چالاکی‌یانە بریتی‌یە لە ئاگادار کردنەوەی چەند سەنتەرێکی تایبەتی لە مێشکدا بۆ یارمەتی‌دانی ئەندامی بریندار، کە خۆی لەخۆی‌دا ئەم چالاکی‌یانە بریتی‌یە لە سکاڵاکردن، چونکە وەك ووتمان سکاڵاکردن بۆ لایەنێك دەبێت کە بزانیت دەتوانێت بە هاناتەوە بێت و لە توانای‌دا هەیە چارەسەری کێشەکەی بۆ بکات.



دیارە مێشکی مرۆڤیش گەورەترین دەسەڵاتە لە لەشدا و کۆنترۆڵی هەموو چالاکی‌یەکانی دەکات، لێرەوە مێشك هەموو ئەندامەکانی لەش ئاگادار دەکاتەوە، و بە تایبەتی گۆڕانکاری دروست دەبێت لە کاری گورچیلەکان و کۆئەندامی هەناسە و دڵ و سووڕانی خوێن و هەروەها کۆئەندامی بەرگری لەش (Immunity System)، کە سەرەنجامی ئەم چالاکی‌یانە بریتی‌یە لە ئاراستە کردنی هەموو تواناکانی لەش بۆ هەستان بە چالاکی‌یەکی بەکۆمەڵ بۆ یارمەتی ئەندامی بریندار، و سارێژ کردنی برین و ناڕەحەتی‌یەکەی.

ئەم پێشەکی‌یەی کە باسمان کرد لە چیرۆکێکی ئەدەبی یان باسێکی فەلسەفی دەچێت، بەڵام بابزانین ئەم راستی‌یە زانستی‌یانەی توێژینەوە ووردەکان لەم بوارەدا سەلماندوویانە زۆر لەمە کاریگەرترنا و بەشێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر باسی ئەو واقیعەمان بۆ دەکەن کە رۆژانە روودەدات، بەڵکو هەموو ساتێك لە ملیۆنەها لەشی مرۆڤەکاندا روودەدات کە تووشی نەخۆشی یان برینداری دەبن، دەبا ئێستا بە کورتی ئەم رووداوانە باس بکەین:

## ئیشارەتەکانی (سکاڵای) ئەندامی بریندار:




### کەناڵەکانی سکاڵاکردنی ئەندامی بریندار

وەك لە هێلکاری‌یەکەوە دەردەکەوێت، لە سێ کەناڵی سەرەکی‌یەوە ئەم سکاڵاکردنە روودەدات:

***کەناڵی یەکەم:*** خوێن بەربوون:

کاتێك کە شوێنێك یان ئەندامێکی لەشی مرۆڤ تووشی برینداری دەبێت، ئەم برینداری‌یە دەبێتە هۆی خوێن بەربوون، ئەم خوێن بەربوونە دەبێتە هۆی دابەزینی فشاری خوێن، ئەم دابەزینەی پەستانی خوێن دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی چوونەوەی خوێن بۆ دڵ، کە

ئەم پێشەکییەی کە باسمان کرد لە چیرۆکێکی ئەدەبی یان باسێکی فەلسەفی دەچێت، بەڵام بابزانین ئەم راستییە زانستییانەی توێژینەوە وردەکان لەم بوارەدا سەلماندوویانە زۆر لەمە کاریگەرترن! و بەشێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر باسی ئەو واقیعەمان بۆ دەکەن کە رۆژانە روودەدات، بەڵکو هەموو ساتێك لە ملیۆنەها لەشی مرۆڤەکاندا روودەدات کە تووشی نەخۆشی یان برینداری دەبن، دەبا ئێستا بە کورتی ئەم رووداوانە باس بکەین:

## ئیشارەتەکانی (سکاڵای) ئەندامی بریندار:




### کەناڵەکانی سکاڵاکردنی ئەندامی بریندار

وەك لە هێڵکارییەکەوە دەردەکەوێت، لە سێ کەناڵی سەرەکییەوە ئەم سکاڵاکردنە روودەدات:

***کەناڵی یەکەم:*** خوێن بەربوون:

کاتێك کە شوێنێك یان ئەندامێکی لەشی مرۆڤ تووشی برینداری دەبێت، ئەم برینداریيە دەبێتە هۆی خوێن بەربوون، ئەم خوێن بەربوونە دەبێتە هۆی دابەزینی فشاری خوێن، ئەم دابەزینەی پەستانی خوێن دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی چوونەوەی خوێن بۆ دڵ، کە

ئەمە دەبێتە هۆی ئاگادارکردنەوەی کۆتایی‌یە دەماری‌یە هەستەوەرەکان بۆ دابەزینی فشاری خوێن، وەك: (Baro Receptors & Mechano Receotors) کە لەناو دڵ و خوێنبەرە گەورەکانی لەشدا هەن، ئەم کۆتایی‌یە دەماری‌یانەش هەڵدەستن بە ناردنی ئیشارات و تەزووی دەماری بۆ ئاگادار کردنەوەی چەند سەنتەرێکی مێشك لە ناوچەی (Hypothalamus) لە مێشکدا لەو برینداری‌یە و دابەزینی فشاری خوێنە، ئەم سەنتەرانەی مێشك بریتین لە بنکەی سەرەکی بۆ وەرگرتن و هەست کردن بەو ئیشاراتە جۆراوجۆرانەی کە دوای بریندار بوون و نەخۆشکەوتن دەردەچن، بەڵام با بزانین هەر لە شوێنی بریندار خۆی‌دا چەند چالاکی‌یەك روودەدات بۆ راگرتنی ئەم خوێن بەربوونە:

## کۆئەندامی دڵ و سووڕانی خوێن



*Human Circulatory System:* The human circulatory system is composed of the muscular heart and an intricate network of elastic blood vessels known as arteries, veins, and capillaries. These structures work together to circulate blood throughout the body, in the process delivering life-preserving oxygen and nutrients to tissue cells while also removing waste products.

شوێنی بریندار هەڵدەستێت بە دروست کردن و رژاندنی چەند ماددەیەکی کیمیایی کە دەبێتە هۆی بانگکردن و کۆبوونەوەی چەندین خڕۆکەی خوێن، لەوانە: خڕۆکە سوورەکانی خوێن (RBCs) و خەپلەکانی خوێن (Platelets) کە بە یارمەتی فاکتەرەکانی تری خوێن مەیین (کە بەشێکن لە پێکهاتەکانی پلازمای خوێن) بە تایبەتی ماددەی فایبرینۆجین کە دەگۆڕدرێت بۆ فایبرین (Fibrinogen → Fibrin)، ئەم کردارانە بەیەکەوە دەبنە هۆی دروست بوونی خوێن مەیین لە شوێنی برینداری‌دا، و وەستاندنی خوێن بەربوونەکە، هەروەها شانە بەستەرەکان لەو شوێنەدا چالاك دەبن بە مەبەستی دەست کردن بە سارێژ کردنەوەی ئەو برینداری‌یە، لە لایەکی

ئەمە دەبێتە هۆی ئاگاداركردنەوەی كۆتاییـیە دەمارییـە هەستەوەرەكان بۆ دابەزینی فشاری خوێن، وەك: (Baro Receptors & Mechano Receotors) كە لەناو دڵ و خوێنبەرە گەورەكانی لەشدا هەن، ئەم كۆتاییـیە دەمارییانەش هەڵدەستن بە ناردنی ئیشارات و تەزووی دەماری بۆ ئاگادار كردنەوەی چەند سەنتەرێكی مێشك لە ناوچەی (Hypothalamus) لە مێشكدا لەو برینداریيە و دابەزینی فشاری خوێنە، ئەم سەنتەرانەی مێشك بریتین لە بنكەی سەرەكی بۆ وەرگرتن و هەست كردن بەو ئیشاراتە جۆراوجۆرانەی كە دوای بریندار بوون و نەخۆشكەوتن دەردەچن، بەڵام با بزانین هەر لە شوێنی بریندار خۆیدا چەند چالاكییەك روودەدات بۆ راگرتنی ئەم خوێن بەربوونە:

## كۆئەندامی دڵ و سووڕانی خوێن



*Human Circulatory System:* The human circulatory system is composed of the muscular heart and an intricate network of elastic blood vessels known as arteries, veins, and capillaries. These structures work together to circulate blood throughout the body, in the process delivering life-preserving oxygen and nutrients to tissue cells while also removing waste products.

شوێنی برینـدار هەڵدەستێت بە دروست كردن و رژاندنی چەند ماددەیەكی كیمیایی كە دەبێتە هۆی بانگكردن و كۆبوونەوەی چەندین خڕۆكەی خوێن، لەوانە: خڕۆكە سوورەكانی خوێن (RBCs) و خەپلەكانی خوێن (Platelets) كە بە یارمەتی فاكتەرەكانی تری خوێن مەیین (كە بەشێكن لە پێكهاتەكانی پلازمای خوێن) بە تایبەتی ماددەی فایبرینۆجین كە دەگۆڕدرێت بۆ فایبرین (Fibrinogen → Fibrin)، ئەم كردارانە بەیەكەوە دەبنە هۆی دروست بوونی خوێن مەیین لە شوێنی برینداریدا، و وەستاندنی خوێن بەربوونەكە، هەروەها شانە بەستەرەكان لەو شوێنەدا چالاك دەبن بە مەبەستی دەست كردن بە سارێژ كردنەوەی ئەو برینداريیە، لە لایەكی

ترەوە ئەم کردارانە دەبنە هۆی بانگ کردن و کۆکردنەوەی خانە قووت دەرەکان (
جۆرێکن لە خڕۆکە سپییەکانی خوێن) بە مەبەستی پاك کردنەوەی شوێ
بریندار لە پاشماوە، و لە ماددە زیانبەخشەکان، لە لایەکی تریشەوە ئەم خانا
دەبنە هۆی چالاك کردنی خانەکانی تری بەرگری.




**Iuman Heart**

he human heart is a hollow, pear-shaped organ about the size of a fist. The heart is iade of muscle that rhythmically contracts, or beats, pumping blood throughout the ody. Oxygen-poor blood from the body enters the heart from two large blood vessels, ie inferior vena cava and the superior vena cava, and collects in the right atrium. Vhen the atrium fills, it contracts, and blood passes through the tricuspid valve into ie right ventricle. When the ventricle becomes full, it starts to contract, and the icuspid valve closes to prevent blood from moving back into the atrium. As the right entricle contracts, it forces blood into the pulmonary artery, which carries blood to the ings to pick up fresh oxygen. When blood exits the right ventricle, the ventricle elaxes and the pulmonary valve shuts, preventing blood from passing back into the entricle. Blood returning from the lungs to the heart collects in the left atrium. When iis chamber contracts, blood flows through the mitral valve into the left ventricle. The ft ventricle fills and begins to contract, and the mitral valve between the two hambers closes. In the final phase of blood flow through the heart, the left ventricle ontracts and forces blood into the aorta. After the blood in the left ventricle has been orced out, the ventricle begins to relax, and the aortic valve at the opening of the orta closes.



ئەبینی خوێن و دروست بوونی کلۆتی خوێن لەناو بۆری یەکانی خوێندا

لــە هــەمان کاتــدا بــەهۆی ئــەم خــوێن بــەربوون و دابەزینی فشاری خوێنە رێژەیەکی کەمتر لە خوێن بەناو ئەندامــەکانی لەشــدا دەروات، بەتایبــەتی بــەناو بۆری یەکانی گورچیلەدا، کــە ئــەم گۆڕانــە راســتەوخۆ دەبێتــە هــۆی رژانــدنی ماددەیــەکی تایبــەتی لــە گورچیلەکانەوە بــۆ نــاو سووڕی خــوێن کــە ئــەویش هۆرمۆنی (ڕەنین)ە (Rennin) ئەم هۆرمۆنە کە دەچێتە سووڕی خوێنــەوە و دەبێتــە هــۆی گــۆڕینی مــاددەی: ئەنجیۆتێنس‌ـــــینۆجین بـــــۆ ئەنجیۆتێنســـــین ١ (Angiotensinogen → Angiotensin I)، ئەم ماددەیە (ئەنجیۆتێنسین١) دوایــی لــەناو ســی یەکاندا دەگۆڕدرێــت بــۆ (ئەنجیۆتێنســین٢)، کــە ماددەیــەکی بەهێزی گرژکەری بۆری یەکانی خوێنە، و دەبێتــە هــۆی بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن بۆ ئاستی ئاسایی خۆی، لــە هــەمان کاتــدا ئــەم دوو ماددەیــە (هۆرمــۆنی ڕەنــین، ئەنجیۆتێنســین٢) لەگــەڵ ســووڕی خوێنــدا دەگەنــە مێشــك و زیــاتر ئاگــاداری ســەنتەرەکانی (Hypothalamus) دەکەنــەوە بــۆ وەرگرتنــی هەڵوێســتی زیــاتر بەرامبەر بەو زیانەی روویداوە.

*کەناڵی دووەم:*

لە ژێر پێستی مرۆڤدا تۆڕێکی ئاکۆتا لە کۆتایی یە دەماری یەکان هەیە، لە کاتی هەر برینداری یەکدا ئەو کۆتایی یە دەماری یانە تووشی بڕان دەبێت، هەر لە شوێنی برینداری یەکەدا کۆتایی یە دەماری یە براوەکانی ژێر پێپێست هۆرمۆنێك دەڕژێن کە ئــەویش هۆرمــۆنی (نۆرئــەدرینالین)ە (Noradrenalin)، کــە دەچــێتە ســووڕی خوێن و لەوێوە دەگاتە مێشك، بەهەمان شێوە ئــەم هۆرمۆنە رۆڵی ئاگادارکــەرەوە دەبینێــت بــۆ ســەنتەرەکانی (Hypothalamus) لەمێشــکدا، لەگــەڵ ئــەو

فاکتەرانەی تر کە باسمان کردن، لەم سەنتەرانەوەیە کە هەموو لە
ئاگاداردەکرێن بۆ بە هانا چوون و یارمەتیدانی ئەندامی بریندار.

*کەنالی سێیەم:*

هەر لەو کۆتاییەیە دەمارییە براوانە خۆیانەوە ئیشارات (ڕیسپۆنس) و تەزوو دەماری بەهۆی دەمارەکانی هەستەوە دەچن بۆ سەنتەرەکانی دەمار لەبڕبڕە پشتدا (Spinal Cord)، لەوێوە سەردەکەون بۆ (Thalamus) لەمێشک پاشان بۆ ناوچەی (Post Central Gyrus) لە توێکڵی مێشکدا و پاشان ناوچەی (Limbic System) و دوایی ناوچەی (Reticular Formation) کە لە سەرەنجامی کۆتاییدا دەگەنە سەنتەرەکانی کۆنترۆڵکردنی چالاکییەکان (Hypothalamus)دا.

کەواتە لێرەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە شوێنی زیان لێکەوتوو سکاڵا دەکا لەو کەناڵە جیاوازانەی کە باسمان کردن، و ئەم ڕاستییە زانستییانە ١٠٠ پڕاوپڕی مانای فەرموودە پیرۆزەکەی پێغەمبەرە (ﷺ).



چەند وێنەیەکی پێکهاتە و کاری خڕۆکە سپییەکانی خوێن لە جۆری خڕۆکە قووتدەرەکان.





## وەڵامەکانی سەنتەرەکانی مێشك و کۆئەندامەکانی لەش:

پاشان لە فەرموودە پیرۆزەکەدا هاتووە کە کاتێك ئەو ئەندامە کە سکاڵا دەکات، هەموو ئەندامەکانی لەش بەهانایەوە دەچن ﴿إذا أشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد ...﴾، لەزمانی عەرەبیدا تداعی بەم مانایانە هاتووە: تداعى: ١- دعى بعضه بعضاً، من الدعوة أي النداء. ٢- تجمع و اقبل من جهات شتى. ٣- إستعد و تجهز، يقال تداعو للحرب أي إعتدوا.

**واتە:** ١- بەمانای بانگ کردنی یەکتری بۆ کارێك بە مەبەستی بەهاناوە چوون. ٢- کۆبوونەوە لە چەند لایەنێکی جیاوازەوە بۆ شوێنێك. ٣- خۆئامادەکردن و ئامادەباشی بە مەبەستی بەرەنگار بوونەوە.

هەر بەهۆی راستییەکانی زانستی کارئەندامزانییەوە (فیسیۆلۆژی) زانایان زۆر بە وردیی و ئاشکرا بۆمان باس دەکەن و بۆمان دەردەکەوێت کە چۆن هەموو لەش دەچن بەدەم ئەندامی زیان لێکەوتووەوە، کە بێگومان هەموو ئەندامەکان لەلایەن سەنتەرەکانی مێشکەوە ئاگادار دەکرێنەوە و فەرمانیان پێدەدرێت کە چ کارێك بکەن و چۆن بتوانن بە هەموو لایەکیان بە هاوئاهەنگی و سەنگینییەکی تەواوەوە یارمەتی ئەندامی زیان لێکەوتوو بدەن.

کەواتە ئەندامی بریندار یان زیان لێکەوتوو بە گشتی کارێکی زۆر باش دەکات کە بەم کرداری سکاڵاکردنە هەڵدەستێت، و لەوەش باشتر ئەوەیە کە سکاڵاکانی ئاراستەی ئەو لایەنە دەکات (کە کۆئەندامی دەمار و مێشکی مرۆڤە) کە تەنها لایەنێکە بتوانێت یارمەتی بدات و گەلەکۆمەکی بۆ کۆبکاتەوە، لەراستیدا ئەم وردەکارییە سەرنجمان رادەکێشێت بۆ گەورەیی دەسەڵاتی ئەو پەروەردگارەی دروستکەری مرۆڤ و دارێژەری ئەم وردەکارییە ناوازەیە لەناو لەشی مرۆڤدا، کە لە هەمان کاتیشدا هیدایەت و رێنموویی هەموو ئەندامەکانی داوە و بەرنامەیەکی تۆکمە و تێروتەسەلی بۆ دارشتوون بۆ پڕکردنەوەی پێویستییەکانیان و هەروەها بۆ چارەسەری کێشەکانیشیان لە هەموو بارودۆخێکی ناهەمواردا.

دەبا ئێستا وەڵامی مێشك و میكانیزمی بەهاناوە چوونی هەموو ئەندامەكانی لەش بۆ ئەو ئەندامە بریندارە بزانین:

### هێڵكاری ژمارە (٢)

### وەڵامی سەنتەرەكانی (Hypothalamus) لە مێشكدا




ئاشكرایە لە مێشكی مرۆڤدا چەندین سەنتەری تێدایە بۆ كۆنترۆڵكردنی چالاكییەكانی هەموو ئەندامەكانی لەش، و بۆ ئەوەی كە وەڵامی گونجاو هەبێت بۆ ئەو برینداری‌یەی كە تووشی لەش هاتووە، ئەم فەرمانانەی لای خوارەوە لە مێشكەوە بەهۆی دەمارەكانەوە كە دەچنە ناو هەموو ئەندامەكانەوە دەردەچێت:

۱- ئاگادار کردنەوەی کوێرە ڕژێنی ژێر مێشك (Pituitary Gland): بە شای کوێرە ڕژێنەکانی لەش دەناسرێت، کوێرە ڕژێنێکە لەناو کەللەی سەردا، کە چەندین هۆرمۆن دەرێژێت بۆ کۆنترۆڵ کردنی سەرجەم چالاکییەکانی لەش، ئەم ڕژێنە لە پلی پێشەوە و پلی دواوە پێکهاتووە، ئەم ڕژێنە لە سەنتەرە بالاکانی مێشکەوە فەرمانی ڕژاندنی هۆرمۆنەکانی بۆ دێت، ئاگادار کردنەوەی پلی پێشەوەی ئەم ڕژێنە دەبێتە هۆی ڕژاندنی زیاتری چەند هۆرمۆنێکی گرنگ و چالاککەر بۆ لەش لەوانە:




کوێرە ڕژێنەکان لە لەشی مرۆڤدا

*هۆرمۆنی ACTH (Adreno Cortico Trophic Hormone): ئەم هۆرمۆنە کاردەکاتە سەر ڕژێنی سەر گورچیلە (Adrenal Gland)، کە ئەمیش هەڵدەستێت بە ڕژاندنی زیاتری هەردوو هۆرمۆنی: کۆرتیزۆڵ (Cortizol) و

ئەڵدۆستیرۆن (Aldosterone)، لە توێکڵی ئەم ڕژێنەوە*، پاشان هۆرمۆنی کۆرتیزۆڵ هەڵدەستێت بە هاندانی بەشی ناوەوەی (مۆخی) ئەم ڕژێنە بۆ ڕژاندنی زیاتری هۆرمۆنی ئەدرینالین (Adrenaline)، کەواتە سەرەنجامی کۆتایی بریتی‌یە لە زیادبوونی ڕژاندنی ئەم سێ هۆرمۆنە گرنگە (کۆرتیزۆڵ، ئەڵدۆستیرۆن، ئەدرینالین)، دوو هۆرمۆنی (کۆرتیزۆڵ و ئەڵدۆستیرۆن) هەڵدەستن بەزیادکردنی زیندە چالاکی (Metabolism)ی شانە و خانەکانی لەش بەگشتی، بۆ دروست کردنی ووزەی زیاتر و گورجوگۆڵ بوونیان و ناردنی یارمەتی بۆ ئەندامی بریندار.

هەروەها کردارەکانی دروست کردن و بنیاتنان لە شانەکاندا زیاد دەکەن بە مەبەستی زووتر چاکبوونەوەوە، هەردوو هۆرمۆنی (ئەدرینالین و کۆرتیزۆڵ) کرداری پشتیوانی یەکتری‌یان هەیە لەسەر سی‌یەکان، و دەبنە هۆی فراوان کردنی بۆری‌یەکانی هەناسەدان بۆ وەرگرتنی ئۆکسجینی زیاتر، هەروەها هۆرمۆنی ئەڵدۆستیرۆن (Aldosterone)یش هەڵدەستێت بە هاندانی مژینەوەی زیاتری ئاو و کانزاکان لە بۆری‌یە پێچاوپێچەکانی گورچیلەوە بۆ یارمەتیدانی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن بۆ ڕاددەی ئاسایی خۆی.

*هۆرمۆنی TSH (Thyroid Stimulating Hormone): کار دەکاتە سەر کوێرە ڕژێنی دەرەقی (Thyroid Gland) کە دەکەوێتە بەردەم قوڕگی مرۆڤەوە، بۆ ڕژاندنی زیاتری هەردوو هۆرمۆنی ثایرۆکسین (T4-Thyroxin) و (T3-Tri Iodo Thyronine)، کە دەبنە هۆی زیاتر دروست بوونی ووزە، و بەرز بوونەوەی پلەی گەرمی لەش، واتە دروست بوونی تـا (کە لە دوایی‌دا باسی دەکەین)، ئەمانەش لە ڕێی چالاك کردنی زیندە چالاکی‌یەکانی ئەندامەکانی لەشەوە، هەروەها ئەم هۆرمۆنە کاریگەری هۆرمۆنی ئەدرینالین لەسەر کۆئەندامی سووڕانی خوێن و شانەکان زیاد دەکات.

---

* لەگەڵ ئەوەی دوو ڕژێنەکەی سەرگورچیلە بە قەبارە بچووکن، بەڵام یەکێکن لە گرنگترین ئەندامەکانی لەش بە تایبەتی لە کاتی ڕوودانی هەر زەرەرێك بە لەش، بە تایبەتی هۆرمۆنی کۆرتیزۆڵ زۆر گرنگە بۆ بەردەوامبوونی ژیان و بەرەنگار بوونەوەی نەخۆشی.

*هۆرمۆنی گەشەکردن (Growth Hormone) GH: ئەم هۆرمۆنە دوو کاریگەریی سەرەکی دەبێت: ١- زیاتر کردنی دروست بوونی فاکتەرەکانی گەشەکردن (Growth Factors)، و چالاك کردنیان بە تایبەتی فاکتەری سۆماتۆمیدین (Somatomedine)، کە لە جگەر و شانە بریندارەکانەوە دەروست دەکرێن، و کاردەکاتە سەر شانە بەستەرەکان (شانە لکێنەرەکان Connective Tissues)، بە تایبەتی لە شوێنی شانە بریندارەکاندا و دەبێتە هۆی دەست پێکردنەوەی گەشەکرنەوەیان بۆ پڕکردنەوە و چاك کردنەوەی برینداریەکە. ٢- هەروەها هۆرمۆنی گەشەکردن دەبێتە هۆی زیاتر دروست بوون و ڕژاندنی هۆرمۆنی ئیریثرۆپۆیتین (Erythropoietin) لە گورچیلەکانەوە، کە دەبێتە هۆی دروست بوونی زیاتری هیمۆگلۆبین و خرۆکە سوورەکانی خوێن لە مۆخی ئێسقاندا، کە گەیەنەری خۆراك و ئۆکسجین و ماددە گرنگ و پێویستەکانە بۆ شانەکانی لەش، بەتایبەتی بۆ شانە بریندارەکان.

٢- ئاگادار کردنەوەی پلی دواوەی ژێرمێشکە ڕژێن: دەبێتە هۆی ڕژاندنی چەند هۆرمۆنێك کە گرنگترینیان بریتییە لە: هۆرمۆنی دژی دەردانی میز (Antidiuretic Hormone) ADH، ئەم هۆرمۆنە لە پلی پشتەوەی ژێر مێشکە ڕژێن و بەهۆی کاریگەریی ڕاستەوخۆی ناوچەی (Hypothalamus) لە مێشکدا دەرێـژرێت، ئەم هۆرمۆنە کاردەکاتە سەر گورچیلەکان بە تایبەتی لوولەکانی دەردان و ئاراستەیان دەکات بۆ کەم کردنەوەی دەردراوەکان و مژینەوەی زیاتری ئاو و کانزاکان بۆ ناو خوێن و نەهێشتنی فەوتانی شلەمەنی لەش، ئەمەش بە مەبەستی بەرزکردنەوەی فشاری نزمبووی خوێن.

٣- ئاگادار کردنەوە و چالاکتر کردنی سەنتەرەکانی کۆئەندامی دەماریی هەستیی یان بەسۆز (Sympathetic Nervous System): کە دەکەونە ناوچەی ملی مێشك و لاکێشە مۆخ (Brain Stem & Medulla Oblongata) لە دەماغدا، ئەم کۆئەندامە چەندین سەنتەری گرنگی تێدایە کە کاردەکەنە سەر دڵ و سییەکان و خوێنبەرە گەورەکان، لە سەنتەرە گرنگەکانی ئەم کۆئەندامە:




**Autonomic Nervous System**

The autonomic nervous system directs all activities of the body that occur without a person's conscious control, such as heartbeat, breathing, and food digestion. It has two parts: the sympathetic division, which is most active in times of stress, and the parasympathetic division, which controls maintenance activities and helps conserve the body's energy.

– سەنتەری هەناسەدان (Respiratory Center): لە لاکێشە مۆخدایە، بەهۆی چەند دەمارێکی تایبەتی‌یەوە کار دەکات، کە دەچنە ناو سی‌یەکان و ناوپەنچکەوە، ئاگادار کردنەوەی ئەم سەنتەرە کاردەکاتە سەر هەناسەدان، بۆ زیاد کردنی ڕێژە و قووڵی هەناسەدان، کە سەرئەنجام دەبێتە هۆی وەرگرتنی زیاتری ئۆکسجین بۆ ناو خوێن، بۆ پڕکردنەوەی ئەو پێویستی‌یە زیادەی هەیە بۆ گازی ئۆکسجین کە بەهۆی زیادبوونی زیندە چالاکی‌یەکانەوە دروست بووە.

– سەنتەری خێراکردنی لێدانی دڵ (Cardiac Accelerator Center): لەڕێی ئاگادار کردنەوەی ئەم سەنتەرە لە لاکێشەمۆخدا کاریگەریی‌یەکەی دەبێتە هۆی زیادکردنی ڕێژە و هێزی لێدانی دڵ، سەرەنجام پەستانی نزمبووی خوێن بەرز دەکاتەوە، بۆ ئەوەی خوێنی پێویست بچێت بۆ ئەندامە گرنگەکان وەك: دڵ و مێشك و گورچیلەکان، ئەمە سەرەڕای کەمبوونەوەی قەبارەی خوێن بەهۆی خوێن بەربوون و پاڵاوتنی پلازما لە برینەکەوە، مەبەستێکی گرنگی تری ئەم کردارە بریتی‌یە لە زیاتر گەیاندنی ماددە خاوە پێویستەکان: (خۆراك، ئۆکسجین، هۆرمۆنەکان، ماددەکانی مەیینی خوێن، خڕۆکە سپی‌یەکانی خوێن...... هتد) بۆ سەرجەم شانەکانی لەش و بە تایبەتی بۆ شانە برینداره‌کان.

– سەنتەری گرژکردنەوەی خوێنبەرەکان (Vasomotor Center): ئاگادار کردنەوەی دەبێتە هۆی گرژکردنی خوێنبەرەکان، بە مەبەستی بەرز کردنەوەی پەستانی خوێن کە دابەزیوە و بۆ باشتر و زووتر گەیاندنی ماددە خاوە پێویستەکان بۆ لەش.

–سەنتەری هاندانی بەشی ناوەوەی (مۆخی) کوێرە ڕژێنی سەر گورچیلە (Adrenal Medulla): ئەمیش بەمەبەستی ڕژاندنی هەردوو هۆرمۆنی پێویستی (ئەدرینالین و نۆرئەدرینالین) بە ڕێژەیەکی زیاتر.

٤- ڕژاندنی هەردوو ماددەی (ئەندرۆفین و ئینکیفالین): کە لە مێشك خۆیەوە (دەماخ و دڕکەپەتکەوە) دەڕژێن: لە کاتی ئەو برینداری‌یەدا دوو ماددەی تایبەتی دەڕێژرێن وەك وەڵامێك بۆ برینداری و هەست کردن بە ئازار، کە بینراوە

ئەم دوو ماددەیە (١٨-٣٠) جار زیاتر لە ماددەی مۆرفین بەهێزترن، دوو ماددەی بەهێزی ئازار کەمکەرەوەن، هەروەها دەبنە هۆی هێمن کردنەوەی لەش و چالاکی‌یەکانی لەو کاتی ترس و تێکچوونەی کە بەسەر برینداردا دێت، کە لەو کاتەدا بریندارەکە توانای راکردن و بەرپەچ دانەوەی نامێنێت، کاریگەری ئەم دوو ماددەیە بە ئاشکرا لەو بریندارانەی جەنگدا دەبینرێت کە تووشی برینێکی کاریگەر بوون بەڵام هەست بەئازار ناکەن، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە هەموو لەش بەسەنگینی کاربکەن، بزرکاندن لەکارەکاندا روونەدات و هەموو ئەندامەکانی لەش بەسەنگینی کارەکانیان راپەڕێنن بۆ یارمەتی ئەندامی بریندار.



## ٥- کاریگەریی ئاگادار بوونەوەی سەنتەرەکانی تری مێشك:

- ئەو وەڵامانەی روودەدات لەکاتی ئاگادار بوونەوەی هەردوو سەنتەری (Limbic System) و (Reticular Formation) لە مێشکدا لە بوونی مەترسی‌یەك لەسەر لەش: دەبێتە هۆی روودانی بە خەبەری تەواو و بەردەوام بۆ مێشك و هەموو لەش بەگشتی، هەروەها دەبێتە هۆی ئاگادار بوونەوەی زیاتری کۆئەندامی دەماریی بەسۆز (Sympathetic Nervous System) بۆ هەستان بە گورجی بەو چالاکی‌یانەی کە پێشتر باسمان کرد، و بەرز کردنەوەی راددەی گرژیی ماسولکەکان و هەستیاری‌یان.

دەرەنجامی کۆتایی ئەمانە بریتی‌یە لە ڕوودانی شەونخونی و بەخەبەریی تەواو و بەردەوامی مێشک و لەش و بەرزبوونەوەی چالاکی‌یان لە کاتی بریندلری یان نەخۆشی‌دا.

– چەند ئیشاراتێك و تەزوویەکی دەماریی دەنێردرێت بۆ ناوچەی هەڵگرتن و کۆکردنەوەی بیرەوەری‌یەکان (مراكز الذاكرة Memory Centers): بە مەبەستی وەرگرتنەوەی بیرەوەری کۆن سەبارەت بە برینداری و نەخۆشی لە رابوردوودا، و سوود وەرگرتن لەو تاقی‌کردنەوە و شارەزایی‌یە کۆنانە لەو بارەیەوە، ئەمیش بۆ ئاراستەکردنی هەوڵەکان بە شێوەیەکی باشتر بۆ چارەسەر کردنی ئەم گرفتە نوێ‌یە.

بەڵگە لەسەر ئەمە ئەوەیە کە هەر جارێك مرۆڤ تووشی برینداری‌یەك دەبێت وەڵامی ئەندامەکانی بۆ چارەسەر کردنی ئەو برینداری‌یە جار لەدوای جار باشتر دەبێت، بە تایبەتی لەچاو کەسێکدا کە ئەو برینداری‌یەی نەبینیبێت.

لە مرۆڤ و گیاندارانداا بەڵگەی زانستی زۆر دۆزراونەتەوە لەسەر ڕۆڵی باشی بیرەوەری کۆنی نەخۆشی و برینداری لە باشتر چارەسەر کردنی گرفتی نوێ‌دا.

## باسی وەڵامەکانی مێشك و لەش بە درێژی:

بە گەیشتنی ئەو سکالایانەی ئەندامی بریندار بۆ سەنتەرەکانی مێشك لە ناوچەی (Hypothalamus)دا، لێرەوە سەنتەرە باڵاکانی مێشك لە ناوچەی توێکڵی مێشکدا (Cerebral Cortex) لێی ئاگادار دەکرێن، و لەم سەنتەرە باڵایانەوە دیسانەوە و بە بەردەوامی فەرمان دادەبەزێت بۆ ناوچەی (Hypothalamus) بۆ بەردەوام بوونی چالاکی‌یەکانی، کە دەبێتە ئاراستە کردنی چالاکی‌یەکانی لەش بۆ چارەسەر کردنی ئەو گرفتە، هەروەها ئەم کارتێکردنە هاوبەشە بازنەیی‌یە لەنێوان بەشەکاندا بەم شێوەیە:

(ئەندامی بریندار ↔ ناوچەی Hypothalamus ↔ سەنتەرە باڵاکانی توێکڵی مێشك)

ئەمە کۆتایی نایەت تەنیا بە چارەسەر کردنی ئەندامی بریندار نەبێت.

وەك باسمان كرد لەم سەنتەرانەی مێشكەوە هۆكارە كارتێكەرەكان كە بریتین لە: (١-تەزووی دەماری بەهۆی دەمارەكانەوە كە بەناو هەموو ئەندام و بەشەكانی لەشدا بڵاوبوونەتەوە، ٢- هۆرمۆنەكانی ژێرمێشكە رژێن كە بەهۆی سووڕی خوێنەوە دەگوێزرێنەوە)، دەردەچن بۆ هەموو ئەندامەكانی لەش، بەهۆی ئەم كارتێكەرانەوە تەنانەت هیچ شانەیەك و خانەیەكی لەش نامێنێت كە كاری تێنەكرێت، بۆ ئەوەی هەموویان رۆڵیان هەبێت لە چارەسەر كردنی ئەو گرفتەی لەشدا، بەڵام هەندێك ئەندام زیاتر لە ئەندامەكانی تر كاردەكەن لەم كاتانەدا بە تایبەتی ئەم ئەندامانە:

**رۆڵی گورچیلەكان لە كاتی نەخۆشی و برینداریدا:**

پێشتر باسكرا كە گورچیلەكان هەڵدەستن بە هێشتنەوەی ئاو و خوێی سۆدیۆم (لەژێر كاریگەری هۆرمۆنی دژەدەرداندا ADH)، و دەركردنی پۆتاسیۆم (لە ژێر كاریگەری هۆرمۆنی ئەڵدۆستیرۆندا) بۆ زۆرترین رێژەی توانراو، ئەمەش زۆر گرنگە بۆ بەرەنگار بوونەوەی ئەو لەدەستدانی شلەمەنییەی لە برینەكەوە روودەدات، و بەرەنگار بوونەوەی ئەو بارەی كە نەخۆشەكە لەوانەیە نەتوانێت بۆ ماوەیەكی باش ئاو بخواتەوە، هەروەها گورچیلەكان رۆڵێكی گرنگ دەبینن لە بەرهەمهێنانی هۆرمۆنی (ئەڵدۆستیرۆن)، ئەویش بە رژاندنی هۆرمۆنی (رەنین)، كە چەندین رۆڵ و كاریگەریی گرنگی تری هەیە (وەك لەسەرەوە ئاماژەی پێدراوە).

گورچیلەكان هەڵدەستن بە دەركردنی پۆتاسیۆمی زیادە و دروستبوو لە خانەكانی لەشەوە لە كاتی كردارەكانی زیندەچالاكی و كردارەكانی تێكشكاندنی زیادە لە لەشدا (Catabolic & Hypercatabolic States)، و گۆڕینەوەی بە سۆدیۆم كە لە لوولەكانی گورچیلەوە دەمژرێنەوە، ئەگەر ئەم كردارە روونەدات (وەك كاتێك كە گورچیلەكان تووشی سستی و وەستان دەبن) ئەوا دەبێتە هۆی مردنی مرۆڤەكە، بەهۆی بەرز بوونەوەی رێژەی پۆتاسیۆم لە لەشدا بۆ رادەیەك كە دەبێتە هۆی وەستانی دڵ و لەكار كەوتنی، كەواتە رۆڵی گورچیلەكان زۆر گرنگ و سەرەكییە لە كاتی نەخۆشی و برینداریدا.

**ڕۆڵی دڵ و کۆئەندامی سووڕانی خوێن:**

زۆر ئاشکرایە کە خوێن گوێزەرەوەی ئۆکسجین و خۆراکە بۆ ئەندامی بریندار و ئەندامە چالاکەکان بۆ یارمەتی ئەندامی بریندار، هەر ئەوە کە هۆرمۆنە جیاوازەکان دەگوێزرێتەوە لە نێوان ئەندامەکاندا، ماددە مەیەنەرەکانی خوێنیش دەگوێزرێتەوە بۆ ئەندامی بریندار، و لەهەمان کاتدا ماددە دژە مەیینەکانیش هەڵدەگرێت بۆ ڕێگرتن لە مەیینی خوێن لەناو لوولەکانیدا، هەروەها دژە تەنەکان و خانەکانی بەرگری هەڵدەگرێت بە مەبەستی بەرەنگار بوونەوەی هەر تەنێکی بێگانە یان میکرۆبێکی زیانبەخش کە لە هەر شوێنێکی لەشەوە دەچنە ژوورەوە.

بە مەبەستی ئەنجامدانی ئەم کردارانە بە شێوەیەکی خێراتر، ماسولکەکانی دڵ چالاکتر دەکرێن لەڕێی تەزووە دەمارییەکان و هۆرمۆنەکانەوە (بڕوانە پێشتر)، بۆ ئەوەی لێدانی خێراتر و پەمپدانی بەهێزتر بێت، لێرەوە ڕێژەی پاڵنان و پەمپدانی خوێن (Cardiac Output) چەند جارە دەبێتەوە لە کاتی نەخۆشیدا، هەروەها لوولە خوێنبەرەکانیش گرژدەبن بۆ ئەوەی پەستانی خوێن بەرز بکەنەوە، کە زیاتر لوولەکانی پەلەکان گرژدەبن بە مەبەستی گێڕانەوەی خوێن لێیانەوە بۆ شوێنە چالاکەکانی لەش.

**زیاد بوونی زیندە چالاکییەکان لە کاتی برینداریدا:**

ئەم زیندە چالاکییانەی لەش (Metabolic Responses) مەبەست لێیان دروست کردن و دەرپەڕاندنی ووزەیە و هەڵگرتنێتی لە گەردەکانی ئەدینۆسینی سێ فۆسفاتیدا (Adenosine Triphosphate) یان (ATP)، ڕۆڵی سەرەکی لەم کردارانەدا بۆ هۆرمۆنەکانی: کۆرتیزۆڵ، ئەدرینالین، نۆر ئەدرینالین، هۆرمۆنی گەشەکردن و هۆرمۆنی گلوکاگۆنە (کە لە پەنکریاسەوە دەردەدرێت)، کە هەڵدەستن بە تێکشکاندنی شەکری هەڵگیراو (گلایکۆجین) و گۆڕینی چەوری و پرۆتینەکان کە هەڵگیراون لە جگەر و ماسولکەکان و شانە بەستەرەکاندا و هەڵیاندەوەشێنن بۆ ماددە خاوەکانیان، لە ئەنجامی ئەمەدا چەندین گەردی ئەدینۆسینی دوو فۆسفاتی (ADP) دەگۆڕدرێن بۆ ئەدینۆسینی سێ فۆسفاتی (ATP)، لە کاتی هەموو

نەخۆشی‌یەك یان برینداری‌یەکدا بە ڕێژەیەکی بەرچاو ئەم زیندەچالاکی‌یانە زیاد دەکەن و هەموو لەش دەگرێتەوە، ئەو وزەیەی پەیدا دەبێت بەزۆری بەکاردێت لە:

ا- پاراستنی سەلامەتیی ناوچەی دەوروبەری برینداری‌یەکە و چاکردنەوەی زیانەکان، چونکە ئەو خانانە وزەیەکی زۆریان دەوێت بۆ چاکردنەوەی ئەو زەرەرانەی پێیان گەیشتووە، هەروەها بۆ کردنە دەرەوەی ئاو و سۆدیۆمی زیادە لە ڕێی پەمپی سۆدیۆم (Sodium Pump)وە لە دیواری خانەکاندا، ئەم پەمپە وزەیەکی زۆری دەوێت و لە گەردەکانی (ATP) وەریدەگرێت.

ب-وزەیەکی بەرچاو پێویستە بۆ بەڕێوەبردنی کردارەکانی تێکشکاندن و بنیاتنان و چاك بوونەوەی شانە بریندارەکان، هەروەها کرداری دروست کردنی پرۆتینی نوێش دەگرێتەوە کە وزەیەکی زۆر زۆری پێویستە.

ج-بۆ چالاکی‌یەکانی کۆئەندامی بەرگری لە لەشدا دژی ئەو میکرۆبانەی کە هێرش بۆ لەش دێنن لە کاتی برینداری‌دا، کە خانە قووتدەرەکان هەڵدەستن بە پاکردنەوەی لەش لەمانە لە ڕێگەی کرداری: (Phagocytosis)، و لە هەمان کاتیشدا دژە تەنەکان دروست دەکەن.

د-دەست خستنی وزە بۆ چالاکی‌یە زیاد بووەکانی هەندێك لە ئەندامەکان وەك: دڵ و سی‌یەکان، و گورچیلەکان، و جگەر.

لەمانەی سەرەوە کە باسکران بۆمان دەردەکەوێت کە هیچ ئەندامێکی لەش نامێنێت کە کاری نەکرێتە سەر تەنانەت خانەیەکیش نامێنێت لە لەشدا کە بەهۆی ئەم هەموو کارلێکە کیمیایی و دەماری‌یانەی کە باسمان کرد کاری تێنەکرێت و رۆڵێکی نەبێت.

لێرەوە دەگەینە ئەو ڕاستی‌یەی کە لە کاتی هەر زەرەرێکدا و پاش سکالاکردنی ئەندامی زیان لێکەوتوو هەموو ئەندامانی لەش کاریان تێدەکرێت، و بەهەموویان کاردەکەن بۆ یارمەتی دانی ئەندامی زیان لێکەوتوو، کە بە تەواوی و پڕ بە مانای خۆی هەر سێ ماناکەی (تداعی) کە لە فەرموودە پیرۆزەکەدا هاتووە لە: (گەلەکۆمەکی کردن و بانگکردنی یەکتری و کۆبوونەوە و خۆئامادەکردن) دێنەدی.

## دیاردەی شەونخونی و دروست بوونی (تـــا):

ئەوەی لە سەرەوە باسکرا بەشی یەکەمی ئیعجازی فەرموودەکەیە، لە کۆتایی فەرموودەکەدا دەفەرموێت: ﴿تداعی له سائر الجسد بالسَّهَر والحمی﴾، واتە: هەموو ئەندامەکانی لەش گەلەکۆمەکی دەکەن بۆ ئەندامی زیان لێکەوتوو، و سەرەنجامی گشتی ئەم کارە بریتییە لە دروست بوونی شەونخونی و تـــا(الحمی) لە لەشدا.

با بزانین زانستی فیسیۆلۆژی چی دەڵێت لەم بارەیەوە و ئایا چۆن ڕوودەدات؟

بەهۆی ئەو کاریگەرییانەی پێشتر باسکرا، ئاگادار بوونەوەی دوو سەنتەری تایبەتی (Limbic System) و (Reticular Formation) لە مێشکدا دەبێتە هۆی ڕوودانی بە خەبەری تەواو و بەردەوام بۆ مێشك و هەموو لەش بەگشتی، هەروەها دەبێتە هۆی ئاگاداری زیاتری **کۆئەندامی دەماریی بەسۆز** (Sympathetic Nervous System) بۆ هەستان بە بەرز کردنەوەی ڕادەی گرژیی ماسولکەکان و هەستیارییان، دەرەنجامی کۆتایی ئەمانە بریتییە لە ڕوودانی شەونخونی و بەخەبەریی تەواو و بەردەوامی مێشك و لەش لە کاتی برینداری یان نەخۆشیدا.

### یەکەم: خەوزڕان و سوودەکانی:

(السَّهَر) بە مانای (الأرَق) واتە خەو لێنەکەوتن و خەوزڕان، بەهۆی ئەو میکانیزمەی پێشتر باسمان کرد، لەشی مرۆڤی نەخۆش و بریندار بەردەوام لە حاڵەتێکی ئاگاداری و ئامادەباشیدا دەبێت، واتە هەموو ئەندامەکانی لەش لە کاری بێووچان و بەردەوامدا دەبن، تەنانەت ئەگەر ببینین نەخۆشەکەش نوستووە و چاوەکانی داخراون، یان لەوانەیە نەخۆشەکە لەهۆش خۆی چووبێت بۆ ماوەیەکی زۆر، بەڵام بابزانین هەرگیز ئەندامەکان ناخەون و لەوپەڕی شەونخونیدا دەبن، پێشتر سەلماندمان کە چۆن: دڵ و لوولەکانی خوێن، سییەکان، گورچیلەکان، جگەر، کوێرە ڕژێنەکان، کۆئەندامی بەرگری و زیندە چالاکییەکانی هەموو ئەندامەکان لەوپەڕی چالاکیدا دەبن، دەتوانین هۆکاری ئەمەوە بگەڕێنینەوە بۆ ئەوەی کە (کۆئەندامی دەماریی خۆنەویست) لە چالاکی بەردەوامدا دەبێت لە

کاتی نوستنیشدا و بەردەوامی بە چالاکی‌یەکانی لەش دەدات، کاتێک نوستن ڕوودەدات لەم کاتانەدا نوستنێکی ئاسایی نی‌یە، چونکە لەگەڵ ئەوەدا کە چاو داخراوە بەڵام هەموو لەش بە خەبەرە، بەخەبەریی بەهۆی ئازارەوە نی‌یە، وەك خەڵك وا دەزانێت، بەڵکو پرۆسەیەکی سەربەخۆیە کە گرنگی زۆری هەیە بۆ بەرەنگار بوونەوەی نەخۆشی و برینداری.

بابزانین سوودی ئەم شەونخوونی و خەوزڕانە چی‌یە؟

خەوتنی ئاسایی بریتی‌یە لە بارێکی خاوبوونەوە وسستی لە چالاکی‌یەکانی ئەندامەکاندا، چونکە لێرەدا زیندە چالاکی‌یەکان و کردارەکانی تێکشکاندن لاواز دەبن و لەبری‌یان کرداری هەڵگرتنی ووزە و بنیاتنان بەهێز دەبن، هەروەها حاڵەتێکی سستی و خاوبوونەوە لە چالاکی ئەندامەکاندا ڕوودەدات، بۆ نموونە: (دڵ) لێدان و هێزی لێدانەکەی سست دەبێت، (ماسولکەکان) خاو دەبنەوە، زیندە چالاکی‌یەکان کەم دەبنەوە و تەنانەت پلەی گەرمی لەش دادەبەزێت، باشە ئەم بارە دەگونجێت لەگەڵ بوونی ئەندامێکی نەخۆش یان برینداردا؟!! کە ئەم ئەندامە پێویستی بە ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی خێرای ئەم زیانە هەیە بۆ ئەوەی خەتەرتر نەبێت و پاشان هەموو لەش نەگرێتەوە؟!.

بێگومان نەخێر، چونکە ئەگەر خەوی ئاسایی ڕووبدات ئەوا دەبووە هۆی شکست هێنانێکی خەتەرناك لە ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو برینداری‌یە، و ئەندامەکە خۆی و بگرە هەموو لەش دەکەوتنە مەترسی فەوتان بەهۆی ئەو زەرەرەوە، ئەمەش بە تەواوەتی لەوە دەچێت کە ئەگەر کۆمەڵێك دوژمن بدەن بەسەر شوێنێکدا لە شەودا، خەڵکی ئەو شوێنە یەکسەر بەرگری نەکەن و وەڵامیان نەدەنەوە بە چالاکی، بەڵکو بڵێن: ئێمە چاوەڕوانی بەیانی دەکەین پاشان وەڵامیان دەدەینەوە! بێگومان تا بەیانی کەسیان نامێنن بەرگری بکات!!.

هەربۆیە شەونخونی و خەوزڕانی ئەندامەکان ڕوودەدات، وەك بەشێکی سەرەکی لە چالاکی‌یەکان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی نەخۆشی یان برینداری، ئەمەش ئەوەیە کە زانستی فیسیۆلۆژی سەلماندوویەتی.

**دووەم: دروستبوونی تـــا (الحمّى Fever):**

سەبارەت بە راگرتنی پلەی گەرمی لەش، بەهۆی چەند سەنتەرێکی تایبەتەوە دەبێت لە ناوچەی (Hypothalamus) لە مێشکدا، کە چەند دەمارەخانەیەکی تایبەتی تێدایە کە هەست بە پلەی گەرمی خوێن دەکەن و دەیپێون، کاتێك پلەی گەرمی خوێن (لەش) بەرز دەبێتەوە ئەم خانانە ئیشارەت دەنێرن بۆ سەنتەرەکانی (کۆئەندامی دەماریی خۆنەویست: الجهاز العصبي اللا إرادي)، بۆ ئەوەی ئاماژە بنێرن بۆ ماسولکەکان کە خاوببنەوە، و لوولە خوێنەکانی ژێرپێست فراوان دەبن و ئارەق کردنەوە زیاد دەکات، ئەمە هەمووی بۆ لەدەست دانی ئەو گەرمییە زیادەیە، و لەگەڵ ئەمانەشدا ئەو کەسە هەست کردن بە گەرمیی زیادی بۆ دروست دەبێت و خۆی فێنك دەکاتەوە.

کاتێکیش کە پلەی گەرمی لەش نزم ببێتەوە بە پێچەوانەوە ماسولکەکان زیاتر گرژ دەبن و دەلەرزن (ئەو کەسە تووشی لەرزی سەرما دەبێت)، لوولە خوێنەکانی ژێر پێست گرژدەبن و موووەکانی پێست رێك دەبنەوە بۆ دروست کردنی چینێکی جیاکەرەوە بە مەبەستی نەهێشتنی فەوتانی گەرمی لەرێی پێستەوە، هەروەها هەست کردن بەسەرما لای ئەو کەسە دروست دەبێت و وای لێدەکات خۆی بپارێزێت، پلەی گەرمی گونجاو بۆ ژیان بریتییە لە ٣٧پلەی سەدی.

لەبارەی دروست بوونی تـــا لەکاتی نەخۆشی و زەرەرهێنانی لەشدا، زانایان ماوەی چەند ساڵێکیش لەمەوبەر وایان دەزانی تـــا بە تەنها بەهۆی میکرۆب و ماددە بێگانەکانەوە روودەدات کە دەچنە ناو لەشەوە، واتە هۆکاری دروست بوونی تـــا دەرەکییە، بەڵام تازە بۆیان دەرکەوتووە کە نەخێر هۆکاری سەرەکی دروست بوونی تـــا بریتییە لە چەند ماددەیەك کە خرۆکە سپییەکانی خوێن و شانە بریندارەکان دەری‌دەدەن لە ئەنجامی کارلێکی نێوان میکرۆب و ماددە بێگانەکان لەگەڵ خرۆکە سپییەکانی خوێندا، کە ئەو ماددانە پایرۆجینەکانن (Pyrogens)، بەتایبەتی ماددەی (Interleukin1)، کە کاتێك دەچنە سووڕی خوێنەوە و پاشان دەگەنە مێشك، سەرەنجام کاریگەرییەکی وا لە سەنتەری

راگرتنی پلەی گەرمی لەش لە مێشکدا دروست دەکەن، کە دەبێتە هۆی بەرز بوونەوەی پلەی گەرمی لەش لەڕادەی ئاسایی خۆی (کە لە مرۆڤی ئاسایی‌دا لەنێوان ٣٦،٦-٣٧،٤ پلەی سەدی‌دایە).

هەروەها هۆکارێکی تری دروست بوونی تـا بریتی‌یە لە هۆرمۆنی (ثایرۆکسین) کە لەلایەن ڕژێنی دەرەقی‌یەوە بە ڕێژەیەکی زیاتر دەڕێژرێت لەکاتی هەر زەدەرێکدا کە تووشی لەش دەبێت، کە ئەمەش دەبێتە هۆی دروست بوونی زیاتری ووزە و گەرمی لە لەشدا و پاشان بەرز بوونەوەی پلەی گەرمی لەش، کەواتە وەك لە فەرموودەکەدا هاتووە زانستی نوێی ئەمڕۆ زۆر تازە گەیشتۆتە ئەم ڕاستی‌یە و بۆی سەلماندووین کە: ماددەکانی لەش خۆی دەبنە هۆی دروست بوونی تـا لە نەخۆش و برینداردا (وەك فەرموودە پیرۆزەکە ئاماژەی پێداوە).

جا لێرەدا بابزانین سوودی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی و دروست بوونی تـا بۆ لەش چی‌یە (کە بێگومان بێ‌سوود نی‌یە):

<u>یەکەم</u>: زانایان سەلماندوویانە لەگەڵ بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەشدا بەڕادەی ١ پلەی سەدی ئەمە دەبێتە هۆی زیادبوونی زیندەچالاکی‌یەکانی لەش بەڕێژەی ١٠٪، دیارە چالاك بوونی لەش لە کاتی نارەحەتی‌دا زۆر پێویستە بۆ دروست کردنی ووزەی زۆرتر بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەو نارەحەتی‌یەدا بەزووترین کات و بە باشترین شێوە.

<u>دووەم</u>: لەش لە کاتی برینداری‌دا تووشی هێرشی میکرۆبە زیانبەخشەکان دەبێت و بینراوە کە پلەی گەرمی گونجاو بۆ زیاد بوون و گەشە کردنی ئەم میکرۆبانە لە پلەی گەرمی لەش کەمترە (٢٥-٣٧پلەی سەدی)، کەواتە ئەگەر پلەی گەرمی لەش بەرز ببێتەوە بۆ نزیکەی ٣٨ یان ٣٩پلەی سەدی، بینراوە کە ئەم گەرمی‌یە زیادەیە دەبێتە هۆکارێکی لەناوبەر بۆ زۆرێك لە جۆرەکانی بەکتریا، یان زیادبوون وگەشەیان دەوەستێنێت یان کەمی دەکاتەوە.

<u>سێیەم</u>: شانەکانی لەش لەکاتی برینداری‌دا پێویستی‌یان بە ڕێژەیەکی زیاتر لە ئۆکسجین دەبێت، کە لە خوێنەوە و بەهۆی ماددەی هیمۆگلۆبینی ناو خڕۆکە

سوورەکانی خوێن بۆیان دەچێت، بینراوە کە ئۆکسجین لە هیمۆگلۆبین دەبێتەوە لە پەستانێکی گازی دیاری کراو و هۆکاری تردا، لە کاتی بەرز بوونەوەی پلەی گەرمی لەش و دروستبوونی تادا ئۆکسجین لە پەستانێکی کەمتردا لە هیمۆگلۆبین دەبێتەوە و بە شێوەیەکی ئاسانتر دەگاتە شانەکان.

چوارەم: زانستی ئەمڕۆ بۆی ڕوون کردووینەتەوە کە لە کاتی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەشدا خرۆکە سپی‌یەکانی خوێن ڕێژەیەکی زیاتر لە ماددەی ئینتەرفیرۆن (Interferon) دەرێژن، کە ماددەیەکی دژە ڤایرۆس و میکرۆبە و خرۆکە سپی‌یەکان خۆیان توانای باشتریان دەبێت بۆ دروست کردنی دژەتەنەکان، بەم شێوەیە هیچ بوارێك بۆ زیندەوەرە مشەخۆرەکان ناهێڵنەوە کە هەل تووش بوونی لەش بەو زەرەرە بقۆزنەوە، هەروەها بێجگە لەم کارەی، دۆزراوەتەوە کاتێك ماددەی ئینتەرفیرۆن لە کاتی تادا بەخەستی دەرێژرێت بەرگری لەش لە بەرامبەر بە تووشبوون بە نەخۆشی زیاد دەکات، کە تەنانەت توانای لەناو بردنی خانە شێرپەنجەیی‌یەکانیشی هەیە لە سەرەتای دروست بوونیاندا.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە تا چەندێك سوودی هەیە، بۆیە پزیشکان لە کاتی پەیدابوونی تادا دڵخۆش دەبن و نەخۆشەکە دڵنیادەکەنەوە کە میکانیزمێکی ئاسایی لەشە و سوودی زۆر دروست دەکات، تەنانەت لە هەندێك نەخۆشی‌دا پێویست دەکات پلەی گەرمی لەش بەرز بکرێتەوە، بەتایبەتی نەخۆشی‌یەکانی جومگە و ڕۆماتیزم {ئەمە لە کاتی کردنی (علاج طبيعي) بۆ نەخۆشدا دەبینرێت، کە هەندێك ئامێر شوێنی نەخۆشی‌یەکە گەرم دەکات}.

لێرەدا سەرنجتان ڕادەکێشم بۆ فەرموودەیەکی پیرۆزی تری پێغەمبەر (ﷺ) کە موعجیزەیەکی گەورەیە و باسی سوودی تا دەکات کە ئیمامی موسلیم بۆمان دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێت: ﴿ ذكرت الحمى عند رسول الله (ﷺ) فَسَبَّها رجل، فقال: لا تسبها فإنها تنفي الذنوب كما تنفي النار خبث الحديد﴾ رواه مسلم، واتە: جارێك لەلای پێغەمبەر (ﷺ) باسی تا کرا و پیاوێك جنێوی پێدا، ئەویش فەرمووی: جنێوی پێمەدە، چونکە تا مرۆڤ لە تاوان پاك دەکاتەوە هەروەك چۆن ئاگر پیسی ئاسن

پـاك دەكاتـەوە، بەڕاسـتی موعجیزەیـەکی گەورەیـە چـونکە تـا مـرۆڤ لـە لایـەنی مەعنەوی‌یـەوە لـە تـاوان، و هـەروەها لـە لایـەنی ماددیشـەوە لـە میکـرۆب و خانـەی زیانبەخش پاك دەکاتەوە.

بەڵام بابزانین کە هەموو تـایەك سوود بەخش نی‌یە چونکە تـای زۆر بەرز (بە تایبەتی لە پلەکانی ٤١-٤٢ پلەی سەدی‌دا) دەبێتە هـۆی وەسـتاندنی ئەندامەکانی لەش لە کارکردن و دروست کردنی لەهۆش خۆچوونی قووڵ (Deep Coma) و پاشـان مـردن، هـەر بۆیـە پێغەمبـەر(ﷺ) لـە فەرموودەیـەکی تـردا ئـەم جـۆرە تـایە زۆرەی وەك پریشکێکی ئاگری دۆزەخ وەسف کردووە کە دەفەرموێت: ﴿إن الحُمَّـى من فَيح جهنم فأبردوها بالماء﴾ رواه البخاري، واتە: تـای زۆر پریشکێکی دۆزەخـە، هـەر بۆیە بەئاو ساردی بکەنەوە، کە باشترین هۆکاری دابەزانـدنی ئـەو تـایە زۆرە لە رووی زانستی‌یەوە هـەر ئەوەیـە کە لـە فەرموودەکـەدا هـاتووە کـە ئـەویش ئـاوی سـاردە، تەنانـەت دەتوانرێـت نەخۆشـەکە لـەناو هەڵبکێشـرێت یـان ئـاو بکرێـت بەسـەری‌دا، هـەر بۆیـە لـە سوونەتیشـدا و لـە کارەکـانی پێغەمبـەر (ﷺ) خـۆی‌دا هاتووە: کە هەر کاتێك تـای گرتبێت داوای کردووە کە کونەیەك ئاوی بۆ بهێنن بۆ ئەوەی بیکات بەسەر خۆی‌دا!!.

**کورتەی باس:**

ئـەم فـەرموودە پیرۆزانـە باسـی زانسـتێکیان نـەکردووە کـە لـە سـەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) زانرا بێت، تەنانـەت نـەك لـەدوای سـەدەیەك یـان ١٠سـەدە، بـەڵکو لـەدوای زیـاتر لـە ١٣سـەدە ئینجا زانایـان گەیشـتنە ئـەو راستی‌یانە، فەرموودەکـە باسـی سـکاڵای ئەنـدامی زیـان لێکـەوتوو دەکـات، کـە سـکاڵایەکی راسـتەقینەیە بـە هـەموو مانایـەك، باشـە چـۆن دەتوانێـت بـەبێ زمـان سـکاڵا بکـات؟! ئایـا خـەڵکانی سەردەمانی پێشتر دەیانزانی کە ئەم سکاڵایە راستەقینەیە و مەجازی نی‌یە؟!

زانسـتی فیسـیۆلۆژی ئـەمڕۆ زۆر بـەروونی بـۆی ئاشـکرا کـردووین کـە سـکاڵای راسـتەقینە روودەدات کاتێك ئەندامێك یـان بەشـێکی لـەش تووشـی نەخۆشـی یـان برینداری یان هەر زەرەرێکی تر دەبێت، و ١٠٠٪ لەگـەڵ فەرموودەکـەی پێغەمبـەردا

(ﷺ) یەکدەگرێتەوە، پاشان فەرموودەکە باسی ئەوە دەکات کاتێك کە سکاڵای ئەم ئەندامە زیان لێکەوتووە دەگاتە شوێنی مەبەست (کە بەرزترین دەسەڵاتە لە لەشدا کە ئەویش مێشکە)، لێرەوە وەڵام دەردەچێت بۆ هەموو ئەندامانی لەش کە بە هەموویان بە کارێکی گەلەکۆمەکیی هەستن بۆ بەهانا چوونی ئەندامی زیان لێکەوتوو، بۆ ئەوەی گرفتەکەی چارەسەر بێت و بگەڕێتەوە دۆخی ئاسایی جارانی و لەشیش لە بڵاوبوونەوەی ئاکامەکانی ئەو زەرەرە بپارێزرێت.

یەکێك لەو شتە سەرسوڕهێنەرانەی لە فەرموودەکەدا هاتووە ئەوەیە کە ووشەکانی (توادهم، تعاطفهم، تـراحمهم)ی بەکار هێناوە بۆ وەسفی شێوازی ئەو گەلەکۆمەکی و بە هانا چوونەی لەش بۆ ئەندامی بریندار، کەواتە بە شێوازێکی زۆر بەسۆز و پڕ لە بەزەیی و خۆشەویستی‌یەوە ئەندامەکانی لەش بە هانای ئەو ئەندامە زەرەر لێکەوتووەوە دەچن، (کە پێویستە موسوڵمانانیش ئاوا بن لە بەرامبەر یەکتری‌دا و ئاوا بە هانای زیان لێکەوتووەکانیانەوە بچن).

سەرسوڕهێنەرەکە لەوەدایە کە زانایانی رۆژئاوا ووشەی (Sympathetic) یان بەکار هێناوە بۆ ناوی ئەو کۆئەندامە دەماری‌یەی کە لە کاتی نەخۆشی و برینداری‌دا کۆنترۆڵی هەوڵەکان دەکات بۆ بەهاناوە چوونی ئەندامی زیان لێکەوتوو و هەوڵەکان دەخات، کە ئەم ووشەیە ئەگەر وەریگێڕین بۆ زمانی عەرەبی بە مانای (المتواد، المتعاطف، المتـراحم) دێت، واتە: بە مانای بەسۆز، بەهەست، بە بەزەیی و پڕ لە خۆشەویستیی دێت، بەڕاستی فەرموودەکە موعجیزەیەکی گەورەیە لە هەڵبژاردنی ووشە و زاراوەکانیشی‌دا!!!.

هەروەها لە فەرموودەکەدا هاتووە کە سەرەنجامی گەلەکۆمەکی لەش بریتی‌یە لە خەوزڕان (السهر)، و دروست بوونی تا (الحمی)، هەر لە زانستی فیسیۆلۆجی‌یەوە بۆمان دەرکەوت کە لە کاتی تووش بوونی ئەندامێکی لەش بەزیانێك و گەیشتنی سکاڵاکەی بۆ مێشك (هەروەك پێشتر باسمان کرد) یەکێك لە دەرئەنجام گرنگەکانی ئەم کردارە بریتی‌یە لە ئاگادار بوونەوە و چالاك بوونی سەنتەری ئاگاداری لە مێشکدا و سست بوونی سەنتەری خەوتن کە لە

ناوچەکانـــی (Limbic System و Reticular Formation)دان لـە مێشکـی مرۆڤدا.

لـە ئـەنجامی ئەمـەدا ئەندامـەکان ئیسـراحەتیان لێهەڵـدەگیرێت و خـەویان لێدەزڕێـت و کەسـی تـووش بـوو زۆر بـە زەحمـەت خـەوی لێدەکـەوێت، و ئەگـەر خەویشی لێبکەوێت ئەوا خەوی ئاسایی نی‌یە و تەنیا چاوەکانی داخراون، مێشك و هـەموو لـەش هـەر لـەباری وریـایی و ئامادەباشـی و خەوزڕانـدا دەبن، لـە هـەمان کاتــدا ئاگـــادار بوونـــەوەی کۆئەنـــدامی دەمـــاریی خۆنەوویســـتی بەســـۆز (Sympathetic Nervous System) بـە شـێوەیەکی تایبـەتی وسـەرەکی دەبێتە هۆی بەرزکردنـەوەی ڕاددەی ئاگاداری لـەش بەگشتی و گرژبوونی زیـاتر و بەردەوامی ماسولکەکانی لەش، کە سەرەنجامی گشتی ئەم پرۆسانەش بریتی‌یە لە ئاگاداری و خەوزڕانی مێشك و لەش بەگشتی.

هەروەها وەك باسکرا هەر لە شانەکانی لـەش خۆیـەوە فاکتـەرە سـەرەکی‌یەکانی دروسـت بـوونی تـــا هەیـە، ئـەم بـەرز بوونەوەیـەی پلـەی گـەرمی لـەش لەگـەڵ شـەونخونی و خەوزڕانـدا ئەوپـەڕی بەسـوودە بۆ بـەرەنگار بوونـەوەی ئـەو بـارە نـا ئاسایی‌یەی کە بەسەر ئەندامێکی لەشدا هاتووە.

پـاك و بێگـەردی بـۆ پـەروەردگار و پێغەمبەرەکـەی، لەمانـەی سـەرەوە بۆمـان دەرکەوت کە زانستی ئەمڕۆ بە تەواوەتی پشتیوانی هەموو ووردەکاری‌یەکانی ئـەم فەرموودە پـیرۆزە دەکـات و ڕاستی‌یەکانی بـۆ سـەلماندووین، هـیچ دۆزینـەوەیـەك و زانستێکی نوێی ئەمڕۆ پێچەوانەی ئەم فەرموودە پیرۆزە و هـیچ فەرموودەیـەکی تــری خــودا و پێغەمبەرەکـــەی نی‌یـــە، بـــەڵکو ســـەلمێنەری ڕاســـتی‌یەکانیان و ڕوونکەرەوەی موعیزەکەیانە.

# ژمارەی جومگەكانی لەشی مرۆڤ :

یەكێكی تر لەو فەموودە پیرۆزانەی كە ئیعجازێكی زانستی زۆر نوێی تێدایە، ئەم فەرموودەیەی خوارەوەیە:

–عن عائشة رضي الله عنها قالت: قال رسول الله (ﷺ): ﴿أنّه خُلِقَ كُلُّ إنسانٍ من بني آدم على ستين و ثلاثمائة مفصَل، فمن كَبَّرَ الله و حمِدَ الله و هلَّلَ الله و سبَّح الله و استغفرالله و عَزَلَ حَجَراً عن طريق الناس أو شوكةً أو عظماً عدد الستين و الثلاثمائة فإنّه يُمسي يومئذ و قد زَحزَح نفسه عن النار﴾ رواه مسلم.

واتە: لە عائشەی خێزانی پێغەمبەرەوە دەگێڕنەوە: كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: خوای پەروەردگار هەموو مرۆڤێكی لە سێسەد و شەست جومگە دروست كردووە، هەر كەسێك ڕۆژانە (الله اكبر، الحمد لله، لا الە الا الله، سبحان الله، أستغفر الله) بڵێت، یان بەردێك لەڕێی خەڵك لاببات، یان دڕكێك یان ئێسقانێك لاببات، بەقەد ژمارەی ئەو سێسەد و شەستە، ئەوا ئەو كەسە كە ئێوارەی بەسەردا هات خۆی لە ئاگری دۆزەخ پاراستووە و دوورخستۆتەوە.

## جۆرەكانی جومگە لە لەشی مرۆڤدا




**Types of Joints in the Human Body**
The point where two or more bones meet is called a joint. Joints are classified by their structure or the way they move. The joints of the skull are known as sutures (*top, left*). Sutures do not have a wide range of movement. Instead, they allow for growth and very limited flexibility. Hinge joints (*top, right*) allow for movement in one plane. The hinge joints of the elbow and knee, for example, bend up and down. Two flat-surfaced bones that slide over one another make up a gliding joint (*bottom, right*). Gliding joints, such as those in the wrist and the foot, provide for limited movement. Ball-and-socket joints (*bottom, left*) allow for the greatest range of motion. The ball-and-socket joints of the shoulder and hip, for example, can rotate in a complete circle.

سەرەتا با بزانین ئەم فەرموودە پیرۆزە باسی ڕەوشتی بەرز دەکات، کە چۆ
پێویستە هەموو موسوڵمانێك بەردەوام خەریکی کاری چاکە بێت و ڕەوشـ
بەرزی خۆی بنوێنێت لەیارمەتی دانی خەڵکی‌دا و بزانێت کە هۆکاری ڕزگاربوو
لە سزای دۆزەخ و بەدەست هێنانی بەهەشت و ڕەزامەندی خودا بریتی‌یە لـ
کردەوە چاکانە، لەهەمان کاتدا دەبینین ئەم فەرموودەیە ئاماژەیەکی زانستی نا
سەرسوڕهێنەری تێدایە، کە زۆر مەحاڵە لەو ڕۆژگارەدا ئەو ڕاستی‌یە لەروو
زانستی‌یەوە بزانرایە، کە ئەویش ئەوەیە کە دەفەرموێت: مرۆڤ کە دروست دەبێـ
لەشی لە (٣٦٠) جومگە پێك دێت.

زانستی توێکاری لەشی مرۆڤ (علم التشريح-Anatomy) لە ڕۆژگار
ئەمڕۆماندا ووردەکاری‌یەکانی پێك هاتنی لەشی مرۆڤی بۆ ڕوون کردووینەتەو
دکتۆرێکی موسوڵمان لەسەر بناغەی ڕاستی‌یەکانی زانستی توێکاری لەساڵ
١٩٨٥دا هەستا بە ژماردنی جومگەکانی لەشی مرۆڤ و گەیشتە ئەو ڕاستی‌یەی ک
لە لەشی مرۆڤدا ٣٦٠جومگە هەیە، ئەو کەسەش (دکتۆر السباعي حماد) بوو ک
ئێستا مامۆستا و سەرۆکی بەشی توێکاری و شانەزانی و کۆرپەلەزانی‌یە لـ
کۆلیجی پزیشکی (زانکۆی لنبان) لە عێراق، کە بە هاوکاری خێزانەکەی (د.شاد
احمد) هەستان بەم توێژینەوەیە و کاتێك کە بڵاویان کردەوە بووە مایە
خۆشحاڵی موسوڵمانان و ڕێزلێنانیان لە ووڵاتە ئیسلامی‌یەکاندا بە گشتی.

گەیشتن بەم حەقیقەتە بەڵگەیەکی ترە لەسەر موعجیزەی قورئان و سوننەت
پێغەمبەر (ﷺ)، کە چۆن و بە چ شێوازێك پێغەمبەر توانی لەشی مرۆڤ توێکار
بکات و بۆی دەرکەوت کە لەناو لەشدا ٣٦٠جومگە هەیە؟! لە ڕۆژگارێکدا ک
زانستی پزیشکی ئەوەندە دواکەوتوو بوو کە خەڵکی و پزیشکانیش لە
سەردەمەدا وایان دەزانی تەنیا هۆکاری تووش بوون بە نەخۆشی بریتی‌یە لـ
چوونە ژوورەوەی جنۆکە و شەیتانەکان بۆ ناو لەشی مرۆڤ، دیارە پێغەمبەریش
(ﷺ) خۆی ئەمەی نەدەزانی ئەگەر بە نیگا و وەحی لەلایەن دروست کەری مرۆڤەو
لەم بابەتە ئاگادار نەکرایەتەوە، بەڕاستی ئەم بەڵگانە بەسن بۆ کەسێك کە تێبگات

بۆ ئەوەی کە بۆی دەرکەوێت کە قورئان و سوننەتی پێغەمبەریش (ﷺ) هەر وەحی‌یە و لەلایەن خوای بەدەسەلاتەوە بۆ مرۆڤەکان نێردراوە.

ئێستاش فەرموو ئێوە و وردەکاری‌یەکانی ژمارەی جومگەکانی لەشی مرۆڤ کە لەم خشتەیەی لای خوارەوەدا روون کراوەتەوە :

| شوێن | هەردوو پەلی سەرەوە | هەردوو پەلی خوارەوە | بڕبڕەی پشت | پەراسووەکان | کەلاەی سەر | قورگ | لووت |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ژمارەی جومگەکان | ٥٢ | ٥٥ | ٧٦ | ٩٠ | ٧٠ | ٦ | ١١ |

**کـــۆی گشتـــی = ٣٦٠ جومگە**

**لە کتێبی: قبسات من إعجاز القرآن في خلق الإنسان (د.السباعي حماد)**

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

## سەرچاوەکان:


١-صحيح البخاري-الإمام البخاري.

٢-صحيح مسلم-الإمام مسلم.

٣-معجم لسان العرب-أبوالفضل جمال الدين محمد بن منظور.

٤-گۆڤاری (الإعجاز العلمي)/ ژمارەکانی (٣ و ٤)/ دەرکراوی: هيئة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة.

٥- پێگەی (www.tasabeeh.com) لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت.

6- A textbook of Medical Physiology \ Guyton - USA.

7- Ganong Review of Medical Physiology\Apelton & Lange - USA.

8- Textbook of Pain \ Wall.P.D. & Mwlzook - UK.

9- Stress Hormones, their Interaction & Regulation\ Axelrod J. & Reisine T.D.

10- Essentials of Surgery - (NeuroEndocrinal Response, Haemostasis and Shock Chapters) \ D.C.Sabiston-USA.

## بەرکوڵ:

لە چەندین سەدە لەمەوپێشەوە و تا ماوەیەکی نزیك لە ئێستا بیروباوەڕی خەڵکی وەهابوو کە هەموو ئەندامەکان و پارچەکانی لەشی مرۆڤ هەستیارە بۆ ئازار، وایاندەزانی کە لە سەری دەدەیت هەموو سەری دێشێت، ئەگەر لە چاوی بدەیت هەموو بەشەکانی چاوی ئازاریان دەبێت!! لای هیچ کەسێك ئەو راستی‌یە نەزانرابوو کە لە لەشدا چەند دەمارێکی تایبەت هەیە بۆ گواستنەوەی جۆرە جیاوازەکانی ئازار، تاوەکو زانستی توێکاری (علم التشريح Anatomy) پەردەی لەسەر رۆڵی کۆتایی‌یە دەماری‌یەکان و دەمارەکان خۆیان لادا لە هەست پێکردن و گواستنەوەی جۆرە جیاوازەکانی ئازاردا.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا چەندین راستی زانستی روون دەکەینەوە کە ئەو بیروباوەڕە کۆنە هەڵدەوەشێنێتەوە و بە بەراورد کردنی ئەم راستی‌یە زانستی‌یانە لەگەڵ ئەوەی کە لە قورئاندا هاتووە دەربارەی پێست، و پسپۆڕیی پێست لە گواستنەوەی هەستە جیاوازەکاندا دەگەینە ئەو راستی‌یەی کە ئەم قورئانە وتەی خوای دروستکەری بوونەوەرە و هەر ئەویشە ئەم راستی‌یانەی لە نیگاکەی‌دا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ناردووە.

با سەرەتا ئەو ئایەتانە بهێنین کە باس لەم بابەتە دەکەن:

– خوای گەورە لەبارەی سزای بێباوەڕان لە رۆژی دوایی‌دا دەفەرموێت:﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُواْ الْعَذَابَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ (النساء:٥٦).

– لەسەر هەمان بابەت لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت:﴿وَسُقُوا مَاءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءَهُمْ﴾ (محمد:١٥).

### راڤە (تەفسیری) ئایەتەکان:

–سەبارەت بە ئایەتی یەکەم (الطبري) لە تەفسیرەکەی‌دا دەڵێت: فەرموودەی (سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا) مانای ئەوەیە کە ئێمە بێباوەڕان دەکوڵێنین لە ئاگری دۆزەخدا و دەیان برژێنین، (كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ) واتە هەر کاتێك پێستی لەشیان ببرژێت تا

به تەواوەتی دەسووتێت، (بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا) ئێمە پێستەکانیان بۆ دەگۆڕین بە پێستی تر غەیری ئەو پێستەیان کە سووتاوە، (لِيَذُوقُواْ الْعَـذَابَ) واتە ئێمە وایان لێدەکەین بۆ ئەوەی ئازاری سزادان و پیسترین شێوەی ببینن، ئەمەش لەبەر ئەوەیە ئەوان لە دونیادا باوەڕیان بە ئایەتەکانی خودا نەهێناوە و پشت گوێیان خستووە و بەدرۆیان دەخستەوە*.

- (الزمخشري)یش لە تەفسیرەکەیدا (الكشاف) دەڵێت: بۆ ئەوەیە کە ئەو سزایە بۆیان بەردەوام بێت و لێیان نەبڕێت.

- دەربارەی ئایەتی دووەم (القرطبي) لە تەفسیری (الجامع لأحكام القرآن)دا دەڵێت: ﴿وَسُقُوا مَاءً حَمِيمًا﴾ واتە: ئاوێکی لەکوڵ و زۆر زۆر کوڵاویان بۆ دەهێنرێت، کە نزیك دەکرێتەوە لێیان دەموچاویان دەبرژێنێت و دەبێتە هۆی وەرینی تووك و پێستی سەریان، کاتێك دەرخواردیان دەدرێت ئاوسك و ریخۆڵەکانیان پارچە پارچە دەکات و لە کۆمیانەوە دێتە دەرەوە.

-(الطبري) دەڵێت: ئەو کەسانەی کە لە دۆزەخدا بە هەمیشەیی دەمێننەوە ئاوێکیان دەرخوارد دەدرێت کە گەیشتووەتە ئەوپەڕی گەرمیی و دەبێتە هۆی پارچە پارچە کردنی ریخۆڵەکانیان و ئاوسکیان، هەردوو زانا {الشوكاني لە تەفسیری (فتح القدير)دا و إبن كثير لە تەفسیرە بەناوبانگەکەیدا (تفسير القرآن العظيم)} هەمان تەفسیری ئەم ئایەتەیان کردووە.

موفەسیرەکان لە هۆکاری هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە پیرۆزەی یەکەمدا دەڵێن: لەپێش هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانەدا بێباوەڕەکان دەیانووت: ئێوە ئێمە بە ئاگر دەترسێنن، بەڵام کە پێست و لەشمان ئاگر خواردی و هەمووی وەك خەڵووزی لێهات ئەوا ئیتر ئازار نامێنێت و ئێمە ئیسراحەت دەکەین، چونکە ئاگر هیچ شتێکی بۆ نامێنێتەوە کە ئازاری بدات، هەر بۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتانەی نارد بۆ ئەوەی بۆیانی روون بکاتەوە کە دوای تیاچوون و نەمانی هەموو لەشیان بە

* بڕوانە: تفسير الطبري ٥/١٤٢- ١٤٣.

گشتی و پێستیان بە تایبەتی، دووبارە پێستیان نوێ دەبێتەوە بۆ ئەوەی سزا
هەمیشە بەردەوام بێت بەبێ کۆتایی.

## پێست و ئازاردانی بە ئاگر

باشە دەبێت نهێنی هەست کردن لە پێستدا چی بێت؟ چۆن ئێمە هەست ئازار و ساردیی و گەرمیی دەکەین؟ چۆن دەتوانین ئەو شتەی پەنجەی لێدەدە یەکسەر بیناسینەوە؟ چۆن ئێمە هەست بە ئازارەکانی ناو لەشمان دەکەین؟

راستی‌یە زانستی‌یەکان لەم بارەوە چەند ساڵێکی کەم دەبێت دۆزراونەتەو ئەویش لە رێی هەردوو زانستی توێکاری و زانستێکی نوێتر کە پێی دەووترێ شانەزانی (علم الانسجة Histology)، کە پاش دۆزینەوەی ووردبینە ز بەهێزەکان نهێنی‌یەکانی پێست و ژێر پێستی مرۆڤی بۆ ئاشکرا کردووین، میکانیزمی هەست کردنی لە پێستدا بۆ روون کردووینەتەوە، زانستی توێکار (Anatomy) ئەو زانستەیە کە پێکهاتە گەورە بەچاو بینراوەکانی لەشمان روون دەکاتەوە، ئەویش بە توێ کردنی ئەندامەکانی لەش و دەرخستنی پێکها وورد و جۆراوجۆرەکانی.

بەڵام شانەزانی ئەو زانستەیە کە گرنگی دەدات بە دۆزینەوەی نهێنی‌یەکا شانە و خانەکانی لەش کە بەچاو نابینرێن، واتە لەژێر ووردبین و مایکرۆسکۆ (جا ئیتر ووردبینی ئاسایی بێت یان ووردبینی ئەلیکترۆنی) و بە بەکارهێنانی ئـ ئامێرانە نهێنی و شاراوەکانی شانەکان وخانەکانی ئەندامەکان و بەشەکانی لە دۆزراونەتەوە.




پێستی مرۆڤ، چینەکانی و پێکهاتەکانی



**ڕاستی‌یە زانستی‌یەکان دەربارەی پێست:**

پێستی مرۆڤ لە دوو چینی سەرەکی شانە چینی سەرەوە یان چینی ڕوویی Epidermis، و چینی خوارەوە Dermis) و چینێکی هاوپێچ لەژێریانەوە Subcutaneous ) Layer) یان چینی (Hypodermis) پێک هاتووە.

پێستی مرۆڤ شانەکانی ناوەوەی دەپارێزێت لە ووشکبوونەوە یان لەدەست چوون و لەوتانی شلەمەنی، هەروەها لە مادە زیانبەخشەکان و لە گۆڕانکاری‌یەکانی پلەی گەرمیش.

بەشی خوارەوەی پێست ئەم پێکهاتووانەی تێدایە: ئەو ڕژێنانەی ئارەق دەردەدەن یان ئارەقە ڕژێنەکان (sweat glands)، لوولەکانی خوێن، کۆتایی‌یە دەماری‌یەکان یان هەستەوەرەکان (sensory receptors) و بنی موەکان و نینۆکەکان، بەشی سەرەوەی پێست ٨٠٪ی پێکهاتووە لە خانە

مردووەکان وخانە هەڵوەریوەکان کە لە لەش دەبنەوە، هەریەکێك لە پێکهاتووەکانم پێست بە کارێکی گرنگ هەڵدەستێت بۆ پاراستنی لەش و بارە ئاساییەکەی ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە لە پێکهاتووەکانی پێست بریتین لە کۆتاییەـ دەمارییەکان، و خانە و تەنۆلکەکانی هەستکردن لە پێستدا، کە وەك زەنگم ئاگادار کەرەوەن بۆ لەش لەمەر بارێکی نائاسایی.

هەروەك ئاماژەمان پێدا زانایان بۆیان دەرکەوتووە کە هەست کردن لە پێستد بەهۆی تۆرێکی ئاکۆتا لە کۆتاییە دەمارییەکانەوە دەبێت، کە لە کۆتاییەکانیاندا چەندین جۆر خانە و تەنۆلکە هەیە، کە هەر یەکێکیان تایبەتن ب جۆرێکی دیاری کراو لە هەست کردن، ئەمانە پێیان دەووترێت سەنتەرەکانم هەست کردن لەپێستدا.

ئەگەر بڕوانینە نەخشەی پێکهاتنی پێست دەسەلاتی گەورەی پەروەردگارما بۆ دەردەکەوێت، سەرەتا لە رەنگینی شێوەکەی (بڕوانە وێنەی خوارەوە)، کـ بۆمان روون دەکاتەوە چۆن هەستە دەمارەکان دابەشبوون لە پێستی مرۆڤدا دەبینین کە نزیکەی ١٥جۆر سەنتەری جیاواز بۆ هەموو جۆرەکانی هەستم دەماریی دۆزراونەتەوە لەلایەن پزیشکان و زانایانی توێکارییەوە، کە هەندێکیا بەناوی ئەو زانایەوە ناونراوە کە یەکەمجار دۆزیویەتەوە، شێوەی ئەم تەنۆلکان زۆر جیاواز و تایبەتین: هەندێکیان لە شێوەی سەبەتەدان، و هی تریان لە شێوەی کۆمەڵێك هێڵی یەك سەنتەردان وەك شێوەی پیاز، یان لەگەڵ کۆتاییە دەمارییەکاندا درێژ بوونەتەوە.

زانایـان هەسـت کردنیـان لەلایـەن مرۆڤـەوە بـەهۆی ئـەم تەنۆلکانـەوە دابـەش کردووە بۆ ٣ ئاست:

أ- هـەست کردنی سـەر روویـی (سطحي).

ب- هەستی قـوول.

ج- هەستی تێکەڵاو (مرکب).

هەستی سەر رووی پێست (سطحي) چوار جۆرە:

١- بەرکەوتن و پەستان.

٢- ئازار.

٣- هەستکردن بە گەرمیی.

٤- هەست کردن بە ساردیی.

هەستی قووڵیش تایبەتە بە جومگە و ماسولکەکان و بریتییە لە هەستەکانی:

- هەستکردن بە باری لەش و قبووڵ کردنی (Proprioception).

- هەروەها ئازاری قووڵی ماسولکەکان.

- هەستکردن بە لەرینەوە (Pallesthenia).

میکانیزمی هەست کردن و بەیەکەوە کارکردن لە هەردوو هەستەکەدا (روویی و قووڵی) (یان هەستی تێکەڵاو) بریتییە لە ناسینەوە و ناونانی شتە ناسراوەکان و ئەوانەی دەخرێنە ناو دەستەوە، واتە هەستی ناسینەوەی شتەکان بەدەست لێدانیان (Stereognosis).

هەروەها توانای دیاری کردنی شوێنی بەرکەوتن لەسەر پێست یان ئاگاداربوونی پێستیی، هەستی بەرکەوتنیش واتە ناسینەوەدی تەنەکان بە دەست لێدانیان، ئەم هەستەیان دەبێت تونکلی مێشك سەلامەت بێت بۆ ئەوەی بوونی هەبێت و روودات.

دابەشکردنێکی تری تایبەت هەیە بۆ جۆرەکانی هەست، ناسراوە بە دابەشکردنی دکتۆر هێد (Dr. Head's Classification) کە هەستاوە بە دابەشکردنی هەستی پێستیی بۆ دوو کۆمەڵەی سەرەکی کە ئەمانەن:

– هەستێکی وورد (إحساس دقیق **Epicritic**) کە تایبەتە بە ناسینەوەی بەرکەوتنی سووک، و جیاوازی کەم لە پلەکانی گەرمیدا.

– هەروەها هەستی سەرەتایی (إحساس أولي **Protopathic**) کە تایبەتە بە ئازار و پلەی گەرمی بەرز.







هەریەکێک لەم دوو هەستە بە شێوازێکی جیاواز لە یەکە دەمارییەکاندا کاردەکات، (دکتۆر هێد) ئەم دابەشکردنەی داناوە لەسەر بناغەی ئەو شارەزایی و تێبینییانەی هەیبوو لەسەر کرداری نوێ بوونەوەی دەمارەکان کە دوای تووشبوون بە برینداری و زەرەر روودەدات، بینی کە هەستی سەرەتایی (**Protopathic**) بە خێرایی و پاش ١٠هەفتە دەگەڕێتەوە، بەڵام هەستی وورد لەوانەیە دوای تێپەڕ بوونی زیاتر لە دوو یان سێ ساڵ بگەڕێتەوە، یان لەوانەیە هەرگیزا و هەرگیز نەگەڕێتەوە.

وەك پێشتر باسمان كرد چەند تەنۆلكەیەك و خانەی تایبەت هەیە بۆ دۆزینەوە و هەست كردن بە گۆڕانكاری‌یەكان لە ژینگەی مرۆڤدا كە پێیان دەوترێت (وەرگرەكان) یان هەست پێكەرەكان (Receptors)، كە دابەش دەكرێن بۆ ئەم بەشانە:

- ئەو خانانەی بە دەوروبەر كاریان تێدەكرێت (Extroceptors): ئەمانە تایبەتن بە هەستی بەركەوتن (واتە هەستكردن بە دەست لێدان)، و بریتین لە: تەنۆلكەكانی میسنەر (Meissner's Corpuscles) كە زۆر بڵاون، و خانەكانی مێركل (Merkles Corpuscles) كە ئەمانە زیاتر لە شوێنە بێمووەكاندا هـــەن، وەك سەرە پەنجەكان و لێوەكان.

- تەنۆلكەكانی پاسینی (Pacinian corpuscles) كە زیاتر لەو شوێنانەدان كـــە قورسی‌یان لەسەرە وەك نـاو لـەپـی دەســت و ناوەوەی پێ، شێوەیان وەك پیاز وایە و تایبەتن بە گواستنەوەی هەست بە پەستان و لەرینەوە، ئەم تەنۆلكانە هەموویان بەگشتی ژمارەیان دەگاتە زیاتر لە ٥٠٠,٠٠٠ لەسەر هەموو رووی لەش.

- خانەكانی موومكان و تەنۆلكە كۆتایی‌یەكانی كرۆز (Crause End Bulbs) و هەروەها تەنۆلكەكانی تومسا، ئەمانە تایبەتن بە هەستن كردن بە ساردیی.




Figure 1-1 Cross section of the skin

- قووچەکەکان یان لوولەکانی رووفینی (Ruffini's Cylinders): کە تایبەتن بە هەست کردن بە گەرمیی، ژمارەی ئەم تەنۆلکانەش دەگاتە زیاتر لە (٢٠٠٠٠٠) لە هەموو رووی لەشدا.

-تەنۆلکەکانی گۆلجی (Golgi Corpuscles): کە لەناو جومگە و ماسولکە و گورزە بەستەرەکان (الأوتار)دا هەن و هەستە قوولەکان دەگوێزنەوە.

-کۆتاییە دەمارییە هەستییەکان یان کۆتاییە دەمارییە بەرەڵاکان (کە تۆڕێکی ئاڵۆز پێک دەهێنن و پێیان دەووترێت تۆڕی لانگەرهانس Langerhans): بۆ هەست کردنە بە ئازار، ئەم کۆتاییە دەمارییانە زۆر بەربڵاو وزۆرن لەسەر رووی پێست، کە بینراوە ژمارەیان دەگاتە (٣-٥ ملیۆن) لە هەموو رووبەری پێستدا.




لێرەوە دەتوانین بڵێین کە پێستی مرۆڤ بریتییە لە رووپۆشێک کە تۆڕێکی ناکۆتا لە ریشاڵ و کۆتاییە دەمارییەکان دادەپۆشێت، و پێستی مرۆڤ نەخشە و خەریتەیەکی سەرسوڕهێنەرە لە یەکتر بڕینی ئەو دەمارانەی کە کۆنتڕۆڵی دەکەن، ئەوەتا ٦٢ دەمار کۆنتڕۆڵی هەموو لەش دەکەن (بێجگە لە دەمارە مێشکییەکان)، و هەستەکانیان لێوە کۆدەکەنەوە و بۆ مێشکی دەگوێزنەوە.

لە مێشکیش خۆیەوە راستەوخۆ ١٤ دەمار دەردەچن کە دەمارە مێشکی (یان سەری‌یەکانن)، کەواتە کۆی گشتی ٧٦ دەمارن کە کۆنترۆڵی رووبەرەکانی هەست دەکەن لە لەشی مرۆڤدا.



له لایەکی ترەوە زانستی توێکاری سەلماندوویەتی کە کۆتاییە دەمارییەکا و ریشاڵە دەمارییەکانی تایبەت بە گواستنەوەی ئازار و هەست بە گەرمیی زۆ لەیەکەوە نزیکن، هەروەها بۆشی روون کردووینەتەوە کە ئەو رێگەیەی کە دەیبڕ بۆ سەرەوە هەمان رێگەیە، ئەم دەمارانە لە پێستەوە دەڕۆن تا دەگەنە درکە پەتکی ناو برِبڕەی پشت (النخاع الشوكي Spinal Cord)، و لەوێوە بۆ مێشکۆک (المخيخ Cerebellum)، و پاشان بۆ مێشکی ناوەڕاست یان ناوەندە مێشک (الدماغ المتوسط Mid Brain)، و لە کۆتاییدا بۆ بەرزییەکانی پلی لا تەنیشت لە توێکڵی مێشکدا (Gyrus of the Parietal Lobe)، لەمانەی سەرەو بۆمان دەردەکەوێت کە پێست گرنگترین بەشی لەشە بۆ هەست کردن بە ئازار و گەرمیی، لەبەرئەوەی کە زۆر دەوڵەمەندە بەو کۆتاییە دەمارییانەی کە هەستەکانی ئازار و گەرمیی دەگوێزنەوە.

## هەست کردن بە گەرمیی و ساردیی:

بەهۆی ئەو تەنۆلکانەی کە هەستەکانی ساردیی و گەرمیی دەگوێزنەوە هاوسەنگیی لە پلەی گەرمیی لەشدا روودەدات، کە لە پلەیەکی دیاری کراود دەمێنێتەوە (کە بە ناوەندیی بریتییە لە ٣٧ پلەی سەدی)، ئەگەر بێتو پلەی گەرمی لەش دابەزێت بۆ ٢٥ پلەی سەدی ئەوا سەرەتا ئەو تەنۆلکانەی هەستیارن بۆ ساردیی هاوار و ئاماژەی مەترسی دەنێرن، و مێشکی مرۆڤ و لەم بارە ئاگادار دەکەن، ئەگەر ئەم باری ساردبوونەوەیە بەردەوام بێت و هاوارەکان وەڵامی نەبێت ئەوا وورده وورده لەش دەچێتە حاڵەتێکی سڕبوون و نەمانی هەستەوە.

هەر بۆیە جۆرێك لەو رێگایانەی بۆ سڕکردنی نەخۆش لەکاتی نەشتەرگەریدا بەکاردێت بریتییە لە سارد کردنەوە، بە تایبەتی لەکاتی نەشتەرگەریدا لەسەر دڵ، کە بینراوە بەم رێگەیە دڵەکە لە خوێن ووشك دەبێتەوە و خوێن بەربوون تەواو کەم دەبێتەوە، لەلایەکی ترەوە ئەگەر پلەی گەرمی لەش و پێست بەرزبێتەوە لە ئاستی ئاسایی خۆی بە هۆی رووبەڕوو بوونی مرۆڤ بۆ سەرچاوەیەکی گەرمی یان ئاگر، سەرەتا مرۆڤ هەست بە ناڕەحەتی دەکات، پاشان ئازار پەیدا دەبێت کە

وورده وورده زیاد دەکات تا دەگاتە ئەوپەڕی و بەرزترین پلەی ئازار، کە بینراوە ناڕەحەتترین ئازار لەکاتی سووتانە روویی (سەطحی)یەکاندا دەبێت، بە زیاد بوونی پلەی سووتانەکە ئازارەکەی وورده وورده دەوەستێت لەو ئاستەدا و زیاتر نابێت، بەڵکو بە هێواشی بەرەو نەمان دەڕوات، تەنانەت ئەگەر هەموو پێستیش بسووتێت و ببێت بە خەڵووز ئیتر ئازار نامێنێت.

## پلەکانی سووتانی پێست و جۆرەکانی:

ئەگەر پلەکانی سووتان باس بکەین کە مرۆڤ تووشی دەبێت، زانایان و پزیشکان دابەشی دەکەن بۆ چوار پلەی سەرەکی، ئەم پلانە بەپێی ئەو چینانەی پێست کە دەسووتێت دیاری دەکرێت و تا سووتانەکە قووڵتر بێت پلەی سووتانەکە زیاد دەکات.

کەواتە چوار پلە بۆ سووتانی پێست دانراوە، ئەگەر سەیری پێستی مرۆڤ بکەین لەکاتی هەر یەکێك لەم سووتانانەدا، دەبینین لە سووتانی پلە یەکدا تەنها چینە ووشکەکەی بەشی سەرەوەی پێست دەگرێتەوە و لەسەر شێوەی هەوکردنێکی پێست دەردەکەوێت، لەم سووتانەدا هەڵئاوسان و ئازارێکی کەم روودەدات لەبەرئەوەی سووتانەکە پلە یەکە و تەنها خانەکانی رووی دەرەوەی پێست دەگرێتەوە، ئەوەش ئاشکرایە کە ئەم سوور بوونەوە و هەڵئاوسان و ئازارە دوای دوو تا سێ رۆژ نامێنێت.

ئەگەر یەکسەر باسی سووتانی پلە سێ بکەین دەبینین کە هەموو چینەکانی پێست دەگرێتەوە و لەوانەیە شانەکانی ژێرەوەش وەك ماسولکە و ئێسکیش بگرێتەوە، لێرەدا پێست نەرمی و لاستیکیی لە دەست دەدات و ووشك و ڕەق دەبێت، لەم حاڵەتەدا نەخۆشەکە زۆر هەست بە ئازار ناکات لەبەرئەوەی کۆتایییە دەمارییەکان و تەنۆلکەکانی هەست کردن زوربەیان لەناو چوون بەهۆی سووتانەوە.

ئەگەر بچینە سەر پلەی چوارەمی سووتان، ئەم پلەیە پێی دەووترێت بوون بەخەڵوز (التفحم)، کە هەروەك لە ناوەکەیەوە دیارە پێستی مرۆڤ وەك خەڵوزی

ڵدێت، لەم حاڵەتەشدا نەخۆش هەست بەهیچ ئازار و هەستێکی تر ناکات لەم بەشەی پێستیدا لەبەر ئەوەی هەموو تەنۆلکەکان و کۆتاییەیە دەمارەکان بە تەواوەتی لەناوچوون.

ئێستاش با بگەڕێینەوە بۆ سووتان لە جۆری پلەی دووەم، ئەم پلەیە دەکرێت بە دوو بەشەوە: ١- روویی (سطحي). ٢- قووڵ.

لە حاڵەتی سووتانی روویی پلە دوودا چینی سەرەوەی پێست (رووی پێست دەکولێت(تنضج) و هەروەها چینی ژێرەوەش (ناوەوەی پێست) کە لەژێر چینی سەرەوەدایە، لەم حاڵەتەدا هەردوو چینەکەی پێست لەیەك جیادەبنەوە و چەندین دەردراو و پالاوتە لە نێوانیاندا کۆدەبنەوە، لەژێر چینی سەرەوەدا بلق دروست دەبن، کە پڕن لە شلەیەك کە لە شلەمەنی یان پلازمای خوێن دەچێت، نەخۆشەکە لەم جۆرە سووتانەدا ئازارێکی یەکجار زۆر دەچێژێت و دەتلێتەوە پێیەوە و هەروەها هەستیاریشی بۆ ئازار زۆر زۆر دەبێت، ئەمانەش بەهۆی هەژانی کۆتاییەیە دەمارییە دەرکەوتووەکانەوە دەبێت، لێرەدا چاکبوونەوە و یەکبوونەوەی پێست زیاتر لە دوو هەفتە دەخایەنێت بەهۆی ئەو کرداری نوێ بوونەوە و جێگرتنەوەیەی شانە فەوتاوەکان کە لە پێستدا روودەدات.



هەروەك چۆن بێباوەڕان لە دۆزەخدا تووشی سزای ئاگر دەبن لەرووی دەرەوەی لەشیان و لەڕێی پێستیان، بە هەمان شێوە تووشی سزایەکی ناوەکیش دەبن کە لە جۆرێکی ترە، ئەویش لەڕێی دەرخواردانیان بە ئاوێکی ئەوەندە کوڵاو کە ئەویش وەك ئاگر وایە*، کاتێك کە لێیان نزیك دەکرێتەوە دەم وچاویان دەبرژێنێت و پێستی سەریان هەڵدەوەرێنێت و کە دەیخۆنەوە ناوسك و ریخۆڵەکانیان پارچە پارچە دەکات و لە کۆمیانەوە دێتە دەرێ، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَسُقُوا مَاءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءَهُمْ﴾ (محمد١٥).

زانستی توێکاری و شانەزانی بۆیان روون کردووینەتەوە کە ریخۆڵە باریکە درێژترین بەشی کۆئەندامی هەرسی مرۆڤە (درێژییەکەی دەگاتە نزیکەی ٦مەتر)، دیوارەکەی لە سێ چین پێکدێت:

١- چینی دەرەوە: یان چینی رژێندار، کە بریتییە لە رووپۆشێکی تەنکی شێدار بەهۆی ئەو دەردراوانەی دەری دەدات.

٢- چینی ناوەڕاست: یان چینی ماسولکەیی، کە ئەمیش لە دوو چینی تر پێك دێت، چینێکی ماسولکەیی درێژ کە لە دەرەوەیە، و چینێکی ماسولکەیی تر کە بازنەیی‌یە و لە ناوەوەیە.

٣- چینی ناوەوە: یان چینی ناوپۆش، کە لە پەڕەیەکی خانە و ماسولکەیی و هەروەها شانەی ژێر ئەم ناوپۆشە پێکدێت، رووی ناوەوەی ئەم ناوپۆشە چرچ و لۆچاوی‌یە و لە خانەی درێژی (توکدار یان) میمیلەدار ( Ciliated Columnar Epithelium) پێکهاتووە (بڕوانە وێنەی لاپەڕەی داهاتوو)، لە ناو ئەم ناوپۆشەدا رژێنی ریخۆڵەیی و توورەکەی لیمفاوی هەیە، دەبینین لەم پێکهاتە پڕ ووردەکاری‌یە خودایی‌یەدا ریخۆڵەکان خۆیان لە ناوەوە پارێزراون لەو

---

* ماء حميم: بمعنى ماء حار شديد الغليان.

کارتێکەرانەی کە بەناوی‌دا دەڕۆن و زیانی پێناگەیەنن، بەڵام لەوانەیە ئازار دروست بکەن وەك ئازاری گەرمیی.




بۆشایی ناوسکی مرۆڤ بە گشتی ناوپۆش کراوە بە پەردەیەك کە ناسراوە بە پریتۆن (Peritoneum)، کە قەبارەکەی دەگاتە (۲۰٤۰۰ سم سێجا) و یەکسانە بە هەمان قەبارەی پێستی دەرەوەی مرۆڤ، ئەم پریتۆنەش لە دوو بەش پێکهاتووە: بەشێکیان ناوپۆشی هەموو دیواری ناوسکی کردووە و ناسراوە بە پریتۆنی دیواری یان دەرەوە (Parietal Peritoneum)، بەشەکی تریش ئەندامەکانی ناوسکی داپۆشیوە و ناسراوە بە پریتۆنی ناوەوە (Visceral Peritoneum)، پریتۆنی دیواری زۆر هەستیارە چونکە پڕە لە تەنۆلکەکانی هەست کردن بە ئازار و کۆتایی‌یە دەمارەکان، کاتێك کە دەهەژێنرێت ئازارێکی زۆر قورس و بەهێز دروست دەکات.

به پێچەوانەوە پریتۆنی ناوەوە زۆر کەمتر ئەم کۆتاییی‌یە دەماری‌یانەی تێدایە و کە دەهەژێنرێت ئازارێکی نەناسراو دروست دەکات، لە نێوان پریتۆنی دیواری و پەردە رووپۆشەکەی ریخۆڵەکاندا پێکهاتوویەکی پەردەیی ناوپۆشیی تر هەیە کە پێی دەووترێت مێزەنتری (المساريقا Mesentery) کە لە ناویدا ژمارەیەکی زۆر لە تەنۆلکەکانی پاسینی (Pacinian corpuscles)ی هەستیاریان تێدایە، ئەم مێزەنتری‌یە لە پەرەیەکی دوو توێ پێکهاتووە کە بە نێوانیاندا دەمارەکان و لوولەکانی خوێن و لیمف دەڕوات.

وەرگرەکانی ئازار (Pain Receptors) و یەکە هەستی‌یەکان کە تەنیا لە پریتۆنی ناوپۆشی هەناودا هەیە، (بە تایبەتی پریتۆنی دیواری)، هەمان ئەوانەن کە لە پێستدا هەن بەڵام لەگەڵ جیاوازی لە دابەش بوونیاندا، بە تایبەتی یەکەکانی هەستیار بۆ ئازار و گەرمیی لە پریتۆنی دیواری‌دا، هەر بۆیە کاتێك کە دیواری سك سڕدەکرێت بە بەنجێکی مەوزیعی و سك دەکرێتەوە، ئەگەر ریخۆڵەکان دەربهێنین یان تەنانەت پارچە پارچەیان بکەین یان بیانسووتێنین ئەو کەسە هیچ ئازارێك یان هەست بە ناڕەحەتی ناکات، چونکە وەك باسمان کرد هەستەوەرەکان بۆ ئازار لەناو ئەندامەکانی سکدانین.

بەڵام کاتێك کە ریخۆڵەکان پارچە پارچە دەبن بە هۆی خواردنەوەی ئاوی لەکوڵ یان ئاوی (حەمیم)، ئەم ئاوە زۆر گەرمە لە ریخۆڵەکانەوە دەگاتە بۆشایی ناوسك و پاشان پریتۆن و مێزەنتری کە دەوڵەمەندن بە کۆتاییی‌یە دەماری‌یە هەستەوەرەکان بۆ ئازار و دەبنە هۆی ئاگادار کردنەوەیان، و دروست کردنی سکنێشە و ئازارێکی ئێجگار زۆر، کە ئەو کەسە پێوەی دەتلێتەوە، لێرەدا ئازاری ئەو ئاوە داخبووە دەگاتە ئەوپەڕی.

## رووەکانی ئیعجازی ئایەتەکان:

١- خوای گەورە بۆی روون کردووینەتەوە کە پێست شوێنی هەست کردنە بە ئازار ئەویش بەوەی پەروەردگار پێستی بەستووەتەوە بە هەستکردن بە ئازارەوە لە ئایەتی: ﴿كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ﴾، لێرەوە

رووندەبێتەوە کە پێست بریتی‌یە لە هۆکاری هەست کردن بە ئازار بۆ بێباوەڕان لە دۆزەخـدا، و کاتێـك کـە پێسـتیان دەبرژێـت و دەسـووتێت و پێکهاتنەکـەی و ئەرکەکەی لەدەست دەدات، سەرەنجام هەست کردن بە ئازار نامێنێت.

هەر بۆیە خوای گەورە ئەم پێستە فەوتاوەیان بۆ دەگۆڕێت بە پێستێکی نوێ لە پێکهاتن و ئەرکەکانیدا، کە کۆتایی‌یە دەماری‌یەکانی (کە تایبەتن بە هەستی ئازار و گەرمیی) ئەم پێستە نوێ‌یە هەڵدەستن بە ئەرکەکانیان لە دروست کردنی ئەم ئازارە جەرگ بڕانەدا، ئەمەش هەمووی بۆ ئەوەیە کە ئەو بێباوەڕانە بەردەوام بن لە ئازار چەشتندا.

هەروەها زانستی نوێش بۆی روون کردووینەتەوە کە کۆتایی‌یە دەماری‌یەکان و تەنۆلکەکانی تایبەت بە هەست کردن بە ئازاری گەرمی و سووتان تەنیا لە پێستدا بە شێوەیەکی چڕ کۆبوونەتەوە.

هیچ مرۆڤێك نەیدەتوانی پێش دۆزینەوەی وورد‌بین و پێشکەوتنی زانستی توێکاری لە پێش ١٤سەدە لەمەوبەر ئەم راستی‌یانە بزانێت، لێرەوە موعجیزەکە ئاشکرا دەبێت و بەڵگەکانی پەروەردگار دەردەکەون بەرووونی.

٢- قورئانی پیرۆز هەڕەشە لە کافران دەکات بە سزادانیان بە ئاوی (حەمیم) بەوەی کە ناوسك و ریخۆڵەکانیان پارچە پارچە دەکات، نهێنی ئەم هەڕەشەیە لەم دوایی‌یانەدا روون بۆتەوە بە دۆزینەوەی ئەوەی کە ریخۆڵەکان هەست بە گەرمی ناکەن، بەڵام کاتێك کە پارچە دەبن ئاوە کوڵاوەکە دەڕژێتە ناوسك و بەر پریتۆنی دیواری دەکەوێت کە زۆر هەستیارە بۆ ئازاری گەرمیی و سووتان و دەبێتە هۆی دروست بوونی بەرزترین پلەی ئازار و بەردەوام بوونی، بەڵام لە پێستدا بەم شێوەیە نی‌یە چونکە بەردەوام بوونی هەست بە ئازار بەندە بە نوێ بوونەوەی پێست دوای برژان و لەناوچوونی.

جیاوازی ئەو وەسفەی کە قورئان کردوێتی بۆ دروستبوونی ئازار بە ئاگر، کە لە دەرەوە بەهۆی گۆڕین و نوێ بوونەوەی پێست دوای برژانی و لە ناوەوە بە پارچە پارچە کردنی ریخۆڵەکان بە ئاوی کوڵاو زۆر گونجاوە و لە شوێنی

خۆی‌دایە، و بە تەواوەتی یەکدەگرێتەوە لەگەڵ ڕاستی‌یە زانستی‌یە دۆزراوەکانی ئەم دوو بوارە لەمڕۆدا، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە قورئان ووتەی ئەو خودا زانا و بەدەسەڵاتەیە کە هەموو نهێنی‌یەکان و ووردەکاری‌یەکانی دروست بوونی مرۆڤ دەزانێت، چونکە هەر ئەوە کە بەدیهێنەری ئەو مرۆڤەیە.

لێرەدا بە تەواوەتی ئیعجازی زانستیی قورئان لە باس کردنی هەست کردن بە ئازار بە پشتیوانی ڕاستی‌یە زانستی‌یە پزیشکی‌یەکان ئاشکرا دەبێت و وەك خۆر دەدرەوشێتەوە.

## هۆی موسوڵمان بوونی پزیشکێك:

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بابەتەکانی ئیعجازی زانستی ئاشکرا دەبن و ڕۆڵی گەورەی خۆیان دەبینن لە هیدایەت و ڕێنومایی مرۆڤەکان بۆ لای ڕۆشنایی پەیامە پیرۆزەکەی خودایی، دەرکەوتنی ئەم ئیعجازانە یەکێکە لە گەورەترین هۆکارەکانی هیدایەت کە خودای گەورە لەناو کتێبە پیرۆزەکەی‌دا هەڵیگرتووە، یەکێك لەو کەسانەی کە دانی بە ڕاستی‌دا نا و ڕێگەی هیدایەتی وەرگرت کاتێك کە ڕاستی‌یەکانی قورئانی بۆ دەرکەوت بریتی بوو لە (پرۆفیسۆر دکتۆر تاجاتات تاجاسون) کە خەڵکی وولاتی تایلەندە و ڕاگری کۆلیژی پزیشکی زانکۆی (شاینج مای)ە لە تایلەند وخۆیشی پرۆفیسۆری زانستی توێکاری‌یە، لەسەر بیروباوەڕ و دیانەتی بووزی بووە (بینراوە کە خەڵکانی بووزی زۆر بە زەحمەت لەسەر ئەم بیروباوەڕەی خۆیان لادەچن و باوەڕی تر وەردەگرن).

گەشتی وەرگرتنی هیدایەت لە لایەن پرۆفیسۆر تاجاسون ماوەی ٢ساڵی خایاند، سەرەتا زانای موسوڵمان پرۆفیسۆر (عبدالمجید الزندانی) گفتوگۆیەکی لەگەڵ سازکرد کە تێیدا چەند ئایەتێکی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەری لە بواری پسپۆڕی خۆیدا کە توێکاری و کۆرپەلەزانی‌یە بۆ باس کرد، ئەوەبوو ئەو بابەتەی زۆر بەدڵ بوو و سەرنجی ڕاکێشا، بەڵام لە کۆتایی‌دا ووتی: ئێمەش لە کتێبەکانی دینی بووزی‌دا وەسفی قۆناغەکانی کۆرپەلە کراوە، ئەوەبوو (زیندانی) پێی ووت منیش پێم خۆشە کە ئەو زانیاری‌یانەم بۆ بێنیت و ئاگام لێ بێت.

دوای سالێك كه یه‌كتری‌یان بینی‌یه‌وه له یه‌كێك له كۆنگره زانستی‌یه‌كاندا ئه‌وه‌بوو (زیندانی) لێی پرسی: سه‌باره‌ت به‌و زانیاری‌یانه‌ی كه ووتت له كتێبه‌كانی دینی بووزی‌دا هه‌یه، پێم خۆشه بۆم باس بكه‌یت، پرۆفیسۆر تاجاسون وه‌لامی دایه‌وه: من داوای لێبووردنت لێده‌كه‌م سه‌باره‌ت به‌و شتانه‌ی بیستبووم چونكه من ئه‌وه‌م پێوتیت پێش ئه‌وه‌ی دڵنیا ببم له راستی‌یان، به‌لام كه گه‌رامه‌وه بۆ كتێبه بووزی‌یه‌كان هیچ جۆره ئاماژه‌یه‌كم له‌و باره‌وه تێدا نه‌بینی، زیندانی ده‌ڵێت: پاشان موحازه‌ره‌یه‌كم بۆ باس كرد كه له‌لایه‌ن (دكتۆر كیث مور)ه‌وه ئاماده‌كرابوو كه مامۆستای توێكاری‌یه له چه‌ند زانكۆیه‌كی كه‌نه‌دا، ناونیشانی موحازه‌ره‌كه بریتی بوو له (مطابقة علم الأجنة لما في القرآن و السنة)، واته: یه‌كبوون و چوونیه‌كی كۆرپه‌له‌زانی له‌گه‌ڵ راستی‌یه‌كانی قورئان و سوننه‌تدا.

دوایی لێم پرسی تۆ پرۆفیسۆر (مور) ده‌ناسی؟ ئه‌ویش ووتی: به‌ڵێ، یه‌كێكه له گه‌وره زانایان و سه‌رچاوه‌یه‌ك له‌م بواره‌دا، و من زۆر سه‌رم سوڕماوه له‌وه‌ی له‌م موحازه‌ره‌یه‌دا كۆی كردۆته‌وه، پاشان زیندانی هه‌ندێك پرسیاری لێده‌كات له بواری پسپۆڕی خۆی‌دا كه توێكاری‌یه، یه‌كێك له‌و پرسیارانه له‌باره‌ی پێسته‌وه بوو: كه ئایا قۆناغێك هه‌یه كه هه‌ست كردن به ئازاری سووتان تێیدا نامێنێت؟ پرۆفیسۆر تاجاسون وه‌لام دایه‌وه: به‌ڵێ، ئه‌گه‌ر سووتانه‌كه قووڵ بێت و پێكهاتووه‌كانی هه‌ست كردن به ئازاری له‌ناو بردبێت، زیندانی ووتی: باشه تۆ رات چۆنه ئه‌و قورئانه‌ی بۆ محمد (ﷺ) هاتووه پێش ١٤٠٠ساڵ ئاماژه‌ی بۆ ئه‌و راستی‌یه كردووه، ئه‌ویش له باسیدا ده‌رباره‌ی شێوازی سزای بێباوه‌ڕان له دۆزه‌خدا كه ده‌فه‌رموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُواْ الْعَذَابَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾.

لێره‌دا قورئان بڕیاری ئه‌وه ده‌دات كه كاتێك بێباوه‌ڕان پێسته‌كانیان ده‌برژێت و له‌ناوده‌چێت خوای گه‌وره پێستێكی نوێیان بۆ دروست ده‌كات بۆ ئه‌وه‌ی كه ئازاره‌كانیان بۆ نوێ ببێته‌وه، ئه‌مه‌ش ئاماژه‌یه‌كی قورئانی‌یه كه كۆتایی‌یه ده‌ماری‌یه‌كانی هه‌سته‌وه‌ر بۆ ئازار ده‌كه‌ونه پێسته‌وه، پرۆفیسۆر تاجاسون ووتی:

بەڕاستی ئەمە بابەتێکی سەیر و سەرسوڕهێنەرە، چونکە ئەمە زانیاری‌یەکی زۆر کۆنە لەبارەی سەنتەرەکانی هەستکردن لە پێستدا، و نازانم چۆن قورئانەکەی ئێوە ئەم بابەتەی باس کردووە؟!

لێرەدا زیندانی لێی پرسی: دەبێت ئەم زانیاری‌یانە پێغەمبەری ئیسلام محمد لەو کاتەدا لە سەرچاوەیەکی مرۆیی‌یەوە وەری گرتبێت؟ ئەویش ووتی: بێگومان نەخێر، چونکە لەو کاتەدا هیچ جۆرە زانیاری‌یەکی مرۆیی لەو بارەیەوە نەبووە، زیندانی: باشە لە کوێوە و چۆن ئەمانەی زانی؟ تاجاسون: من دڵنیام لەوەی کە سەرچاوەیەکی مرۆیی نەبووە، بەڵام من لێتان دەپرسم: محمد لە کوێوە ئەم زانیاری‌یە ووردانەی زانیوە؟ زیندانی: لە لایەن خوداوە.

تاجاسون: خودا!! خودا کێ‌یە؟؟ زیندانی دەڵێت: پاشان هەستاین بە ڕوونکردنەوەی بیروبۆچوونی ئیسلام دەربارەی خودا و سیفاتە بەرزەکانی، ئەوەبوو زۆری بەدڵ بوو، کە گەڕایەوە بۆ وولاتی خۆی چەندین کۆڕی لەوێ پێشکەش کرد بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم دیاردە قورئانی‌یە بۆ قوتابیانی خۆی کە زۆر پێی کاریگەربوو بوو.

دوای تێپەڕبوونی ساڵێکی تر دیسان زیندانی و پرۆفیسۆر تاجاسون بۆ جارێکی تر یەکتری‌یان بینی‌یەوە، ئەمجارە لە کۆنگرەیەکی جیهانی تایبەتدا دەربارەی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا، کە بە درێژی ٤ ڕۆژ لە هۆڵەکانی کۆنگرەکەدا پرۆفیسۆر تاجاسون گوێی گرت بۆ چەندین موحازەرە دەربارەی بابەتەکانی ئیعجازی زانستی، کە زۆرێك لەو موحازەرانە لەلایەن زانای ناموسوڵمانەوە دەدران دەربارەی دیاردەی ئیعجازی زانستی لە فەرموودەکانی قورئان و سوننەتدا، ئەوەبوو لە ڕۆژی کۆتایی کۆنگرەکەدا پرۆفیسۆر تاجاسون چووە سەر شانۆی هۆڵی کۆنگرەکە و ئاشکرای کرد: لەدوای ئەم گەشتە خۆش و سەرنج ڕاکێشە، من باوەڕی تەواوم هەیە بەوەی کە هەرچی لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە دەتوانرێت ڕاستی‌یەکەی بسەلمێنرێت بە هۆکارە زانستی‌یەکان، و لەبەر ئەوەی کە محمد پێغەمبەری ئیسلام نەخوێندەوار بووە دەبێت ئەم زانیاری‌یانەی




لەرێی نیگا و وەحی یەوە لەلایەن دروست کەرێکی زانا بە هەموو شتێکەوە پێ گەیشتبێت، من لێرەدا ئاشکرای دەکەم و باوەڕی تەواوم هەیە کە کاتی ئەوە هاتووە بڵێم: أشهد أن لا إلـه إلاّ الله و أشهد أن محمداً رسول الله.

ئەمە زانایەکی سەرراست و راستەقینە بوو چونکە کە راستی یەکانی بۆ روون بووەوە بەبێ گوێدانە هیچ شتێك و بێ هیچ خۆبەزل زانینێك دانی بەو راستی یانەدا نا، و بەمەشەوە نەوەستا بەڵکو باوەڕی تەواوی پێ هێنا و چووە سەر راستە رێگای پەیامەکەی ﴿وَيَرَى الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ الَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ الْحَقَّ وَيَهْدِي إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ (سورةسبا:٦).

  

**سەرچاوەکان:**

١-تەفسیرەکانی: الطبري، الزمخشري (الكَشّاف)، القرطبي (الجامع لأحكام القرآن)
إبن كثير (تفسير القرآن العظيم)، لەگەڵ الشوكاني(فتح القدير).
٢-كتێبی: الإعجاز العلمي في الإرتفاعات العالية والإحساس بالألم: دەرکراوی
(الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنة).
٣-گۆڤاری: (الإعجاز)/ ژمارە ٢ی ساڵی (١٤١٧ك - ١٩٩٦ز)/ دەرکراوی: (هيئة
الإعجاز العلمي في القرآن والسنة).
٤-الطب محراب للإيمان (١-٢): د.خالص جلبي كنجو.
٥-ئینتەرنێت: www.tasabeeh.com

**5- Bailey & Love's: Short Practice of Surgery, 21st Edition, 1991, Chapman & Hall, UK.**

**6- Andrews' Diseases of the skin, 1982, W.B. Saunders, USA.**

**7- Encyclopedia Britannica - 2006.**




# تووڕەبوون
# زیانەکان و چارەسەری
# لە سوننەتدا

- له فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە: ﴿عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رجلاً قال للنبي (ﷺ): أوصِني، قال: لا تغضب، فردد مراراً، قال: لا تغضب﴾ رواه البخاري، واتە: جارێك پیاوێك بە پێغەمبەری ووت: ئامۆژگاریم بکە، ئەویش فەرمووی: تووڕە مەبە، چەند جارێك ئەم پیاوە پرسیارەکەی دووبارە کردەوە لە پێغەمبەر، ئەویش هەر هەمان وەڵامی دەدایەوە و دەیووت: تووڕە مەبە.




**Limbic System**
The limbic system is a group of brain structures that play a role in emotion, memory, and motivation. For example, electrical stimulation of the amygdala in laboratory animals can provoke fear, anger, and aggression. The hypothalamus regulates hunger, thirst, sleep, body temperature, sexual drive, and other functions.

له رووی زانستی‌یەوە سەلماوە کە تووڕەبوون وەك جۆرێك لە جۆرەکانی کارتێکەرە دەروونی‌یەکان، بە شێوەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ کاریگەریی هەیە، ڕاستەوخۆ کاردەکاتە سەر ماسولکەکانی دڵ، وەك چۆن وەرزشی ڕاکردن کاری تێدەکات، هەڵچوونی تووڕەبوون دەبێتە هۆی زیاتر لێدانی دڵ لە خولەکێکدا و وای لێدەکات کە ڕێژەی ئەو خوێنەی دەینێرێت بە خوێنبەرەکاندا زیاتر ببێت لەگەڵ هەر یەکێك لەم لێدان و گرژبوونانەدا، ئەمە دەبێتەهۆی هیلاك کردنی دڵ چونکە زۆر لێکردنێتی بۆ ئەنجامدانی کاری زیادە لەوەی کە خۆی ئاسایی پێی هەڵدەستێت، تەنانەت تووڕەبوون بە بەراورد لەگەڵ ڕاکردندا خراپترە چونکە مرۆڤی ڕاکەر دەتوانێت بوەستێت ئەگەر بیەوێت و ئەم هیلاك کردنەی دڵ کۆتایی پێدەهێنێت، بەڵام مرۆڤی تووڕە ناتوانێت کۆنترۆڵی ئەم هەستەی بکات تەنانەت لەو کەسانەشدا کە دەتوانن کۆنترۆڵی هەستەکانیان بکەن.

بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بینراوە کە تووڕەبوون دەبێتە هۆی زیاتر ڕژاندنی هۆرمۆنی ئەدرینالین (Adrenaline) لە هەردوو کوێرە ڕژێنەکەی سەر گورچیلەکانەوە (Adrenal Glands).

لە کاتی تووڕەبووندا چەند سەنتەرێکی تایبەت لە مێشکدا چالاک دەبن بە تایبەتی سەنتەری هاندانی بەشی ناوەوەی (مۆخی) ڕژێنی سەر گورچیلە (Adrenal Medulla)، کە یەکێکە لە سەنتەرەکانی (کۆئەندامی دەماریی خۆنەویستی هەستیی یان بەسۆز Sympathetic Nervous System) لە مێشکدا و ئەم سەنتەرەش ئاماژە دەنێرێت بۆ ڕژێنەکانی سەر گورچیلە بۆ ڕژاندنی زیاتری ئەدرینالین.

هۆرمۆنی ئەدرینالین کاریگەریی هەیە لەسەر ماسولکەکانی دڵ و دەبێتە هۆی کشانیان و زیاد بوونی هێزی گرژبوونیان، ئەمە دەبێتەهۆی لێدانی دڵ بەشێوەیەکی بەهێزتر و هەست کردن بەم لێدانەی لەلایەن ئەو کەسەوە، (لە باری ئاساییدا مرۆڤ هەست بەلێدانی دڵی خۆی ناکات).

هەروەها بینراوە کە ڕژاندنی ئەم هۆرمۆنە و کاریگەرییەکانی لە حاڵەتە دەروونییەکانی تری وەك: ترسی زۆر و شڵەژانیشدا ڕوودەدات.

{لێرەدا سەرنجی خوێنەری بەڕێز ڕادەکێشم بۆ ئایەتێکی قورئانی پیرۆز کە ئاماژەیەکی سەرسوڕهێنەری تێدایە لەم بوارەدا، خوای گەورە لە سوورەتی (الأحزاب)دا دەفەرموێت: ﴿إِذْ جَاؤُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتْ الْأَبْصَارُ وَبَلَغَتِ الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِاللَّهِ الظُّنُونَا(١٠) هُنَالِكَ ابْتُلِيَ الْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا زِلْزَالًا شَدِيدًا(١١)﴾، واتە: کاتێك کە بێباوەڕەکان بۆتان هاتن لە شەڕی (خەندەق)دا لە هەموو لایەکەوە، ترس رووی کردبووە ئیمانداران بە شێوەیەك کە چاویان تەرکیزی نەمابوو و لێدانی دڵیان ئەوەندە بەهێز بووبوو کە گەیشتبووە لای ملیان، بەڕاستی ئاماژەیەکی سەرسوڕهێنەرە؟!

چونکە لە ڕووی زانستی فیسیۆلۆژییەوە سەلماوە کە لە کاتی ترسی زۆردا ئەوەندە ماددەی ئەدرینالین بەڕێژەیەکی زۆر دەڕێژرێت کە لێدانی دڵ بە شێوەیەك بەهێز دەکات کە تا لامل مرۆڤ هەستی پێدەکات}.

هەروەها ئەم هۆرمۆنی ئەدرینالینە بینراوە کە چەندین کاریگەریی تری هەیە لەوانە: گرژتر کردنی ماسولکەکان و لەرزینی لەش بەگشتی، کەمبوونەوەی ئاگاداری و تەرکیزی ئەو کەسە کە دەبێتە هۆی ئەوەی چاوی رەشکەوپێشکە بکات، کشانی لوولە خوێنەکانی ژێر پێست و گەرمبوونی پێستی لەش.

بینراوە ئەو مرۆڤەی کە فێرە بە تووڕەبوون لە دوا رۆژدا تووشی بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن لە ئاستی ئاسایی خۆی دەبێت، چونکە دڵی بەردەوام زۆری لێدەکرێت بە ناردنی رێژەیەکی زیاتر لە خوێن بەناو لوولەکانی خوێنیدا و هەروەها بینراوە کە لوولە ووردەکانی خوێنی ئەو کەسانە تووشی رەقبوون و تەسک بوونەوە دەبن، و لاستیکیی دیوارەکانیان لەدەست دەدەن بۆ ئەوەی رێبدەن بە تێپەڕبوونی ئەو رێژە زیادەیەی خوێن کە ئەو دڵە کارتێکراوە دەینێرێت، لێرەوە پەستانی خوێن لە کاتی تووڕە بووندا بەرز دەبێتەوە (لە لایەنی پزیشکیی‌یەوە سەلماوە کە ئەم رەقبوونی خوێنبەرانە دەبێتە هۆی دروست بوونی نەخۆشی‌یەکانی دڵ).

ئەمانە سەرەڕای ئەو شوێنەوارە خراپە کۆمەڵایەتی و دەروونی‌یانەی لە ئەنجامی تووڕبووندا لە نێوان خەڵکی‌دا دروست دەبێت، کە دەبێتە هۆی رووخاندنی پەیوەندی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکان، ئەوەی شایەنی باسە ئەوەیە کە زانایان پێشتر وایان دەزانی کە تووڕەیی ئاشکرا زەرەری نی‌یە، و تەنیا تووڕەیی شاراوە لەناو دەرووندا زەرەری هەیە، و دەبێتە هۆی دروست بوونی زۆرێك لە نەخۆشی‌یە دەروونی‌یەکان، بەڵام توێژینەوەیەکی ئەمریکی نوێ لێکۆڵینەوەیەکی نوێی پێشکەش کرد بۆ کاریگەریی هەر یەکێك لەم دوو جۆرە تووڕەبوونە، کە دەڵێت: شاردنەوەی تووڕەبوون (خۆخواردنەوە)، و تووڕەبوونی ئاشکرا، هەردووکیان زیانی تەندروستی‌یان هەیە بەڵام لەگەڵ جیاوازی توندی‌یاندا، لە حاڵەتی تووڕەبوونی شاراوەی ناو دەروون لە کاتی بەردەوام بوون و دووبارە بوونەوەی‌دا دەبێتە هۆی تووشبوونی خاوەنەکەی بە نەخۆشی بەرز بوونەوەی پەستانی خوێن و تەنانەت تووشبوون بە شێرپەنجە (سرطان)، لە کاتی

تووڕەبوونی ئاشكرا و دەربڕاودا و لە دووبارە بوونەوەیدا لەوانەیە زیان بگەیەنێت بە خوێنبەرەكانی دڵ و چانسی تووش بوون بە نۆرەی كوشندەی دڵ (ازمة قلبية قاتلة) زیاد دەكات.

باری لاشەیی مرۆڤ جیا نییە لە بارە دەروونییەكەی، هەر بۆیە بارە دەروونییە خراپەكان كاریگەریی خۆیان لەسەر لەشی مرۆڤ هەیە، ئەم بەیەكەوە گرێدراوییە وا دەكات كاریگەریی تووڕەبوون بە خێرایی بۆ ئەندامەكان بگوێزرێتەوە، ئەو ئەندامانەی كە زیاتر كاریان تێدەكرێت وەك: ژێرمێشكە رژێن لەناو كەللەی سەردا و چەندین رژێنی تر، ئەمانە هۆرمۆنەكان دەردەدەن، كە كۆنترۆڵی هەموو چالاكییەكانی لەش دەكەن، تێكچوونی رێژەی هەندێك لەم هۆرمۆنانە و كەمبوونەیان كاریگەریی زۆر خراپی هەیە بۆ سەر كۆئەندامەكانی لەش، بە تایبەتی كۆئەندامی بەرگری لەش كە چالاكی خانەكانی كەم دەبێتەوە، و ئەو دژە تەنانەی دژی نەخۆشییەكان دروستی دەكات ناگەنە شوێنی مەبەستی خۆیان و كاریگەرییان نابێت.



**Facial Expression and Emotion**
What emotions do you associate with these facial expressions? Research has shown that people around the world—whether they are from the United States, Brazil, Japan, or New Guinea—interpret these six facial expressions in much the same way. The emotions displayed are, *top row, left to right*, anger, fear, disgust, and *bottom row*, surprise, happiness, and sadness. A seventh emotion not shown here, contempt, also has a distinct facial expression recognized across cultures.

ئەم بارە شڵەژانە ئاكامی زۆر خراپی لێدەكەوێتەوە، لەوانە: گۆڕانی خانە ئاسایییەكانی لەش بۆ خانەی شێرپەنجەیی و دروست بوونی ئاوساوی شێرپەنجەیی (أورام سرطانية)، دیارە پێغەمبەر (ﷺ) لەخۆیەوە قسەی نەكردووە، و ئەم راستییە زانستییانەی باسكران گەورەیی و گرنگیی دووبارە كردنەوەی ئەو ئامۆژگارییە لەلایەن پێغەمبەرەوە دەردەخەن، كە تووڕەبوون چەند خراپە و مرۆڤ نابێت تووڕە ببێت.

دکتۆر (احمد شوقي إبراهيم) کە ئەندامی کۆلیژی پزیشکی شایانەی بەریتانی‌یە و پسپۆڕی نەخۆشی‌یەکانی هەناو و دڵە، دەڵێت: ئارەزووە مرۆیی‌یەکان دەکرێن بە چوار بەشەوە، هەڵس وکەوتی مرۆڤەکان جیاواز دەبێت بە جیاوازی بەهێزیی ئەم ئارەزووانە و رادەی کۆنترۆڵ کردنیان، ئەوانیش: ئارەزووە سێکسی یان شەهوانی‌یەکان کە دەبنە هۆی دروست بوونی هەڵچوون و تووڕەبوون، ئارەزووی خۆسەپاندن کە دەبنە هۆی دروست بوونی فیز و خۆبەزل زانین و خۆشەویستی دەسەڵات، ئارەزووە شەیتانی‌یەکان کە هۆکاری دروستبوونی ڕق لێبوون و دوژمنایەتی‌یە لە نێوان خەڵکیدا.

ئارەزوو و مەیلی مرۆڤ بە هەر شێوەیەك بێت هەر تووشی تووڕەبوون دەبێت، لێرەوە لەش دەهەژێنرێت، پەستانی خوێن بەرز دەبێتەوە و مرۆڤ تووشی نەخۆشی‌یە دەروونی و لەشی‌یەکانی وەك: شەکرە و سنگەکوژە (ذبحة صدرية) دەبێت، لێکۆڵینەوە زانستی‌یەکانیش سەلماندوویانە کە تووڕەبوون و دووبارە بوونەوەی تەمەنی مرۆڤ کورت دەکاتەوە، هەر بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) بەو شێوەیە ئامۆژگاری موسوڵمانان دەکات لە فەرموودەکەیدا، با بزانین مانای (لاتغضب) لە فەرموودەکەدا ئەوە نی‌یە کە هەرگیز نابێت تووڕە ببیت، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە زیادڕەوی تێدا مەکەن و بەردەوام نەبن لەسەری، لە هەندێك حاڵەتیشدا تووڕەبوون پێویستە بە تایبەتی لە کاتی شکاندنی سنوورە خودایی‌یەکاندا.

پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەیەکیدا ئامۆژگاری کەسی تووڕەبوو دەکات کە لەو کاتەدا دابنیشێت و بێدەنگ بێت، چونکە هەر کردەوەیەك کە کەسی تووڕەبوو دەیکات تەنانەت دوایی خۆیشی لێی رازی نابێت ئەگەربێتو نیشانی بدرێتەوە، هەر پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەیەکی تریدا ئامۆژگاری موسوڵمانان دەکات بەوەی: ﴿لا يقضينّ حَكَمٌ بين إثنين وهو غضبان﴾ واتە: کەس لە کاتی تووڕەییدا ناوبژیوانی دوو کەسی تر نەکات و حوکم نەدەرکات.

قورئانی پیرۆز باسی تووڕە بوونمان وەك هێزێکی شەیتانی بۆ دەکات کە مرۆڤ دەبەزێنێت، و وای لێدەکات چەند کارێك بکات کە ئەگەر تووڕە نەبێت هەرگیز ئەو

کردارانە ناکات، هەروەك لە باسی موسا پێغەمبەردا (سەلامی خوای لێبێت) بۆمان باس دەکات: ﴿وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَى إِلَى قَوْمِهِ غَضْبَانَ أَسِفًا، ........ وَأَلْقَى الأَلْـوَاحَ وَأَخَـذَ بِرَأْسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُ إِلَيْهِ﴾ (الأعراف:١٥٠)، واتە: کاتێك موسا پێغەمبەر گەڕایەوە بۆ لای قەومەکەی بە تووڕەیی و پەشیمانی‌یەوە ....... پاشان لەوحەکانی تەوراتی فڕێدا و سەری هارونی برای بۆ لای خۆی راکێشا، کە دوایی بۆی روون بووەوە ئەو تووڕەیی‌یە وەسوەسەیەکی شەیتان بووە و کاتێك کە ئەو هەڵچوونەی نیشتەوە لەوحەکانی تەوراتی هەڵگرتەوە و بەردەوام بوو لەسەر ئامۆژگاری شوێن کەوتووانی: ﴿وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى الْغَضَبُ أَخَذَ الأَلْوَاحَ وَفِي نُسْخَتِهَا هُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ هُمْ لِرَبِّهِمْ يَرْهَبُونَ﴾ (الأعراف:١٥٤).

خۆپاراستن لە تووڕەیی پێویستی بە خۆڕاگریی و باوەڕێکی پتەو بە پەروەردگار هەیە، هەر بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) وەسفی ئەو کەسانە دەکات کە لە کاتی تووڕەیی‌دا خۆیان رادەگرن و دەپارێزن بەوەی کەسانێکی زۆر بە توانان: ﴿عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: رسول الله (ﷺ): ليس الشديد بالصُّرَعَة، إنما الشديد الذي يملك نفسه عند الغضب﴾ رواه البخاري و مسلم.

## چارەسەری تووڕەیی لە سوننەتدا:

لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) چارەسەریی تووڕەبوون باسکراوە: ﴿أوصَى رسول الله (ﷺ) الغضبان أن يَتَوَضَّأ﴾، واتە: پێغەمبەر ئامۆژگاریی کەسی تووڕەبووی کردووە کە دەستنوێژ بگرێت، هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: ﴿إنَّ الغَضَبَ من الشيطان، وإن الشيطان خُلِقَ من النار، وإنّما تُطْفَأُ النار بالماء، فإذا غَضِبَ أحدكم، فَلْيَتَوَضَّأ﴾ رواه أحمد وأبو داود، واتە: تووڕەبوون لە شەیتانەوەدیە و شەیتان لە ئاگر دروست بووە و ئاگریش بە ئاو دەکوژێنرێتەوە، بۆیە ئەگەر تووڕەبوون ئەوا هەستن دەستنوێژ بگرن، کەواتە چارەسەری تووڕەیی بە ئاو بەخۆدا کردن دەبێت.

زانستی نوێ سەلماندوویەتی کە لە کاتی تووڕەیی‌دا پێستی مرۆڤ گەرم دەبێت، بەهۆی فراوان بوونی لوولە خوێنەکانی ژێرپێست، کردنی ئاوی سارد بە لەشدا لەکاتی تووڕەیی و هەر حاڵەتێکی تری لەشدا کە دەبێتە هۆی رژاندنی

زیادی هۆرمۆنی ئەدرینالین (وەك كاتی ترسی زۆر یان شڵەژان)، بەرکەوتنی ئەم ئاوە لەگەڵ پێستدا دەبێتە هۆی دابەزاندنی پلەی گەرمی پێست و ئاگادار بوونەوەی کۆتایی‌یە دەماری‌یەکانی هەستیار بۆ ساردیی لەژێر پێستدا، ئەمانیش مێشکی مرۆڤ ئاگادار دەکەن کە ئەویش کارێك دەکات کە پلەی گەرمی لەش دانەبەزێت لە ئاستی ئاسایی خۆی.



یەکێك لەو کارانەی ناردنی تەزووی دەماری‌یە بۆ رژێنی سەر گورچیلە بۆ کەمکردنەوەی رژاندنی هۆرمۆنی ئەدرینالین بە مەبەستی گرژبوونی لوولە خوێنەکانی ژێر پێست و کەمکردنەوەی فەوتانی گەرمی لەرووی پێستەوە، ئاشکرایە کە ئەگەر بکرێت مرۆڤ لە کاتی تووڕەیی‌دا خۆی بشوات ئەوا زۆر باشتر دەبێت لە دەستنوێژ گرتنەکە، چونکە بەکارهێنانێکی زیاتری فاکتەری هێور کردنەوەی تووڕەیی‌یەکەیە، و کاریگەریی ئاوەکە خێراتر و باشتر دەبێت.

لە قورئانی پیرۆزیشدا ئاماژە بۆ ئەو راستی‌یە هاتووە کە ئاو بە لەشدا کردن دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی هەژان و شڵەژان، و مرۆڤ ئارام دەکات، لە سوورەتی (انفال)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَ يُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّن السَّمَاءِ مَاءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ وَ يُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ وَ لِيَرْبِطَ عَلَى قُلُوبِكُمْ وَ يُثَبِّتَ بِهِ الأَقْدَامَ﴾ (الانفال:١١)، واتە: لە کاتی جەنگی بەدردا پەروەردگار بوو کە خەواڵووی کردن بۆ ئەوەی دڵتان ئارام ببێت، و لە ئاسمانەوە بارانێکی بۆ باراندن کە پاکتان بکاتەوە، و وەسوەسەی شەیتان لە دڵتان دەربهێنێت، و دڵە ترساو و تێکچووەکانتان دامەزراو و ئارام بێت، و پێ‌یە لەرزیوەکانیشتان دامەزراو بکات.

## دیاردەی ترس و کاریگەریی باران:

یەکەم جەنگێك کە پێغەمبەر (ﷺ) تێیدا لەگەڵ بێباوەڕاندا ڕووبەڕوو بووەوە بریتی بوو لە جەنگی (بەدر)، لەم جەنگەدا موسوڵمانان کە کەم بوون دەرچوون بۆ ڕێگرتن لە قافڵەی بێباوەڕان، بەڵام تووشی سووپایەکی بەهێزی بێباوەڕان بوون کە چەند جارەی ئەمان دەبوون، جەنگ ڕوویدا و بێباوەڕان لەوە دڵنیابوون بە خەیاڵی خۆیان کە سەرکەوتن بۆ ئەوان دەبێت: ﴿وَ إِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ الْتَقَيْتُمْ فِي أَعْيُنِكُمْ قَلِيلاً وَ يُقَلِّلُكُمْ فِي أَعْيُنِهِمْ لِيَقْضِيَ اللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولاً وَ إِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الأُمُورُ﴾ (الانفال٤٤)، واتە: خوای گەورە ئێوەی لەبەرچاوی بێباوەڕان کەم پیشاندا، بۆ ئەوەی خوای گەورە کە کارێکی بڕیاردابوو بێتەدی (کە ئەویش سەرکەوتنی ئیمانداران بوو).

هەر بۆیە بێباوەڕان دڵنیابوون لە سەرکەوتن، چونکە دەیان بینی موسوڵمانان تەنیا ۳۰۰کەسن و ئەوان ۱۰۰۰کەس بوون کە ۲۰۰یان سوار بوون (لە جەنگدا هەر سوارێك بە ۱۰پیادەیە)، لە لایەکی ترەوە خوای گەورە ئیماندارانی لە چاویاندا زیاتر کەمکردەوە، و وای لێکردن کە خۆیان لێبگۆڕێت و دڵنیابوون لە سەرکەوتنی خۆیان، بەڵام هەرگیز پەروەردگار پێغەمبەرەکەی و بەندەکانی خۆی زایە ناکات و نایان فەوتێنێت، هەروەها پێغەمبەری خۆشەویست دەیزانی کە ئەم ڕووبەڕوو بوونەوەیە زۆر چارەنووس سازە بۆ ئیمانداران، هەر بۆیە زۆر بەکوڵ لە خودا دەپاڕایەوە کە بەهانای ئیماندارانەوە بێت لە جەنگی مان و نەمانیاندا، هەر بۆیە خوای پەروەردگار بە پەلە یارمەتی نارد بۆ ئیمانداران: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُرْدِفِينَ، وَ مَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلاَّ بُشْرَى وَ لِتَطْمَئِنَّ بِهِ قُلُوبُكُمْ وَ مَا النَّصْرُ إِلاَّ مِنْ عِندِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (الانفال٩-١٠)، واتە: کاتێك ئێوە لە خوا دەپاڕانەوە بە هاناتانەوە بێت، ئەو بە پەلە هەزار فریشتەی بۆ ناردن، خوای گەورە ئەمەی کرد بە مژدەیەك بۆتان بۆ ئەوەی دڵەکانتان جێگیر ببێت، هەر بۆیە کاتێك کە ئیمانداران سەربازانی خوداییان بینی لە نێوانیاندا دەجەنگن دڵەکانیان بەهێز و ئارام بوو بۆ سەرکەوتنی خودایی، چونکە بە دڵنیایی سەرکەوتنیش هەر لە لایەن پەروەردگارەوەیە.

یەکێکی تر لە پشتگیری و یارمەتی‌یە خوداییەکان بۆ ئیمانداران کە زۆر پێویست بوو لەو کاتەدا، و لە پێش هەڵگیرسانی جەنگەکەوە خوای گەورە ئیماندارانی پێدامەزراو کرد، و پێشتریش ئامازەمان پێدا، ئەوەیە کە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا باسی کردووە، کە دەفەرموێت: ﴿إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَ يُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّن السَّمَاء مَاء لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ وَ يُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ وَ لِيَرْبِطَ عَلَى قُلُوبِكُمْ وَ يُثَبِّتَ بِهِ الأَقْدَامَ﴾ (الانفال:١١)، واتە: لە پێش جەنگەکەدا و لە چاوەڕوانی بێباوەڕاندا پەروەردگار خەواڵووی کردن و خەوتان لێکەوت، بۆ ئەوەی دڵە ترساوەکانتان ئارام و جێگیر ببێت لەسەر سەرکەوتن، و لە ئاسمانەوە بارانێکی بۆ باراندن کە پاکتان بکاتەوە، و وەسوەسەی شەیتان لە دڵتان دەربهێنێت و دڵتان دامەزراو و ئارام بێت، و پێکانیشتان دامەزراو بکات.

سەرەتا با بزانین ئەو خەواڵوویی و خەوتنە وەك نیعمەتێك وایە چونکە نوستن دەبێتە هۆی گەڕانەوەی چالاکی بۆ ئەندامەکان، ئەوەبوو هەموویان یەك یەك و لە یەك کاتدا و هەر کەسە و لەسەر شێوازی خۆی لە شەوی شەڕەکەدا خەویان لێکەوت بە قووڵی، کە بووە هۆی بەخشینی ئارامی‌یەکی زۆر پێیان لە بەیانی‌دا و لە پێش شەڕەکەدا، بەڵام گرفتێکی تر سەری هەڵدا ئەوەبوو بەیانی کە هەستان هەندێکیان لەو شەوەدا (إحتلام)بوو بوون، ئەمە بووە هۆی ناڕەحەتی بۆ ئەو ئیماندارانە و شەیتانیش خستی‌یە دڵی هەندێکیانەوە، کە ئێوە چۆن دەچن بۆ ئەو جەنگە پیرۆزە بەو حاڵەتانەوە، و ناکرێت بەشداری بکەن تا خۆتان نەشۆن و پاك نەبنەوە، هەر بۆیە لێرەشدا پەروەردگار بەهانای ئیماندارانەوە هات، و لە پێش هەڵگیرسانی شەڕەکەدا بارانێکی باراند کە بووە هۆی پاك بوونەوەی ئیمانداران، و ڕەواندنەوەی ئەو خەیاڵانەی شەیتان خستی‌یە دڵیانەوە.

لەم ئایەتەدا ئامازەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەری تێدایە کە ئەویش ئەوەیە: لە کاتی هەڵچوونە دەروونی‌یەکاندا وەك (ترسی زۆر، تووڕەبوون و شڵەژاندا)، کردنی ئاو بە لەشدا دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی کاریگەریی ئەم حاڵەتە دەروونی‌یانە، زانستی فیسیۆلۆژی لەمڕۆدا ئەم بابەتەی بۆ باس کردووین، وەك پێشتر باسکرا لە

کاتی حاڵەتە دەروونی‌یەکانی وەك ترسی زۆر و تووڕەبووندا هۆرمۆنی ئەدرینالین بەرێژەیەکی زیاتر دەرێژرێت، (موسوڵمانان لە جەنگی بەدردا ترس چووبووە دڵیانەوە کە شتێکی زۆر ئاسایی‌یە لە کاتی پێش جەنگێکی ئاوا چارەنووس سازدا، و زۆری ترسی هاوەڵەکان لەسەر دینەکە بوو کە بێگومان لە کاتی دۆڕاندنی موسوڵماناندا دینە پیرۆزەکەش دەفەوتا!)، زۆربوونی رژاندنی ئەدرینالین دەبێتە هۆی زیاد بوونی لێدانی دڵ و لەرزینی لەش و نەمانی تەرکیزی مرۆڤ، کەواتە هۆرمۆنی ئەدرینالین بەرپرسە لەو کارلێکە خراپانەی لە کاتی تووڕەیی و ترسی زۆردا روودەدات و تاوانباری یەکەمە، بینراوە کە یەکێك لە رێگاکانی کەمکردنەوەی رژاندنی ئەم هۆرمۆنە بریتی‌یە لە کردنی ئاو بە لەشدا، گەیشتنی ئەم ئاوە بە پێست دەبێتە هۆی ئاگادار کردنەوەی کۆتایی‌یە دەماری‌یەکانی ژێر پێست و ئەمانیش مێشکی مرۆڤی لێ‌ئاگادار دەکات کە پاشان زنجیرەیەك رووداو روودەدات و دەبێتە هۆی کەمکردنی رژاندنی هۆرمۆنی ئەدرینالین لە کوێرە رژێنەکانی سەر گورچیلەکانەوە و پاشان هەڵگەڕانەوەی کارە خراپەکانی ئەم هۆرمۆنە، لێرەوە دڵ و دەروون و لەش هێمن دەبنەوە.

یەکێکی تر لە ئاماژە سەرسوڕهێنەرەکانی ئەم ئایەتە ئەوەیە کە دەفەرموێت: ﴿وَلِیَرْبِطَ عَلَی قُلُوبِکُمْ وَ یُثَبِّتَ بِهِ الأَقْدَامَ﴾، واتە: کە باران بەر لەشی هاوەڵەکان کەوت بووە هۆی چوونەوەیەك و دامەزراندنی دڵیان بە شێوەیەکی بازنەیی، و پاشان جێگیر بوونی پێ‌کانیان لەسەر زەوی جەنگەکە، زانستی فیسیۆلۆژی بۆمان باس دەکات کە دڵ ئەندامێکی ماسولکەیی زۆر بەهێزە، و ماسولکەکانی دڵ بەشێوەیەکی بازنەیی بە دەوری شانەکانی تری دڵدا سووڕاونەتەوە و جێگیر بوون، کاتێك کە ئەم ماسولکانە گرژ دەبن لە کاتی لێدانی دڵدا بەشێوەیەکی بازنەیی دەبێت، و کاتێك خاودەبنەوە بە هەمان شێوە بە شێوەیەکی بازنەیی دڵ دەچێتەوە یەك، گەر تێبینی ئایەتەکە بکەین دەبینین کە پەروەردگار ووشەی (وَ لِیَرْبِطَ)ی بەکار هێناوە بۆ چوونەوەیەکی دڵ، و خاوبوونەوەی، کە لە (ربط)ەوە هاتووە، لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبی‌دا ووشەی (ربط) بە مانای بەستنەوەی شتێك دێت بە

شێوەیەکی بازنەیی، عەرەب دەستەواژەی (مربط الفرس) بەکار دەهێنێت بۆ ئەو شوێنە بازنەیی‌یەی کە ئەسپی تێدا دەبەسترێتەوە، کەواتە مانای تەواوی ئایەتەکە ئەوەیە کە: کاتێك باران بەر لەشی تووشبوو بە ترسێکی زۆر دەکەوێت دەبێتە هۆی خاوبوونەوە و چوونەوەیەکی دڵی ئەو کەسە بە شێوەیەکی بازنەیی و دامەزراندنی، بەڕاستی ئەم ئایەتە هەروەها دامەزرێنەری (دڵ)یشە لەسەر ئیمان و یەکتاپەرستی.

لە کۆتایی‌دا ئایەتەکە دەفەرموێت: ﴿وَ يُثَبِّتَ بِهِ الأَقْدَامَ﴾، واتە: بەم بارینی بارانە پێکانیشتان لە سەر گۆڕەپانی جەنگەکە دامەزراو بوو، وەك پێشتر ئامارەمان پێدا لە رووی زانستی‌یەوە یەکێك لە ئاکامەکانی رژاندنی زۆری هۆرمۆنی ئەدرینالین بریتی‌یە لە گرژبوون، پاشان لەرزینی ماسولکەکانی لەش، و دوایی لەرزینی هەموو لەش، کە یەکێك لە ئاکامەکانی لەرزینی قاچەکان و دانەمەزرانی پێکانە لەسەر زەوی، بەرکەوتنی ئاو لەگەڵ پێستدا دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی هۆرمۆنی ئەدرینالین، کەمبوونەوەی کاریگەریی ئەم هۆرمۆنە لەسەر ماسولکەکان دەبێتە هۆی خاوبوونەوەیان و نەمانی لەرزینی لەش، لێرەوە لەرزینی قاچەکانیش نامێنێت و پێکان لەسەر زەوی جێگیر دەبن.

هەروەها یەکێکی تر لە سوودەکانی ئەو باران بارینە بریتی بوو لەوەی کە باران زەوی‌یەکەی ژێر پێی ئیماندارانی تەڕکرد و زەوی‌یەکە جێگیر و دامەزراو بوو، چونکە زەوی لماوی کە تەڕ دەبێت جێگیر دەبێت و یەك دەگرێت، و خۆشدەبێت بۆ رۆشتن بە سەری‌دا، و مرۆڤ ناچەقێتە ناو لمەکەوە، بەڵام لەولاوە ئەم بارانە بوو بە بەلا بۆ بێباوەڕان چونکە زەوی‌یەکەی ژێر پێی ئەمانی بە شێوەیەك تەڕکرد کە هەمووی بووە قوڕاو و لیتاو و زۆنگاو و رۆشتنی ئەمان و ئەسپەکانیانی زۆر زەحمەت کرد و تا ناوەڕاستیان چووە قوڕاو و زۆنگاوەوە.

با بزانین ئەم رووبەڕوو بوونەوەیە چ ئاکامێکی لێکەوتەوە: کاتێك بێباوەڕان چوونە ریزەوە بۆ رووبەڕوو بوونەوە، بینی‌یان کە ئەو موسوڵمانانەی دوێنێ زۆر کەمبوون لەبەر چاویان ئەمڕۆ زۆر زۆرتر دیارن و دوو هێندە بوونەتەوە: ﴿قَدْ كَانَ

لَكُمْ آيَةٌ فِي فِئَتَيْنِ الْتَقَتَا فِئَةٌ تُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَ أُخْرَى كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْيَ الْعَيْنِ وَ اللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِ مَن يَشَاءُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُوْلِي الأَبْصَارِ﴾ (آل عمران:١٣)، واتـه: بـۆ ئێوه نموونەیەکی زۆر باش هەیە لە دوو کۆمەڵەکەی کە لە جەنگی بەدردا رووبەڕوو بوونەوە، کۆمەڵێکیان لە پێناوی خوادا دەجەنگان و ئەوی تریان بێباوەڕ بوون کە ئەمان ئیماندارەکانیان بە دوو هێند دەبینی بەچاویان، دیارە هۆکاری ئەمەش بریتی بوو لەو فریشتانەی هاتنە خوارەوە بۆ یارمەتی ئیمانداران و لە سەرەتای جەنگەکەوە چوونە ریزەوە لەگەڵ موسوڵمانەکاندا، بێگومان ئەم گۆڕانکاری‌یە هەر لە سەرەتاوە کاری لە لایەنی دەروونی بێباوەڕان کرد، ئاکامی کۆتایی جەنگەکە بە دۆڕان و ژێرکەوتنی بێباوەڕان کۆتایی هات (بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەم جەنگە بڕوانە کتێبە باوەڕپێکراوەکانی ژیانی پێغەمبەر ﷺ).

## ووتەی کۆتایی:

لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا چەندین ووتەی پڕ حیکمەت و سوود و دانایی هاتوون کە لە هەمان کاتدا پڕن لە موعجیزە، بە تایبەتی لە رووی زانستی‌یەوە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا ئیعجازە زانستی‌یە گەورە و سەرسوڕهێنەرەکەیان ئاشکرا بووە، ئاماژەدان بە بابەتێکی پزیشکیی ئاوا وورد لە رۆژگارێکی تاریکستان لەرووی زانستی‌یەوە وەك سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)، خۆی لە خۆی‌دا بۆمان دەسەلمێنێت بە شێوەیەك کە گومانی تێدا نامێنێت کە ئەم فەرموودانە دانراوی مرۆڤ نین، و دەبێت سەرچاوەکەیان هەر لەو کەسەوە بێت کە ئاگاداری هەموو نهێنی و وورده‌کاری‌یەکانی لەشی مرۆڤە و هەموو بوونەوەریشە بە گشتی، و بەقەدەر کێشی گەردیلەیەك و لەوەش بچووکتر لەو نهێنی نی‌یە ﴿أَلا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾ (الملك:١٤)، ﴿أَمَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنبَتْنَا بِهِ حَدَائِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنبِتُوا شَجَرَهَا أَإِلَهٌ مَّعَ اللَّهِ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ، أَمَّن جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَالَهَا أَنْهَارًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا أَإِلَهٌ مَّعَ اللَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ، أَمَّن يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الْأَرْضِ أَإِلَهٌ مَّعَ اللَّهِ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ، أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ

يَدَيْ رَحْمَتِهِ أَإِلَهٌ مَّعَ اللَّهِ تَعَالَى اللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ، أَمَّن يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَإِلَهٌ مَّعَ اللَّهِ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ، قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ﴾ (النمل: ٥٩-٦٥).

پاك و بێگەردی بۆ تۆ خودایە كە ئاوا بۆ مرۆڤەكان دڵسۆزیت و حەز لە هیدایەتیان دەكەیت، بۆیە بەرنامەیەكت بۆ ناردوون كە لەگەڵ هەموو بنەماكانی ژیری و بیركردنەوەی زانستی و راستی‌یە زانستی‌یەكاندا یەكدەگرنەوە، و هەموویان بەڵگەن لەسەر راستیی و پیرۆزیی ئەم ئیسلامە شیرینە، دەی ئەی مرۆڤی دوور لە خودا كاتی ئەوە هاتووە كە بیرێك بكەیتەوە و ئەم هەڵە بقۆزیتەوە، و بگەڕێیتەوە بۆ ئامێزی پڕ سۆز و میهرەبانی، چونكە هەر ئەوە كە بە هەموو شێوەیەك لە بەندەكانی دەبوورێت و دەرگای رەحمەتی هەمیشە كراوەیە: ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ (الزمر: ٥٣).



## سەرچاوەكان:


١- صحيح البخاري و مسلم.

٢- الرحيق المختوم (كتێبێكە دەربارەی ژیانی پێغەمبەر)/ دانراوی: صفي الرحمن المباركفوري.

٣- معجم لسان العرب/ أبوالفضل جمال الدين محمد بن منظور.

٤- الإعجاز العلمي في القرآن و السنة النبوية/ د.محمد كامل عبدالصمد.

٥- ئینتەرنێت: سایتەكانی: www.science4islam.com / www.islamonline.net /www.tasabeeh.com

6- Ganong Review of Medical Physiology – Apelton & Lange - USA.



# ئیعجازی پزیشکی لە

# فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ)

# دەربارەی کلێنچکە

# (عجب الذنب)

چەند فەموودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ) باسیچەندین بابەتیان کردووە لە لەشی مرۆڤدا کە تەنها تازە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا راستییەکانیان دۆزاونەتەوە، هەندێك لەو فەرموودانەی کە فەرموویەتی باسی شوێنێکی گرنگی لەشی مرۆڤی کردووە کە لەم دواییانەدا مەڵبەندە زانستییەکان توێژینەوەیان لەسەر بڵاوکردۆتەوە بەشێوەیەك کە راستی فەرموودەکانی خوای گەورە و پێغەمبەری مەزنمان ئەسەلمێنن، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بۆی روونکردووینەتەوە کە چەندین بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا لە لەشی خۆماندا و لە ئاسمان و زەویدا هەیە، گەورەیی دەسەڵاتی پەروەردگارمان بۆ ئەسەلمێنن، و تاوەکو بۆمان روون ببێەوە بە بەڵگەی زانستی کە ووتەکانی خوا و پێغەمبەر راستن، خوای گەورە دەفەرموێت: (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَ فِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَ لَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ) (فصلت:٥٣).

پێغەمبەر (ﷺ) لە چەند فەرموودەیەکدا باسی کلێنچکەی کردووە کە بەشێکی گرنگی لەشی مرۆڤە و بە بەردی بناغەی دروستبوونی کۆرپەلەی مرۆڤی داناوە، بەرروونی باسی ئەوەی کردووە کە مرۆڤ لەمەوە دروست دەبێت، و فەرموویەتی هەموو ئێسکەکانی لەشی مرۆڤ لە خاکدا ئەڕزێ و ئەبێتەوە بە خۆڵ، جگە لە بەشێکی زۆر بچووك لە ئێسکی کلێنچکە کە بە ئەندازەی تۆوی خەرتەلە ئەبێت لەناو خاکەکەدا ناڕزێت و دەمێنێتەوە، و بە فەرمانی خوای گەورە جارێکی تر مرۆڤی لێوە زیندوو ئەکرێتەوە لە رۆژی دواییدا، واتە ئەو بەشە بچووکە لە کلێنچکە کە ناڕزێت بە تۆوی زیندوو بوونەوەی مرۆڤ دادەنرێت لە رۆژی دواییدا، ئەمەش دەقی فەرموودەکانی پێغەمبەرە (ﷺ) لەم بارەیەوە:

١- ئیمامی بوخاری لە فەرموودە راستەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە: عن أبي هريرة (ﷺ) قال: قال رسول الله (ﷺ): (مابين النفختين أربعون، قال: أربعون يوماً؟ قال أبو هريرة: أبيت، قال: أربعون شهراً؟ قال: أبيت، قال؟ أربعون سنة؟ قال أبيت (أي أن أبا هريرة أبى أن يحدد الأربعين هل هي يوماً أو شهراً أو سنة)، قال: (أي أبو هريرة يرفعه إلى النبي (ﷺ): (ثمَّ يُنْزِلُ الله من السماء ماءً فينبتون كما ينبت

البقل، ليس من الإنسان شيء إلا يبلى إلا عظماً واحداً، و هو عجب الذنب، و منه يركب الخلق يوم القيامة) رواه البخاري، واته: له نێوان هەردوو فوو پیاکردنەکەی ڕۆژی دواییدا چله (که دیاری نەکرد ٤٠ڕۆژه یان مانگه یان ساڵه)، پاشان خوای گەورە بارانێك دەبارێنێت که لەشی مرۆڤەکانی لێوه دەڕوێنێتەوه وەکو چۆن ڕووەك دەڕوێتەوە، هیچ شتێك نییه له لەشی مرۆڤ که نەڕزێت و نەفەوتێت، تەنیا




ئێسکێك نەبێت، که ئەویش بەشێکی کلێنچکەیە، لەمەوه مرۆڤەکان دەڕوێنرێنەوه و دروست دەکرێنەوه له دوارۆژدا.

٢-ئیمامی موسلیم له فەرموودە ڕاستەکانی پێغەمبەر (ﷺ) وەك ئەو فەرموودەیەی سەرەوەی بۆ گێڕاوینەتەوە: عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): (كل ابن أدم يأكله التراب إلا عجب الذنب، منه خلق ومنه يركب)، و في لفظ آخر: (وليس من الإنسان شيء إلاّ يبلى إلاّ عظماً واحداً هو عجب الذنب، و منه يركب الخلق يوم القيامة)، و في لفظ آخر لمسلم: (إن في الإنسان عظماً لا تأكله الأرض أبداً فيه يركب يوم القيامة، قالوا: أي عظم هو يا رسول الله؟ قال: عجب الذنب).

ماناى فەرموودەكان: هەموو بەشێكى مرۆڤ زەوى دەيخوات و دەيرزێنێت تەنها بەشێكى ئێسكێك نەبێت كە هەرگیز زەوى ناتوانێت بیفەوتێنێت، لەم ئێسكەوە دروست بووە و هەر لەمیشەوە زیندوو دەبێتەوە، هاوەڵەكان پرسىیان ئەو ئێسكە كامەیە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى: بەشێكى كلێنچكەیە.

٣- ئەبو داود لە سوننەنەكانیدا هەمان فەرموودەى گێڕاوەتەوە لە ئەبو هورەیرەوە بەم شێوەیە: (كل ابن آدم تأكُلُ الأرضُ إلا عجب الذنب منه خُلِقَ وفيه يُركّب).

٤- ئیمامى (مالیك)یش لە كتێبەكەیدا (الموطأ) بە هەمان شێوەى پێشوو فەرموودەكەى گێڕاوەتەوە.

٥- ئیمامى (النسائي، إبن ماجة و إمام أحمد)یش هەمان فەرموودەیان لە چەند شوێنێكى كتێبەكانیاندا گێڕاوەتەوە.

٦- ئیمامى (إبن حبّان)یش هەمان فەرموودەى گێڕاوەتەوە لە چەند شوێنێكدا لە ئەبو هورەیرەوە، تەنها یەك فەرموودەیان نەبێت كە لە (ابي سعيد الخدري)وە گێڕاویەتییەوە: كە پێغەمبەرى خوا (ﷺ) فەرموویەتى: (يأكل التراب كل شيء من الإنسان إلا عجب ذنبه، قيل: و ما هو يا رسول الله؟ قال: مثل حبة خردل منه ينشأ)، واتە: زەوى هەموو شتێكى مرۆڤ دەخوات تەنها بەشێكى كلێنچكە نەبێت، هاوەڵەكان پرسىیان: ئەو بەشە چىیە ئەى پێغەمبەرى خودا؟ ئەویش فەرمووى: بەقەدەر دەنكە خەرتەلەیەك دەبێت كە مرۆڤى لێوەى دروست بووە.




ئەم فەرموودانە دوو ئاماژەى زانستیى زۆر نوێى تێدایە، یەكەمیان ئەوەیە كە كۆرپەلەى مرۆڤ لەكلێنچكەوە دروست دەبێت، دووەمیان بەرگە گرتنى ئەم بەشەیە بۆ گۆڕانكارییەكانى رۆژگار، كە لە دواى ڕزانى هەموو لاشەى مرۆڤ

بەشێك لەم هەر دەمێنێتەوە و لەدوا ڕۆژدا مرۆڤ لەم بەشەوە وەكو چەكەرەیەك زیندوو دەبێتەوە.

دەبا ئێستا لەژێر ڕۆشنایی نوێترین دۆزینەوە و تاقی كردنەوەی ڕۆژگاردا لەم فەرموودانە بكۆڵینەوە:







## كلێنچكە لە زانستی كۆرپەلەزانیدا (شریتی یەكەم):

تـــــــازەترین توێژینـەوەكانی زانسـتی كۆرپەلـــەزانی ڕوونـــی كردۆتەوە كە كلێنچكە لە ســـەرەتادا بریتی‌یـــە لـــە شـــریتی ســـــەرەتایی (الشــــریط الأولـــي Primitive Streak)، لەگـەڵ دەركـەوتنی ئـەم شـــریتە ســـەرەتایی‌یەی كۆرپەلـــەدا، چـــینەكانی لـــەش وئەندامـــەكانی كۆرپەلـــە و كۆئەنـــدامی دەمـــاری كۆرپەلەكـــە پێكـدێنێت، دوایـی ئـەم شریتی سەرەتایی‌یە هیچ شوێنەوارێكی نامێنێت جگە لە جێماوەیەك نەبێت كە پێی دەڵێن ئێسكی كلێنچكە (عظم العصعصي Coccygeal Bone).

**پێکهاتنی شریتی سەرەتایی:**

دوای ئەوەی ئەو تۆپەڵە خانەیە (Blastula)یەی لە هێلکەی پیتێنراوەوە دروست دەبێت دەگاتە منداڵدان، خۆی بە دیواری منداڵدان‌دا هەڵدەواسێت و تیایدا جێگیر دەبێت، پاشان جیادەبێتەوە بۆ دوو ڕیز بارستەخانە:

أ- بارستەخانەی دەرەکی: کە خانە داخۆرەکان یان خۆرە خانەکان (الخلایا (کتلة CytoTrophoblasts)ی تێدایە، ئەمانە هەڵدەستن بە کرۆژین و هەڵکۆڵینی دیواری منداڵدان، و کارێکی وا دەکەن کە تۆپەڵە خانەکەی لەسەر جێگیر ببێت، ئەم بارستە خانەیە ڕێگە ئەدات بە خۆراك کە بڕوات بۆ تۆپەڵە خانەکە (کۆرپەلەکە)، ئەویش لەوانەی لە چوار دەورێتی لە خوێن و دەردانەکان (فرازات)ی ڕژێنەکانی منداڵدانی دایکەکە.

ب- بارستەخانەی ناوەکی (کتلة خلایا الداخلیة): لەم بارستە ناوەکی‌یەوەیە کۆرپەلەکە دروست دەبێت، ئەم بارستە ناوەکی‌یە جارێکی تر دابەش دەبێت بۆ دوو پەڕەی تەنك لە خانە کە وەك کاغەز وان:

) دەرەکی‌یەکەی پێ‌ی دەڵێن (ئیکتۆدێرم Ectoderm).

) ناوەکی‌یەکەی پێ‌ی دەڵێن (ئیندۆدێرم Endoderm).

چینی ئیندۆدێرمی ناوەکی لە هەشتەمین ڕۆژ دوای پیتاندنی هێلکەکە، لە منداڵدانـدا دەردەکەوێت، کەلێنێکی بچووك دەردەکەوێت لەسەرەوەی چینی ئیکتۆدێرمی دەرەکی‌یەوە و ئەم بەشە دەبێتە پێکهێنەری سەرەتایی بۆشایی ئەمنیۆن (Amnioti Space). ...مری بۆشایی ئەمنیۆن ...کدێت لە ...ۆرە خانەکان



(الخلايا الآكلة)، بەڵام بنکی بۆشایی ئەمنیۆن لە خانەکانی ئیکتۆدێرم پێکدێت.
- لە نۆهەمین رۆژدا لە خانەکانی چینی ناوەکی (ئیندۆدێرم)ەوە شریتێك لە خانە درێژ دەبێتەوە و بە خانەکانی چینی میزۆدێرمی دەرەکی‌یەوە دەنووسێ و دەبێتە پێکهێنەری توورەکەی زەردێنەی یەکەم (Primary Yolk Sac).
- لە رۆژی سیانزەهەمیندا لە خۆرە خانەکانی دەرەکی‌یەوە نووکەکان (نتوءات) پەیدا دەبن و گەشە دەکەن، کە پاشان بە نووکە نەرمەکانی پەردەی وێلاش ئەناسرێن (مخملات الغشاء المشيمي Chorionic Villi)، بەهۆی ئەو نووکانەوە توورەکەی کۆرپەلە بەمنداڵدانەوە خۆی جێگیر دەکات، دوایی لقی لێ دەبێتەوە وەکو لقی درەخت، هەروەها خانەکانی ئیندۆدێری ناوەکی گەشە دەکەن و دەبنە پێکهێنەری تورەکەی زەردێنەی دووەهەم کە زۆر لە تورەکەی زەردێنەی یەکەم بچوکترە.
-لە کۆتایی هەفتەی دووەمدا کۆرپەلەکە لە دوو خەپلەی بەیەك گەیشتوودا خۆی ئەبینێتەوە کە ئەمانەن:
١)خەپلەی دەرەکی (القرص الخارجي) یان (ئیکتۆدێرم): کە بنی (بۆشایی ئەمنیۆن) پێك دێنێت.
٢)خەپلەی ناوەکی (القرص الداخلي) یان (ئیندۆدێرم): کە سەری بۆشایی تورەکەی زەردێنە پێکدێنێت.
ئەم دوو خەپلەیە لە بەشی پێشەوایاندا بەیەکەوە ئەنووسێن کە لە دوایی‌دا بە بەشی سەریی دەناسرێت (Cephalic Portion) ، ئەمیش بەهۆی چڕبوون و ئەستوربوونی خانەکانی ئیندۆدێرم، هەروەها ئەم دوو خەپلە شێوە هێلکەیی‌یە دوایی لە ناوچەی کۆتایی (کلکی)یاندا (Caudal Portion) بەیەکەوە ئەنووسێن، و دەبنە پێکهێنەری پلێتێك لە ئایندەدا کە پێی دەووترێت: پەرەکی کلکیی گۆشەیی (Cloacal Plate).
- لە چواردەهەمین رۆژدا دوو خەپلەکە درێژ دەبنەوە هەتا شێوەیەکی هەرمێی وەرئەگرن، سەرە پانەکەی بەشی پێشەوەیەتی بەڵام بەشە کۆتایی‌یەکەی باریك


وێنەیەکی سەرەتایی لۆ یانەی هێزە هەروێی گەشەپێی شریتی سەرەتایی تێدا دیاری کراوە

دەبێتەوە، خانەکانی چینی ئیکتۆدێرم لە ناوچەی کۆتایی‌دا چالاك دەبن و دەبنە پێکهێنەری شریتی سەرەتایی (Primitive Streak) کە بۆ یەکەم جار لە پانزەهەمین رۆژی دوای پیتاندنی هێلکەکەدا دەردەکەوێت.

دوای پێکهاتنی شریتی سەرەتایی دابەشبوونێکی خێرا لە خانەکانی ئەم شریتەدا روودەدات، و گەشەکردنێکی زۆر لە پەلە روو دەدات لە خانەکانی شریتەکەدا، ئەم خانە دروستبووانە بەلای ڕاست و چەپدا بڵاو دەبنەوە لە نێوان هەردوو چینی ئیندۆدێرمی ناوەکی و ئیکتۆدێرمی دەرەکی، کە دوایی ئەم خانانە دەبنە پێکهێنەری چینێکی نوێ لە کۆرپەلەکەدا، کە پێی دەووترێت چینی ناوەڕاست یان (میزۆدێرم Mesoderm).

- لە ئەنجامی پێکهاتنی شریتی سەرەتایی و زیادبوونی دابەشبوونە چالاکی‌یەکەی‌دا، خانەکانی کۆئەندامی دەماری لەشی کۆرپەلەکە و نۆتۆکۆرد (Notochord) پێکدێت، هەروەها پاش دروستبوونی چینی ناوەڕاست (میزۆدێرم)، ئەندامەکانی لەشی کۆرپەلەکە دەست دەکەن بە دروست بوون و گەشە کردن، ئەگەر بێتو ئەم شریتی سەرەتایی‌یە دروست نەبێت ئەوا ئەندامەکانی کۆرپەلەش دروست نابن و گەشە ناکەن، و هەگیز خەپلەی سەرەتایی کۆرپەلەکە ناچێتە قۆناغی دروست کردنی ئەندامەکانەوە.

لەبەر گرنگی ئەم شریتە سەرەتایی‌یە لیژنەی (وارنك)ی پەرلەمانی بەریتانی (کە تایبەتە بە پیتاندنی دەستکرد لە دەرەوەی منداڵان و قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆرپەلە) کردوویەتی بە نیشانە و قۆناغی جیاکەرەوە، بۆ ئەنجامدانی تاقیکاری لەسەر ئەو کۆرپەلانەی مرۆڤ کە زیاد دەبن لە کاتی ئەنجامدانی پیتاندنی دەستکرد لە دەفری تاقیکردنەوەدا، پێش پەیدا بوونی ئەم شریتە لیژنەکە رێگا بە تاقی‌کردنەوە دەدات لەسەر کۆرپەلەی مرۆڤ، بەڵام پاش پەیدابوونی ئەم شریتە لیژنەکە هەموو جۆرە تاقیکاریی‌یەکی لەسەر کۆرپەلەی مرۆڤ قەدەغە کردووە، چونکە دوای پەیدابوونی ئەم شریتە سەرەتای کۆئەندامی دەمار و سەرەتای ئەندامەکانی لەش ورردە ورردە دەست بە پەیدا بوون دەکەن.

لە ئەنجامی پەیدابوونی ئەم شریتە و چالاکی‌یە زۆرەکانی‌یەوە، ئەم دروست کراو و پێکهاتووانەی خوارەوە پەیدا دەبن:

١- نۆتۆکۆرد (سەرەتای پەتکی پشت یان سەرەتای بڕبڕەی پشت): کە لە گرێی سەرەتایی یان گرێی هانسن (Primitive Node)ەوە درێژ دەبێتەوە بەرە و بەشی سەریی لە کۆرپەلەکەدا.

٢- دوای پێکهاتنی شریتی سەرەتایی، خەپلەی بازنەیی کۆرپەلەکە دەگۆڕێت بۆ شێوەی هەرمێیی کە دەتوانرێت هەردوو سەرەکەی لە یەك جیا بکرێتەوە، بەشە پانەکەی پێی دەوترێت بەشی سەری کورپەلەکە و بە بەشە باریکەکەی دەوترێت بەشی خوارووی کۆرپەلەکە (بەشی کلکیی کۆرپەلە).

٣- سەرەتای کۆئەندامی دەمار لە چینی دەرەکی (ئیکتۆدێرم)ەوە دەردەکەوێت لە کۆتایی هەفتەی سێیەمدا (٢٠-٢١ رۆژ)، ئەم چینە ورردە ورردە و بەدوای یەکدا ئەم دروست کراوانەی کۆئەندامی دەمار دروست دەکات:

پەڕە یان پلێتی دەماریی (الصفيحة العصبية Neural Plate)، ئەم پەڕەیە لوول دەخوات بۆ دروست کردنی لوولپێچی دەماریی (الإلتفاف العصبي Neural Folds)، ئەم لوولپێچەش لەملاولاوە یەکدەگرێت بۆ دروست کردنی بۆری دەماریی (الأنبوبة العصبية Neural Tube) کە دوو سەری دانەخراوی

هەیە، لەڕۆژی ٢٥دا کونی سەرەوە دادەخرێت و لەڕۆژی ٢٧دا کونی خوارەوەش دادەخرێت، لەم کۆئەندامە سەرەتاییەوە دڕکەپەتك (النخاع الشوكي) و مێشك (واتە کۆئەندامی دەماری مرۆڤ) دروست دەبێت، لەو کاتەی ئەم بۆری دەمارییە دادەخرێت پەڕەی بیستن (الصفيحة السمعية Otic Placode) و پەڕەی هاوێنەی بینین (الصفيحة العدسية Lens Placode) دروست دەبن.




## گەشەکردنی کۆئەندامی دەمار لە شریتی سەرەتاییەوە

٤- چینی میزۆدێرم لە شریتی یەکەم دروست دەبێت، و چڕدەبێتەوە بەدەوری تەوەرەی کورپەلەکەدا، و بارستە لەشییەکان (الكتل البدنية Somites) دروست دەکات، کە ئەمانیش دوایی بڕبڕەی پشت و ماسولکەکان دروست دەکەن، هەروەها سەرەتای هەر چوار پەلەکە (دوو دەست و دوو قاچ) لەم چینەوە چەکەرە دەکات و دەردەچێت، هەر ئەم چینی ناوەڕاستەشە کۆئەندامی ئێسك وماسولکەی لێوە دروست دەبێت.

چینی ناوەڕاست (میزۆدێرم) دابەش دەبێت بۆ سێ بەش، بەپێی دووریی لە سەنتەری کۆرپەلەکەوە، واتە لەناوەوە بۆ دەرەوە:

بەشی یەکەم: ئەو بەشەیە کە لە سەنتەری کۆرپەلەکە و بۆری دەمارییەوە نزیکە، لەم بەشەوە تۆپەڵە لەشییەکان یان بارستە لەشییەکان (الكتل البدنية Somites) دروست دەبێت، ئەم بارستانە دیارترین بەشی کۆرپەلەن لە نێوان هەفتەی سێیەم و پێنجەمدا، لەم بارستانەوەیە کە کۆئەندامی ئێسك و ماسولكە و هەر چوار پەلەکان دروست دەبێت.

بەشی دووەم: بەشی ناوەندی ئەم چینەیە یان بەشی میزۆدێرمی ناوەنجی (Intermediate Mesoderm)، بە فەرمانی خودا لەم بەشەوە ئەمانە دروست دەبێت: ناوپۆشی داپۆشەری ناوسك یان پریتۆن (Peritoneum)، رووپۆشی داپۆشەری سییەکان و دیواری سنگ یان پلوورا (Pleura)، پەردە و رووپۆشی داپۆشەری دڵ (Pericardium).

بەشی سێیەم: لەم بەشەوە بۆرییەکانی خوێن، دڵ، ماسولكەکانی کۆئەندامی هەرس دروست دەبن.



پەیدابوونی چینی میزۆدێرم لە شریتی سەرەتاییەوە

کەواتــە دروســت بــوونی شــریتی ســەرەتایی بریتی‌یــە لــە ســەرەتایەکی جیابوونــەوەی شــانەکانی کۆرپەلــە بــۆ دروســت کردنــی چــینە جیاجیاکــان و ئەندامەکانی لەشی کۆرپەلەکە، لەڕاستی‌دا ئەوەی دەناسرێت بە قۆناغی دروست بــوونی ئەندامــەکان (Organization) تــەنها دوای پەیــدا بــوونی شــریتی سەرەتایی و بارستە لەشی‌یەکان دەست پێ‌دەکات، کە لە سەرەتای هەفتەی٤ تا کۆتایی هەفتەی٨ دەخایەنێت، بە شێوەیەك کە کۆرپەلەکە لە کۆتایی ئەم ماوەیەدا هــەموو کۆئەندامــە ســەرەکی‌یەکان و ئەندامــەکانی تێدا دروســت بــووە، و تــەنها وردەکاری‌یەکانیان و گەورە بوون و گەشەکردنی ئەم ئەندامانە ماوە.

**زانستی پزیشکیی ئەمڕۆ تاقی کــردنەوەی لەسەر کۆرپەلە قەدەغە کردووە لەگەڵ دروست بوونی سەرەتای کلێنچکە(عجب الذنب)دا چونکە ئەم کاتە بە سەرەتای راستەقینەی دروست بــوونی کۆرپەلە دادەنرێت.**

### سەرەنجامی شریتی سەرەتایی:

وەك باسمان کرد شریتی سەرەتایی گرنگی‌یــەکی گــەورەی هەیــە، چــونکە چالاکی‌یە هێجگار زۆرەکانی دەبێتە هۆی دروست بوونی کۆئەندامی دەمار و چینی ناوەڕاســـت، کــە ئــەمیش زۆربـــەی کۆئەندامــەکانی لەشــی کۆرپەلەکــەی لێوە دروست دەبێت، پاش دروست بوونی ئەو ئەندامانــەی باسمان کرد لێــەوە و تــەواو بوونی کاری ئەم شریتە، لە هەفتەی چوارەمدا، سەرەنجام ئەم شریتە دەست دەکات بەپووکانەوە، و تەنها لە کۆتایی بڕبڕەی پشتی کۆرپەلەکە و پاشان منداڵە لەدایك بووەکەدا دەمێنێتەوە، و لە ئێسکی کلێنچکەدا شوێنەوارێك دروست دەکات کە بەچاو نابینرێت، پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی بۆ ئەوە داوە کە هــەموو لەشــی مرۆڤ پــاش مــردن شــی‌دەبێتەوە و دەڕزێــت و نامێنێــت، تــەنها بەشــێکی کــەمی ئــەم کلێنچکەیە نەبێت کە بەچاو نابینرێت (واتە: عجب الذنب)، هەر کاتێك پەروەردگار ویستی لێبێت لەرۆژی دوایی‌دا بارانێك دەبارێنێت، کە لەشی مرۆڤەکانی لەو بەشە کەمەی کە نافەوتێت لەناوچەی ئێسکی کلێنچکەدا دەڕوێنێتەوە وەك رووەك.




ئەمەی باسکرا ئیعجازی یەکەمی فەرموودەکەیە کە ئاماژە بە دروست بوونی مرۆڤ دەدات لەم (عجب الذنب)ەوە، لێرەوە دەگەینە ئیعجازی دووەمی فەرموودەکە کە ئەویش مانەوەی بەشێکی ئەم کلێنچکەیەیە، و بەرگە گرتنی ئەم بەشەیە بۆ گۆڕانکارییەکانی رۆژگار، و نەفەوتان و نەڕزانێتی پاش مردنی مرۆڤەکە و شیبوونەوە و خواردنی لاشەکەی لەلایەن زەوییەوە.

هەمان ئەو فەرموودانەی سەرەوەن کە باسی نەفەوتانی ئەم بەشەی لەشی مرۆڤ
ەن، بە تایبەتی فەرموودەکانی:
- ﴿إن في الإنسان عظماً لا تأكله الأرض أبداً فيه يركب يوم القيامة، قالوا: أي عظم يا رسول الله؟ قال: عجب الذنب﴾ رواه مسلم، واتە: هەموو بەشێکی مرۆڤ زەوی بخوات و دەیڕزێنێت تەنها بەشێکی ئێسکێك نەبێت کە هەرگیز زەوی ناتوانێت ەوتێنێت، لەم ئێسکەوە دروست بووە و هەر لەمیشەوە زیندوو دەبێتەوە ەڵەکان پرسییان ئەو ئێسکە کامەیە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەشێکی نچکەیە.
- ﴿يأكل التراب كل شيء من الإنسان إلا عجب ذنبه، قيل: وما هو يا رسول الله؟ : مثل حبة خردل منه ينشأ﴾ رواه ابن حبان، واتە: زەوی هەموو شتێکی مرۆڤ ـوات تەنها بەشێکی کلێنچکە نەبێت، پرسیان: ئەو بەشە چی‌یە ئەی ەمبەری خودا، ئەویش فەرمووی: بەقەدەر دەنکە خەرتەلەیەك دەبێت کە مرۆڤی ە دروست بووە.
وەك باسمان کرد لە رووی زانستی‌یەوە سەلماوە کە مرۆڤ لە شریتی رەتایی‌یەوە دروست دەبێت، و ئەم شریتە دوایی دەپووکێتەوە تەنها بەشێکی می نەبێت لە کۆتایی بڕبڕەی پشتدا (ئێسکی کلێنچکە-عظم العصعصي)دا ێنێتەوە، کاتێك مرۆڤ دەمرێت هەموو لەشی دەڕزێت و دەفەوتێت تەنها ئەم ـە بچووکەی نەبێت، کە بەرگەی هەموو بارودۆخێکی ناهەموار دەگرێت و ێنێتەوە، و دەبێتە تۆو و چەکەرەی زیندوو بوونەوەی مرۆڤ لە رۆژی دواییدا.
بۆ سەلماندنی ئەم راستی‌یە ئەو تاقی کردنەوانە دەکەین بە بەڵگە کە هەندێك لە یانی ووڵاتی (چین) پێی هەستان لەم ساڵانەی دواییدا، کە بۆیان سەلما ەرگیز ناتوانرێت ئەم ئێسکە (کلێنچکە یان عجب الذنب) بە تەواوەتی




بفــــەوتێنرێت، لــــە رووی کیمیایی‌یـــەوە هەوڵیانـــدا بیفەوتێنن بە تواندنەوەی لە بـەهێزترین مـاددەی ترشـدا (الاحمــاض Acids) بـــەڵام بینی‌یـان کــە هــەر خانــەی زیندووی تێدا دەمێنێت و بە تەواوەتی ناتوێتەوە، هەروەها ویســـــتیان لــــە رووی فیزیایی‌یـــەوە خانـــەکان و پێکهاتووەکـــانی بفـــەوتێنن ئـەویش بـە سـووتاندنی لـە بـەهێزترین فڕنـدا، و پاشـان هـاڕین و پـان کردنـەوەی بـە بەهێزترین ئامێر لەو بوارەدا، لەکۆتایی‌دا خستنە بەری ئەم ئێسکە بۆ بەردەم ماددەیەکی ناووکی تیشکدەر و دووچار کردنی بە چەندین جۆر تیشـکی نـاووکی زیـان بـەخش کـە هـەموو ماددەیـەکی زینـدوو دەفـەوتێنێت و دەمرێنێـت، بەڵام سـەرەنجام دوای هـەموو ئەم کردارانـە و هەوڵانـە نـەیانتوانی بـە تـەواوەتی هـەموو ئـەم ئێسـکە بفەوتێنن و بینی‌یـان کـە هێشـتا هـەر خانـەی تێـدا دەمێنێت و مەحاڵە بتوانرێت ئەم ئێسکە بە تەواوەتی بفەوتێنرێت.

لێرەدا ئەگەر بچینەوە سەر فەرموودەکانی قورئان و سوننەت و چۆنێتی زیندوو بوونەوە لەرۆژی دوایی‌دا بە ئاشکرا ئەم بابەتەمان بۆ روون دەکەنەوە، ئەم بەشـەی کلێنچـکە (عجـب الـذنب)ە کـە نافـەوتێت و تـۆوی زینـدوو بوونەوەیـە، لەوانەیـە لـە نـاخی زەوی‌دا بێـت یـان لـەژێر بینایـەکی ١٠٠ نهۆمی‌دا بێـت، یـان نەهـەنگێك ئـەم

مرۆڤـەی خـوارد بێـت و لـە نـاخی دەریـادا ئـەم بەشـە گیرسـا بێتـەوە، یـان هـەر شوێنێکی تر.

خوای گەورە بۆمان باس دەکات کە بوومەلەرزەیەکی زۆر مەزن روو دەدات لە رۆژی دوایـیدا و دەبێتـە هـۆی هێنانـە دەرەوەی ئـەم بەشـانەی مرۆڤـەکان لـەناو زەوییەوە ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا، وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا﴾ (الزلزلة: ١-٢)، واتـە: کاتێك دێت کە زەوی بوومەلەرزە ترسناکەکەی بەسەردا دێت، ئەم بوومەلەرزەیە دەبێتە هۆی هێنانە دەرەوەی قورساییەکانی ناخی زەوی (موفەسیرەکان یەکێك لە ماناکانی ئەو قورساییانەی دێنە دەرەوە بە هاتنە دەرەوەی (عجب الذنب)ی مرۆڤەکانیان لێك داوەتەوە).

کاتێك ئـەم تۆوانـەی مرۆڤـەکان دێنـە سـەر رووی زەوی، دوایـی خـوای گـەورە بارانێك دەبارێنێت کە لە کتێبی (شرح العقيدة الطحاوية)دا هاتووە کە وەك (مەنی) پیاو وایە، و دەبێتـە هـۆی رواندنی ئەم بەشانە و دەرهاتنیان لە زەوییەوە وەك چـۆن تـۆوی درەخـت لـە زەوییـەوە سـەر دەردێنێـت و دەڕوێـت، خـوای گـەورە دەفەرموێت: ﴿يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَ يُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَيُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَكَذَلِكَ تُخْرَجُونَ﴾ (الروم: ١٩)، واتـە: پەروەردگارتان ئەو خودایەیە کە زینـدوو لـە مردووەوە دەردێنێت، و مـردوو لـە زینـدووەوە دەردێنێت، و زەوی پـاش مردنـی زینـدوو دەکاتـەوە و رووەکـی لێدەردێنێـت، ئێـوەش بـە هـەمان شـێوە زینـدوو دەکرێنەوە، و لە زەوییەوە دەردەهێنرێن.

لاشەی مرۆڤەکان دەڕوێتەوە لە (عجب الذنب)ەوە هەروەك چۆن یەکەم جاریش لـە سکی دایکیدا لەمـەوە دروست بـووە، بۆ دووەم جاریش هەر لەم بەشـەوە لـە زەوییەوە دەردەهێنرێت، هەر کاتێك لاشەکان روانەوە گیان (رۆح)ەکانیش بەڕەلا دەکرێن و دێنەوە بۆ ناو لاشـەکانیان، ئەمەیە کە خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَإِذَا النُّفُوسُ زُوِّجَتْ﴾ (التكوير: ٧)، واتە: رۆژێك دێت کە لاشەکان جووت دەخرێنەوە لەگەڵ رۆحەکانیانـدا، دوایـی: ﴿فَإِذَا هُم قِيَامٌ يَنظُرُونَ﴾ (الزمر: ٦٨)، واتـە: پاشـان مرۆڤـەکان زینـدوو دەکرێنـەوە و هەڵدەسـتنەوە و بەچـاوی خۆیـان دەیبینـن، لێـرەدا مرۆڤـی

بێباوەڕ هیچی بۆ نامێنێتەوە و دان بەو ڕاستی‌یەدا دەنێت و دەڵێت، ﴿قَالُوا يَا وَيْلَنَا مَن بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا هَذَا مَا وَعَدَ الرَّحْمَنُ وَصَدَقَ الْمُرْسَلُونَ﴾ (یس، ٥٢)، واتە: تیاچوون بۆ ئێمە بێت ئەوە کێیە ئێمەی ئاوا لە گۆڕەکانمان دەرهێنا و زیندووی کردینەوە، بەڕاستی ئەمە ئەوەیە کە پەروەردگار بەڵێنی پێدابوین و پەیامبەرەکان ڕاستیان فەرموو، ئەمە پەشیمان بوونەوەیەکە لە کاتێکدا کە پەشیمان بوونەوە هیچ سوودێکی نی‌یە.

## کورتەی باس:

بەڕاستی ئەم فەرموودانەی پێغەمبەر (ﷺ) موعجیزەیەکی گەورەن کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا ڕاستی‌یەکانیان دۆزراونەتەوە، لێرەدا پرسیارێك دێتە مێشکمانەوە کە ئایا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لە پێش ١٤٠٠ساڵ باسی بابەتێکی زانستی ئاوەها دەکات کە لەلای هیچ کەسێك و هیچ زانستێکی ئەو ڕۆژگارەدا نەناسرا بوو؟ باشە دەبێت ئەم پێغەمبەرە لە کوێوە ئەم ڕاستی‌یە زانستی‌یەی هێنا بێت؟ مەگەر ئەم پێغەمبەرە بە وەحی لە لایەن خودای دروست کەر و زانا بە هەموو نهێنی‌یەکانی بوونەوەرەوە ئەمەی بۆ هاتبێت.

بۆ وەڵامی پرسیارەکەی سەرووتریش دەڵێین: خودای زانا بە هەموو ڕووداوەکان تا ڕۆژی دوایی بەم زانینە فراوانەی خۆی دەیزانی کە ڕۆژێك دێت مرۆڤەکان دەگەنە نهێنی‌یەکانی زانستی کۆرپەلەزانی‌و و بۆیان ڕوون دەبێتەوە کە مرۆڤ لەم شریتی سەرەتایی‌یەوە (کلێنچکە)وە دروست دەبێت، هەر ئەمیشە کە هانی خانەکانی لەش دەدات بۆ دروستکردنی ئەندامەکانی لەش و پسپۆڕ کردنیان بەکارەکانیانەوە، و خۆیشی دەبێتە هۆی دروست کردنی زۆربەی ئەندامەکانی لەش، هەروەها پەروەردگاریش دەیزانی کە مرۆڤەکان دەگەنە ئەو ڕاستی‌یەش کە بەشێکی ئەم کلێنچکەیە هەرگیز نافەوتێت و دەمێنێتەوە (لەڕۆژی دواییشدا مرۆڤەکانی لێوە زیندوو دەبێتەوە).

هەر بۆیە ئەم نیگایەی ناردووە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و بە ئیلهام خستوویەتی‌یە دڵی پیرۆزی‌یەوە بۆ ئەوەی لە فەرموودەکانی‌دا ئەم ڕاستی‌یەمان بۆ ڕوون بکاتەوە،

و ئەم بابەتە ببێتە بەڵگەیەك لەسەر راستیی پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ)، و راستیی وەرگرتنی فەرموودەكانی لە پەروەردگاری بالاً دەستەوە، هەروەها بۆ سەلماندنی گونجاویی ئەم پەیامەیە بۆ هەموو سەردەم و رۆژگارێكی مرۆڤەكان تا رۆژی دوایی، و دووبارەش بۆ سەلماندنی یەكگرتنەوەی راستی‌یە زانستی‌یە سەلمێنراوەكانی ئەمڕۆ لەگەڵ فەرموودەكانی قورئان و سوننەتی پیرۆزدا (و صدق رسول الله (ﷺ)).

هەتاوەكو زانستی مرۆڤەكانیش بەرەو پێش بچێت بەڵگەی زیاتر دەدۆزرێتەوە لەسەر ئیعجازی قورئان و سوننەتی پیرۆز.

  

## سەرچاوەكان:

١-صحيح البخاري.

٢-صحيح مسلم بشرح الإمام النووي.

٣-گۆڤاری (الإعجاز): ژمارە١ی صفری ١٤١٦/ یۆلیۆی ١٩٩٥، گۆڤارێكی وەرزی‌یە دەردەچێت لە لایەن: (هيئة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة).

٤-برنامج (الشريعة والحياة) لقناة الجزيرة: مقابلة مع الشيخ عبدالمجيد الزنداني بتاريخ: ٢٠٠٤/٢/٢٤.

٥-ئینتەرنێت، سایتی: IslamOnline.net.

6- Langman's Medical Embryology – fifth edition -T. W. Sadler.



# ناوچەوان و کاری ناوچەوانەپل لە مێشکدا ...

# {لێکۆڵینەوەیەکی ئیعجازیی سوورەتی (العلق)}

له قورئاندا پێشەسەر یان ناوچەوان (الناصية) کە بریتی‌یە لە بەشی پێشەوەی کەللەی سەر، باس کراوە لە دوو ئایەتی سوورەتی (العلق)دا:

ئایەتی یەکەم ناوچەوانی مرۆڤی بەستۆتەوە بە کۆنترۆڵی بڕیار دەرکردن لە مرۆڤدا، کە دەفەرموێت: ﴿كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ﴾ (العلق:١٥)، واتە: ئەگەر ئەو بێباوەڕەی (کە ئیماندارانی لە پەرستنی خودا پەشیمان دەکردەوە) واز لەو کارەی نەهێنێت ئەوا ئێمە بەهۆی ناوچەوانی‌یەوە سزای دەدەین.

ئایەتی دووەم وەسفی ناوچەوان خۆی کردووە بەوەی کە درۆزن و تاوانبارە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ﴾ (العلق:١٦)، واتە: ناوچەوانەکەی درۆزن و تاوانبارە.

لە ئایەتێکی سوورەتێکی تری قورئاندا پەروەردگار وەسفی ناوچەوانی بەوە کردووە کە شوێنی سەرکردایەتی کردنی هەموو ئەندامەکان و کارەکانی لەشی مرۆڤە و بەڕێوەبەریانە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُم مَّا مِن دَابَّةٍ إِلَّا هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا إِنَّ رَبِّي عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ (هود:٥٦)، واتە: من پشت بە پەروەردگاری خۆم و ئێوەش دەبەستم، هەموو گیانەوەرێك ناوچەوانی (پێشەسەری) لە ژێر جڵەوی ئەودایە و بە فەرمانی ئەو دەڕوات بەڕێوە، ئەو خودایەی کە خاوەنی ڕێی ڕاستە.

## ڕاڤە (تەفسیری) ئایەتەکان:

دوای گەڕانەوە بۆ وتەی موفەسیرە بەناوبانگەکانی قورئان، بۆمان روون دەبێتەوە کە ئەم ئایەتە پیرۆزانە ئاماژە بەم ڕاستی‌یانە دەدەن:

١- وەسف کردنی ناوچەوان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بە درۆکردن و هەڵەکردن، مانای (نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ) وەك لە (زاد المسير في علم التفسير)ی (إبن الجوزي)دا هاتووە: كاذبةٌ في قولها خاطئةٌ في عملها، واتە: درۆزنە لە وتەکانی‌دا و تاوانبارە لە کردەوەکانی‌دا، لەمەوە بۆمان روون دەبێتەوە کە توانای کۆنترۆڵ کردنی وتەکان بەوەی کە ڕاست یان درۆ بڵێین، و توانای کۆنترۆڵ کردنی کردەوەکان بەوەی کە ڕاست یان هەڵە بجووڵێینەوە، بریتی‌یە لە وەسفێکی بەردەوام بۆ ناوچەوانی مرۆڤ.

ئەم وەسفانە کە بۆ ناوچەوان هاتووە (کە بریتی‌یە لە بەشی پێشەوەی سەر) بە مانا پەتی‌یەکەی وەرناگیرێت کە بریتی بێت لە بەشی پێشەوەی ئێسکی کەللەی سەر، چونکە لەدوای گەڕانەوە بۆ زانستی توێکاری لەشی مرۆڤ دەبینین کە بەشی پێشەوەی سەری مرۆڤ پێك هاتووە لە ئێسکێك کە بەشێکە لە ئێسکەکانی کەللەی سەر و پێی دەوترێت ناوچەوانە ئێسك (العظم الجبهي **Frontal bone**) کە ئەم ئێسکە بەشێك یان پلێکی مێشکی پاراستووە و شاردۆتەوە کە پێی دەوترێت ناوچەوانەپل (الفص الجبهي **Frontal Lobe**)*، لێرەوە دەتوانین



بڵێین کە ناوچەوان وەك چۆن بە ئێسکی پێشەوەی کەللەی سەر دەوترێت بە هەمان شێوە بەو بەشەی مێشکیش دەوترێت کە دەکەوێتە پشتی‌یەوە، و هەر ئەم بەشەی مێشکیشە کە دەتوانرێت ئەو وەسفانەی پێشتر باسمان کرد بدرێتە پاڵی بە شێوەیەکی تەواو، لەمەوە بەروونی دەگەینە مانا ئاشکراکەی ئایەتەکان بەبێ ئەوەی لە یاسا راستەکانی راڤە ولێکدانەوە دەرچین و بە ئاشکرا بۆمان دەردەکەوێت کە ئایەتەکان مەبەستیان لە ناوچەوانە پلی مێشکی مرۆڤە، کە کۆنترۆڵی هەموو کارەکان و چالاکی‌یەکانی لەش دەکات.

---

* مێشکی مرۆڤ (وەك زانستی توێکاری بۆمان باس دەکات) لە شەش بەش پێك دێت کە بەهەریەکێکیان دەوترێت (پل)، کە ئەمانەن: پلی پێشەوە یان ناوچەوانەپل، پلی دواوە، چوار پل (دوو جووت)ی لاتەنیشت لەملاو لاوە.

لە قورئانی پیرۆزدا لە زۆر شوێندا ئەم مانا خواستنە (مەجازە) بەکارهاتووە، بەهاوشێوەی ئەو ئایەتانەی سەرەوە ناوێك یان دەستەواژەیەك بەکارهێنراوە و وەسفێکی دراوەتەپاڵ کە مەبەستی سەرەکی ئەو ناوە نییە لەو وەسفەدا، ئەوەتا خوای گەورە لە سوورەتی (یوسف)دا دەفەرموێت: ﴿وَ اسْأَلِ الْقَرْيَةَ الَّتِي كُنَّا فِيهَا وَ الْعِيْرَ الَّتِي أَقْبَلْنَا فِيهَا (٨٢)﴾، واتە: پرسیار بکە لەو دێیەی کە تێیدا بووین و لەو کاروانەی لەگەڵیدا هاتین، ئاشکرایە کە ئەم پرسیارە لە خانووەکانی دێکە و لە ووشترەکانی کاروانەکە ناکرێت، بەڵکو لەو کەسانە دەکرێت کە لە دێکەدان و لەگەڵ کاروانەکەدان.

هەر بەم شێوەیە مەبەست لە ناوچەوان (ناصیة) لەو ئایەتانەی سەرەوەدا، و لەو فەرموودەیەی پێغەمبەردا (ﷺ) کە کاتێك لە خودا دەپاڕایەوە دەیفەرموو: ﴿ناصِيَتي بِيَدِكَ﴾ واتە: ئەی پەروەردگار ناوچەوانی مل لەژێر دەستەلاتی تۆدایە، مەبەست لەو ناوچەوانەی کە لە ژێر دەسەلاتی خوادایە و کۆنترۆڵ و ڕێنومایی گیاندارەکان دەکات (لە سەروو هەموویانەوە مرۆڤ)، دەبێت ئەو بەشەی مێشك بێت کە دەکەوێتە دواوەی ئێسکەکەوە، چونکە سیستمی تایبەت بە بەڕێوەبردن و کۆنترۆڵ کردنی هەموو ئەندامەکان و چالاکییەکانی زیندەوەرەکان بریتییە لە مێشك و کۆئەندامی دەمار، لە سەرەنجامی ئەم لێکدانەوانەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە فەرموودەکانی سەرەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە کە ئەو ناوچەوانەی کە بەشی پێشەوەی مێشك لەخۆ دەگرێت شوێنی سەرکردایەتی کردن و کۆنترۆڵ و تەوجیهکردنی هەڵس وکەوت و کردەوەکانی مرۆڤە.

٢- ئازادی و سەربەخۆیی لە هەڵبژاردندا بۆ مرۆڤ دابین کراوە، و بەستراوەتەوە بە ناوچەوانی مرۆڤەوە، واتە بە ناوچەوانە پلی مێشکەوە، مرۆڤ تەنیا دروستکراو و زیندەوەرێکە کە دەتوانێت کۆنترۆڵی هەڵس و کەوتی خۆی بکات بەپێی بنەماکانی هەڵسەنگاندنی هەڵس وکەوت لە ووتە و کردارەکانیدا، وەك: ڕاستگۆیی و درۆکردن، ڕاست و هەڵە، بۆیە خودا دەفەرموێت: (لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ) واتە: ئەگەر واز نەهێنێت لەوەی دەیڵێت و دەیکات، ئەوا ئێمە لە

ناوچەوانی‌یەوە بە شێوەیەکی زۆر توند رایدەکێشین و سزای دەدەین، لەوانەیە ئەمە هەڕەشە بێت بە لێکردنەوە یان پەڕاندنی ناوچەوان، چونکە (سفع) بریتی‌یە لە راکێشان بە هێزێکی زۆر.

## راڤەی ئایەتەکان لە رووی زانستی‌یەوە:

ئەوەی کە باسمان کرد بریتی بوو لەو راستی‌یانەی لە لێکدانەوەی دەقەکانەوە وەریدەگرین، با بزانین زانستی نوێ دەربارەی ناوچەوانی مرۆڤ و ئاژەڵ چی دەڵێت؟

زانستی نوێی ئەمڕۆ زۆر راستیی دەربارەی ناوچەوانە پل و مێشکی مرۆڤ دەرخستووە، دەتوانین لەم خاڵانەدا باسیان بکەین:

١- **مێشک (دماغ)ی مرۆڤ گەورەترینە:** لە رووی توێکاری‌یەوە مێشکی مرۆڤ گەورەترین قەبارە و کێشی هەیە لە مەملەکەتی ئاژەڵدا بە بەراورد لەگەڵ کێشی لەشی‌دا.




٢- **بەشی پێشەوە (ناوچەوانە پل)ی مێشک گەورەترین بەشە:** وەک باسکرا مێشکی مرۆڤ لە ٦ پل پێکدێت (بڕوانە وێنەی ١)، هەروەک لە وێنەکەوە دەبینین و ئیشارەت کراوە ناوچەوانەپل گەورەترین بەشی مێشکە.

٣- **توێکڵی مێشک بریتی‌یە لە زۆرترین قەبارە یان بارستەی دماغ:** دەماغ یان کۆئەندامی دەماری مرۆڤ زۆرترین بەشی بریتی‌یە لە مێشک (المخ Cerebrum)، مێشکیش زۆرترین بەشی پێکهاتووە لە توێکڵەکەی دەرەوەی (قشرة المخ

Cerebral Cortex)، زۆرترین بەشی توێکلی مێشکیش دەکەوێتە ناوچەی ناوچەوانە پلەوە، و بە تایبەتی ناوچەکانی: پێش ناوچەی جووڵە (المنطقة قبل الحركية Premotor Area) و ناوچەی جووڵەی یارمەتیدەر (المنطقة الحركية الإضافية Supplementary Motor Area).




لە زۆربەی ئاژەڵەکاندا توێکلی مێشکیان زۆربەی بۆ بۆنکردنە، بڕوانە جیاوازی مێشکی مرۆڤ و هەندێک ئاژەڵی تر

٤- توێکلی مێشکی مرۆڤ زۆر گەورەتر و فراوانترە لەچاو ئاژەڵدا: مێشکی مرۆڤ زۆر جیاوازە لە مێشکی ئاژەڵ لە رووی شکڵەوە، دەبینین کە رووبەری توێکلی مێشکی مرۆڤ زۆر فراوانترە بە تایبەتی لەناوچەی پێشەوەدا و قەبارەشی گەورەترە، لە زۆربەی ئاژەڵەکاندا ناوچەی پێشەوەی مێشك (واتە ناوچەوانەپل) زۆری لە توێکلی بۆنکردن پێك هاتووە، کە لە مرۆڤدا بۆنکردن بەشێکی زۆر کەم لەم پلە پێك دێنێت ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ بەشە گەورەکانی تری ناوچەوانەپلدا (بڕوانە وێنەی ٢).

٥- ئەو بەشەی مێشك کە کۆنترۆڵی کردارە خۆرسکەکان دەکات لە ئاژەڵدا زۆر گەورەترە لە هی مرۆڤ: کردارە خۆرسکەکان (الأعمال الغريزية) زۆربەی چالاکییەکانی ئاژەڵ پێك دێنێت، بۆیە دەبینرێت کە ئەو بەشەی مێشك کە کۆنترۆڵی ئەم کردارە خۆرسك و خۆنەویست و وەڵامدانەوانە (الأفعال الإنعكاسية Reflexes) دەکات کە بریتییە لە ناوچەی (Limbic Cortex)ی مێشك، زۆرترین بەشی مێشکیان پێك دێنێت، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کۆنترۆڵی کردارەکان لە لای ئاژەڵەکان بەهۆی کردارە خۆرسك و وەڵامدانەوەکانەوە

دەبێت، بە پێچەوانەی مرۆڤەوە کە کردارەکان و هەڵس وکەوتی لەژێر کۆنترۆڵی ئاگاداری و ویستی خۆیەتی، و لەلایەن رووبەرێکی فراوانی توێکڵی مێشکەوە بەڕێوە دەبرێت.




ناوچەکانی مێشك بۆ کۆنترۆڵ کردنی هەڵبژاردن و دروستکردنی ووتەکان پێش ووتنیان دەردەخات.

٦- کرداری دروست کردنی ووتەکان دەکەوێتە ناوچەوانە پلەوە؛ کۆنترۆڵی هەڵبژاردن و دروست کردنی ووشەکان و ئامادە کردنیان بۆ ووتن لە وێنەی ژمارە (٣)دا دەردەکەوێت، کە دەبینین سەرەتا لە ناوچەی گری گۆشەیی مێشکەوە (التليف الزاوي) ووشەکان هەڵدەبژێردرێن، پاشان کرداری دروستکردنی ووشە یان دەستەواژە ووتراوەکان لە ناوچەی برووکا (منطقة بروكا Broca's area) لە مێشکدا دەبێت، کە ئەم بەشە دەکەوێتە ناوچەوانە پلەوە لە پێشەوە و بەرئەمی بەشی خوارووی توێکڵی جوولەی مێشکدا (القشرة الحركية Primary Motor Cortex)، لەم توێکڵەی جوولەوە لە مێشکدا (کە ئەمیش هەر دەکەوێتە ناوچەوانە پلەوە) کۆنترۆڵی هەموو جوولەیەکی لەش دەکرێت و فەرمانیان بۆ دەردەکرێت، فەرمان لێرەوە دەردەچێت بۆ ئەندامەکانی قسەکردن بۆ ئەوەی ئەو ووشانەی هەڵبژێردراون بووترێن.

ئەمە بۆمان روون دەکاتەوە کە کلیلی کۆنترۆڵ کردنی ووتەکانمان دەکەوێتە ناوچەوانە پلی مێشکەوە، هەروەها بۆشمان روون دەکاتەوە کە مەرج نی یە هەموو ووشەیەك کە دێت بە مێشکماندا ئێمە بیڵێین، هەر بۆیە مرۆڤ

بەرپرسیارە و لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت لەسەر ووشەکانی کە بە زمانی دەیڵێت، چونکە دەتوانێت کۆنترۆڵی ووتەکانی و ئەندامەکانی قسەکردنی بکات، (لەسەروو هەموویانەوە زمان)، هەر بۆیە پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ) لە فەرموودەیەکیدا ئاماژەی بۆ ئەم راستی‌یە داوە کە کاتێك ئامۆژگاری هاوەڵێکی دەکرد، زمانی خۆی گرت و پێی فەرموو: ﴿ أمْسِكْ عَلَيْكَ هَذا ...﴾ الحديث، واتە: زمانی خۆت بگرە لەبەر ئەوەی بەرپرسیاری لەسەر ووتەکانت.

**٧- کۆنترۆڵ و ئاراستە کردنی خۆویست بۆ گێرانی سەر بۆ سەیرکردن بە ئاراستەیەکی دیاری کراو دەکەوێتە ناوچەوانە پلەوە:** هەر لە ناوچەوانە پلدا ناوچەیەك هەیە کە هاوشێوەی (ناوچەی برووکا)یە و تایبەتە بە جووڵاندنی چاوەکان، و لەسەروو ئەمیشەوە ناوچەیەکی تر هەیە کە سەر دەجووڵێنێت بەشێوەیەکی بازنەیی، هەردوو ئەم ناوچەیە بە یەکەوە هەڵدەستن بە ئاراستەکردن و تەرکیز کردنی بینین بە لایەکی دیاری کراودا بە شێوەیەکی خۆویست، ئەم دوو ناوچەیەن کە ناوچەی تونکلی بینین ئاگادار دەکەن بۆ وەرگێرانی سەر بەلایەکی دیاری کراودا، و تەرکیز کردنی بینین لەسەری، کەواتە لەمەوە بۆمان دەرکەوت کە ئاراستەکردنی خۆویستانەی بینین بۆ شتێکی دیاری کراو دەکەوێتە ناوچەی ناوچەوانە پلەوە، ئەمەش یەکدەگرێتەوە لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) ئامارەی پێداوە لەو فەرموودەیەی کە باسی تاوانباریی سەیرکردن و روانینە ئافرەتی بێگانە دەکات، کاتێك کە بە ئیمامی عەلی (رەزای خوای لێبێت)ی فەرموو: ﴿يا علي لا تُتْبِعِ النَّظْرَةَ النَّظْرَةَ فإنَّما لكَ الأولَى و ليستْ لكَ الآخِرَةَ﴾ رواه الترمذي و قال: حديث حسن، واتە: ئەی (عەلی) کاتێك بە رێکەوت چاوت بە ئافرەتێکی نامەحرەم کەوت، جارێکی تر سەیری مەکەرەوە، چونکە یەکەم جارت لەسەر نانووسرێت بەڵام دووەم جار تاوانێکە لەسەرت.

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: ﴿النَّظْرَةُ الأُولَى لَكَ و الآخِرَةُ عَلَيكَ﴾ رواه الطحاوي و هو حديث حسن، واتە: بینینی یەکەم بۆ تۆیە و بینینی دووەم لەسەرتە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە بینینی یەکەم بەدەست خۆت نی‌یە کە چاوت دەچێتە سەر

شتێك، بینینەوەی ئەو شتەیە بۆ جاری دووەم كە لە سەرت دەنووسرێت، چونكە ئەم جارە بە ویستی خۆتە و خۆت ئاراستەی چاوەكانت كردووە.

**٨- كـۆنترۆڵ كردنـی خۆویسـتانەی جووڵـەی هـەموو پارچـەكانی لـەش دەكەوێتـە ناوچـەوانە پلەوە؛** توێژینـەوەكان سـەلماندوویانە كـە هـەردوو ناوچـەی: تـوێكڵی جووڵەی سەرەتایی (القشرة الحركیة الأولیة Primary Motor Cortex) و ناوچەی پێش ناوچەی جووڵە (المنطقة قبل الحركیة Premotor Area) لە مێشكدا بریتین لە دەستپێكەری جووڵە لە لەشدا، و پرۆگرامە تایبەتی‌یەكان لەو بوارەدا هەڵدەگرن و خەزن دەكەن.

پـلان دانـان بـۆ هەسـتان بـە جووڵەیـەكی تایبـەت لێرەوە دەبێـت، ئـەویش بـە ئاراستە كردنی كۆمەڵێك لە ماسولكەكان بۆ ئەوەی بە كارێكی خۆویست هەستن، لێـرەوە ئـەوە تێدەگـەین كـە هـەروەك قسـەكردن و هەڵبـژاردنی ووشـەكان و جووڵاندنی سەر و چاو، هەر توێكڵی ناوچەوانەپلە كە پسپۆڕە بە كۆنترۆڵ كردنی خۆویستانە و كردن یان نەكردنی جووڵەیەكی دیاری كراو، كە پێویست دەكات هەندێك یان هەموو پارچەكانی لەش بە هۆیەوە بجووڵێنرێت.

**٩- هـاوئـاهەنگـی لـە نـێوان كـرداری قسـەكردن و جووڵـەی لـەش دەكـەوێتـە (نـاوچەوانە پلـەوە)؛** لەبـەر ئـەوەی ناوچـەوانە پـل ناوچـەی جووڵـەی یارمەتیـدەر (المنطقة الحركیة الإضافیة Supplementary Motor Area) و ناوچـەی جووڵەی سـەرەتایـی (المنطقـة الحركیـة الأولیـة)ی تێـدایـە، ئـەمـە ئاماژەیە بۆ ئەو هاوسەنگی‌یەی كە لە نێوان ناوچەی (برووكا)ی كۆنترۆڵكەری قسەكردن، و ناوچـەكانی كـۆنترۆڵ كردنـی جووڵـەی سـەر و چاوەكان، و ناوچەی كۆنترۆڵكەری هـەموو جووڵـەكانی تـری لەشدا هەیە، ئەمە دەبێتـە هـۆی كـۆنترۆڵ كردنـی هـەموو جووڵە خۆویستەكانی لەش.

لەهـەمان كاتیشـدا سـەلمێنەری ئـەو راسـتی‌یەیە كـە هاوئاهـەنگی لـەنێوان كردارەكـانی قسـەكردن، و سـەیركردن و جووڵـە جیاوازەكـانی لـەش، هـەمووی دەكەوێتە ناوچەوانەپلەوە (وێنەی ٤).




١٠- توێکلی مێشك لە ناوچەوانە پێدا کۆنترۆڵی هەموو هەڵس و کەوت و سلوکێکی مرۆ دەکات؛ بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە ئەگەر بڕوانینە مێشکی ئاژەڵان دەبینین کە نەبوونی زۆربەی توێکلی مێشك لە ناوچەوانەپێدا و بچووکی ئەم ناوچەیە لە ئاژەڵدا کە تەنها تایبەتە بە بۆنکردنەوە، ڕەنگدانەوەکەی دەرکەوتووە لە هەڵس و کەوتی ئاژەڵاندا، بینراوە کە هەستی بۆنکردن دەبێتە هۆی جوولاندنی ڕاستەوخۆی هەڵس و کەوتی سێکسییان، و هەڵس وکەوتی خۆراکیی، و جووڵەکانی تر تێیاندا.

بەڵام سەبارەت بە مرۆڤ دەبێت چەندین بۆچوون و ئیعتیباری تایبەتی هەبێت کە لەگەڵ ئەو زانیارییانە و کارە غەریزییانەی کە لە توێکلی مێشکدا هەڵگیراو یەکبخرێن بۆ ئەوەی سەرەنجام ببنە هۆی جوولاندنی هەڵس وکەوتی سێکسی یان خۆراکی یان هەر هەڵس وکەوتێکی تر لەگەڵ دروست کردنی ئەو جووڵانەی لە کاتانەدا ڕوودەدەن، وەك: جووڵەی دەستەکان یان قاچەکان، یان جووڵەی چاوەکان بۆ بینین، و زمان بۆ قسەکردن، کەواتە لێرەوە دەگەینە ئەوەی کە هەڵبژاردنی هەستان بە کارێك یان هەڵنەستان پێی دەکەوێتە ناوچەکانی جووڵە خۆویستەکان

، ناوچەوانەپلدا کە خاوەنی زۆرترین رووبەری توێکڵی مێشکی مرۆڤە (هەروەک
اماژەمان پێ‌یدا).

## لە نێوان هەڵس و کەوتی خۆڕسك (السلوك الغريزي)، و هەڵس و کەوتی وەرگیراو (السلوك المكتسب)دا:

دەتوانین بە چەند زاراوەیەك کە دەگونجێت لەگەڵ سەردەمی کۆمپیوتەردا،
ەسفی هەڵس وکەوتی خۆڕسك بەو بەرنامە ناوخۆیی‌یانەی کۆمپیوتەر دابنێین،
ـە ئامێرەکە خۆی لێ پێکهاتووە و بەهۆیانەوە کاردەکات، و چەند ئاگادار
ەرەوەیەکی تایبەت دەیجوولێنێت، هەڵس وکەوتی وەرگیراویش ئەو بەرنامە
ۆمپیوتری‌یە دەرەکی‌یانەن کە لەسەر کۆمپیوتەرەکە بە بەردەوامی دا دەبەزێنرێن.

هەڵس و کەوتی غەریزی بە ئاشکرا لە هەڵس و کەوت و کردارەکانی ئاژەڵدا
ەردەکەوێت، کە بۆ نموونە (هەروەک پێشتر باسکرا) هەستی بۆنکردن دەبێتە هۆی
ـوولاندنی راستەوخۆی هەڵس وکەوتی سێکسی و هەڵس وکەوتی خۆراکیی، و
ـەروەها چالاکی‌یە جوولەیی‌یەکانی پەیوەست پێ‌یانەوە، بەڵگەش لەسەر ئەمە
ـەورەیی قەبارەی توێکڵی مێشکە لە ناوچەی (Limbic Cortex) لە هەموو
ژەلاندا، کە ئەوە دەسەلمێنێت: کۆنترۆڵی کارە جوولەیی‌یەکانی ئەندامەکانی
ـشی ئاژەڵ زوربەی بە شێوەیەکی خۆڕسك و غەریزی یان وەك وەلامدانەوەی
ـکسەری‌یانە دەبێت.

هەروەها تاقی‌کردنەوەکان سەلماندوویانە کە پاڵنەری پشت کردارەکانی ئاژەڵ
ـەریزە یان فیطرەیە، کە ئەمانە وەك چەند زانیاری‌یەکی هەڵگیراون لەناوچەی
(Limbic Cortex)دا، و هەندێك کارتێکەری دەرەکی وەرگیراوە لەژینگەوە
ـوانەیە کاری تێ‌بکات، نموونە بۆ ئەمەش ئەوەیە کە کاتێك هەندێك لە
ـێژەرەوان چەند مشکێکیان لە تاریکی‌یەکی تەواودا گەورە کرد هەر لە
ـدایکبوونیانەوە، کاتێك کە یەکسەر خستیاننە بەر رووناکی توانای ئەم مشکانە
ـ جیاکردنەوە و ناسینەوەی تەنەکان بەهەمان ووردی و دیقەتی ئەو مشکانە بوو

که هەر لە لەدایك بوونیانەوە لە رووناکی و لە بارێکی ئاسایی‌دا گەورە کرابوون، ئەمە لەبەر ئەوەیە کە زانیاری‌یە غەریزی‌یەکان هاندەری سەرەکی ئاراستەکەری هەڵس و کەوتی ئاژەڵە و ویستیان نی‌یە لە کارەکانیاندا.

سەبارەت بە هەڵس و کەوتە وەرگیراوەکانیش، ئەمانە ئەو هەڵس و کەوتانەن کە زانیاری‌یە وەرگیراوەکان لە دەوروبەرەر و ژینگەوە ئاراستەی دەکەن، ئەگەر سەیری تونکلی مێشکی مرۆڤ بکەین، دەبینین ناوچەکانی بەستنەوەی بەشەکان و پلەکان (مناطق الربط Association Areas) لەبەرئەوەی کۆنترۆلێکی گەورەیان هەیە، و هەڵدەستن بە بەکارهێنانی زانیاری‌یە هەستی‌یەکان، بۆیە رۆڵێکی گەورەیان هەیە و توانایەکی ئێجگار زۆر دەدەن بە مرۆڤ بۆ فێربوون، ئەوەتا مرۆڤ ئەندازەیەکی زۆر لە زانیاری وەردەگرێت لە تاقی‌کردنەوە هەرەمەکی‌یەکانی ژیانەوە، و هەروەها لە پرۆسەی پەروەردە و فێرکردنیشەوە، کە ناوچەکانی: (بەیەکەوە بەستنەوەی پلەکانی لاتەنیشتەکان و دواوەوەی مێشك) لە لا زاڵەکەی مێشکدا (Categoric or Dominant hemisphere)* بەرپرسی سەرەکی‌یە لە پرۆسەی فێربوونی زمانەکان لە رێی هەستەکانی بیستن و بینینەوە، پاشان ئەم زانیاری‌یە وەرگیراوانە لە ووتە و هەموو پەیوەندی‌یە بینراوەکان لە رێی ناوچەکانی گۆشەی پێچاوپێچەوە (The Angular gyrus) و چەپکی (گورزەی) شکاوەوە (Arcuate fasciculus) دەگوێزرێتەوە بۆ ناوچەی برووکا (کە هەڵدەستێت بە دروست کردنی ووشە ووتراوەکان) لە ناوچەوانە پلی مێشکدا.

هەروەها وەلامە ووتراوەکانیش دیسانەوە لە رێی گورزەی شکاوە و لە ناوچەی ڤێرنیکی (Wernike's Area)وە کە بەرپرسە لە تێگەیشتنی زانیاری‌یە بیستراو و بینراوەکان دەگوێزرێنەوە بۆ هەمان ناوچەی برووکا کە

---

* مێشکی مرۆڤ لە دوو لای سەرەکی پێك دێت: لای راست یان نیوەی راست (Right hemisphere) و لای چەپ (Left hemisphere)، لە هەموو مرۆڤێکدا لایەکیان زاڵ دەبێت بەسەر لاکەی تردا، لەو کەسانەی کە لای چەپیان زیاتر بەکاردێنن (چەپلەرن) لای راستی مێشکیان زاڵە، لەو کەسانەشی کە لای راستیان زیاتر بەکاردێنن لای چەپی مێشکیان زاڵە.

دەکەوێتە بەردەم تـوێکڵی جووڵـەوە کـە وەك باسمـان کـرد کـۆنترۆڵی هـەموو ئەندامەکانی قسەکردن دەکات (بڕوانەوە وێنەی ژمارە ٢).

لێرەوە دەبینین کە هەموو زانیاری‌یە وەرگیراوەکان و تێگەیشتووەکان لە پرۆسەی فێربوونەوە، لە ڕێی بیستن و بینینەوە دەگوێزرێنەوە بۆ ناوچەی کۆنترۆڵکردنی کۆتایی ووتەکان و کردارەکان لە ناوچەوانە پلدا، ئەمەش بۆ ئەوەی بەکار بهێنرێن بۆ ووتنی ووتە و زاراوەی گونجاو و هەستان بە هەڵس وکەوتی گونجاو لەسەر بارێکی تایبەتی‌دا.

ئەمانەی لە سەرەوە باسمان کرد بۆمان دەسەلمێنێت کە هەڵس و کەوتی مرۆیی وەك هەڵس و کەوتی ئاژەڵی نی‌یە، کە تەنیا غەریزە پاڵنەری بێت بەڵکو زانیاری و پسپۆری‌یە وەرگیراوەکان لە دەوروبەرەوە کۆنترۆڵ و ئاراستەیان دەکەن، هەر بۆیە هەڵس و کەوتی مرۆیی وەرگیراو ڕووبەڕووی گۆڕان و گەشەکردن دەبێتەوە، لەلایەکی ترەوە و بە پێچەوانەی هەڵس و کەوتی خۆڕسکی ئاژەڵەوە مرۆڤ توانای دروست کردنی گۆڕانکاری هەیە لە هەڵس وکەوتی‌دا، لەسەر بنەمای تایبەتێتی لە هەڵبژاردنی زانیاری و دەست کەوتنی شارەزایی‌دا، و کۆنترۆڵکردنی هەڵس و کەوتەکانی بە پێی چەند بنەما و ئەساسێکی وەرگیراوە، کە ئەگەر خێر بێت خێردەکات و ئەگەر شەڕ و خراپە بێت خراپە دەکات.

قورئانی پیرۆزیش ئەم ڕاستی‌یەی سەلماندووە و وەك یاسایەکی گشتی و سوننەتێکی بەردەوام باسی کردووە: ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ﴾ (الرعد:١١)، واتە: پەروەردگار هیچ کاتێك باری کۆمەڵێك ناگۆڕێت، تا سەرەتا خۆیان هەڵس وکەوتی خۆیان نەگۆڕن، هەروەها قورئان ئاماژەی بەوە داوە کە زانیاری‌یە بیسترا و بینراو و هەست پێکراوەکان بەدڵ هەموویان دەچنە خانەی کۆنترۆڵ کردنی هەڵس وکەوتی مرۆڤ و بڕیاردانی‌دا، کە لە مانەوە بەرپرسیارێتی بەرامبەر بە کردارەکان دروست دەبێت: ﴿إِنَّ السَّمْعَ وَ الْبَصَرَ وَ الْفُؤَادَ كُلُّ أُولَـئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً﴾ (الإسراء: ٣٦)، واتە: بیستن و بینین و ناودڵی مرۆڤ هەموویان مرۆڤ لێیان بەرپرسیارە (چونکە دەبنە کارتێکەری هەڵس و کەوتی مرۆڤ و دروست

کردنــی بەرپرســیارێتی)، ئەمــەش بــە تــەواوەتی یــەك دەگرێتــەوە لەگــەڵ ئــەو ڕاستی‌یانەی لەم بارەیەوە باس کران.

مرۆڤ لە دەوروبەر و ژینگەکەیەوە ئەو زانیاری‌یانە وەردەگرێت کە دەبنە هۆی ئاراســتە کردنــی هــەڵس و کــەوت و کردەوەکــانی، یــان لــە ڕێی بەرنامــە پەروەردەیی‌یەکانی پشت بەستوو بە دین و ڕەووشت، کە دەبنە گەورە بوونی ئەو کەســە لەســەر هــەڵس و کــەوتێکی ڕاســت و کردەوەیــەکی دروســت لەســەر بنــەما ڕاستەکانی ئیسلام، و دامەزراندنی ئەو بەها بەرزانە، و ڕەووشتە باشانە لە توێکڵی مێشکی‌دا، کە هیچ پێچەوانەش نی‌یە لەگەڵ ئەو زانیاری‌یە فیطری‌یانەی لەسەری دروست بووە.

یــان ئەوەیــە زانیاری‌یــەکانی لــە چــەند سەرچــاوەیەکەوە وەردەگرێــت کــە لــە بەرنامەکانیانــدا هــیچ حیســابێك بــۆ لایــەنی دینــی و ئــەخلاقی ناکــەن، لێرەوە تــاك لەســەر بــەگوێکردن و شــوێنکەوتنی ئــارەزوو و غــەریزەکانی گــەورە دەبێــت لــەژێر ناونیشانی ئازادی تاکەکەسی، زۆر جار ئەم مرۆڤە هەڵس و کەوتی خوار و خراپتر لــە هــەڵس و کــەوتی ئاژەڵــەکانیش دەنوێنێــت، توێژینــەوە زانســتی‌یەکان ئــەم ڕاستی‌یەیان سەلماندووە، بینراوە ئەو کۆمەڵگایانەی کە پرۆگرامەکانی پــەروەردە و فێرکردنیــان لایــەنی ڕۆحــی پشــتگوێ دەخــەن، و گرنگــی بــە بنــەما ئاینی‌یــە پێویستەکان نادەن بۆ ئاراستە کردن و چاککردنی هــەڵس وکــەوتی مــرۆڤ، تاکــەکان لەم کۆمەڵگایەدا پێدەگەن کە غەرائیز و بنەما ماددی‌یەکان کۆنترۆڵ و ئاراستەی هەموو هەڵس و کەوتەکانی دەکەن بە پێچەوانەی فیطرەی (لەسەر چاکیی دروست بووی) ناو دەروونی‌یەوە و بنەما ئاینی‌یە هیدایەتدەرەکان.

مەفهومی هــەڵس وکــەوتی غــەریزی و هــەڵس وکــەوتی وەرگیراو لە مرۆڤدا (وەك زانســــت و تاقی‌کردنــــەوە نوێکــــان ســــەلماندوویانە) یەکدەگرێتــــەوە لەگــــەڵ فــەرموودەکانی قورئــان و ســوننەت کــە ئاماژەیــان پێداوە لــەم بارەیــەوە لــەپێش ١٤ ســەدە، چونکە خوای گەورە کە مرۆڤی دروست کرد تایبــەتی کــردووە بــە بــوونی ژیریــی و عــەقڵ و جیاکردنــەوە، هــەروەها لەگــەڵ غــەریزە ئاژەڵی‌یــەکانی نــاو

پێکهاتەکەی‌دا برێك لە زانیاریی بنچینەیی گرنگی داناوە لە مێشك و دەروونی‌دا کە ناوی ناوە فیطرە یان فیطرەی ئیمان، هەروەك دەفەرموێت: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (الروم:٣٠)، واتە: رووبکەرە ئەو دینە راستە (ئیسلامە)ی کە خودا فیطرەتێکە و مرۆڤەکانی لەسەر دروست کردووە، کەس ناتوانێت دەستکاری ئەم دروست کردن و دانانەی خودا بکات، ئەمەیە دینی راستی پەروەردگار کە زۆر کەس ئەم راستی‌یە نازانێت یان پشتگوێی دەخات، هەروەها پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿كُلُّ مَولُودٍ يُولَدُ على الفِطْرَةِ فَأَبَواهُ يُهَوِّدانِهِ أو يُنَصِّرانِهِ أو يُمَجِّسانِهِ ...﴾ رواه البخاري، واتە: هەموو منداڵێك لەسەر فیطرەتی خودا (کە ئیسلامە) لەدایك دەبێت، کە پاشان دایك و باوکێن دەبنە هۆی ئەوەی ببێتە جوولەکە یان گاور یان ئاگر پەرست، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) لە دوعاکایەکیدا دەیفەرموو: ﴿أَصْبَحْنا عَلى فِطْرَةِ الإيمانِ ...﴾، واتە: رۆژمان کردەوە لەسەر فیطرەت کە ئیمانە بەخودا.

فیطرەت و ئیمان بریتین لە بەرنامەی ناوخۆی مێشکی مرۆڤ کە بناغەیەکی پتەو و دامەزراوە لە زانیاریی لە دەروونی مرۆڤدا، کە هەموو کاتێك وا لە مرۆڤ دەکات ئامادەیی تێدابێت بۆ ئیمان و گوێڕایەڵی پەروەردگار، مەگەر زانیاری تر کە پێچەوانە و دژی ئەمەن و لە دەوروبەرەوە وەردەگیرێن ببنە هۆی شاردنەوە و تەشویش خستنەسەری، ئەمەش ئەوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەکەی‌دا ئاماژەی پێداوە: ﴿... فَأَبَواهُ يُهَوِّدانِهِ أو يُنَصِّرانِهِ أو يُمَجِّسانِهِ﴾.

هەروەها لە فەرموودەیەکی قودسیشدا ئاماژەی پێداوە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنِّي خَلَقْتُ عِبادي حُنَفاءَ كُلَّهُم وَإِنَّهُم أَتَتْهُم الشَياطِين فَاجْتالَتْهُم عن دِينِهِم و حَرَّمَتْ عَلَيهِم ما أَحْلَلْتُ لَهُم وَ أَمَرَتْهُم أَنْ يُشْرِكوا بي ما لَمْ أُنَزِّلْ بِهِ سُلْطانا ...﴾ رواه مسلم، فاجتالتهم: اي إستخفوهم فذهبوا بهم ولزالوهم عما كانوا عليه وجالوا معهم في الباطل، واتە: پەروەردگار فەرموویەتی: من بەندەکانی خۆم هەمووی لەسەر فیطرەت و خواناسی دروست کردووە، کاتێك کە شەیتانەکانن (هی جنۆکە و مرۆڤ) کە هاتن بۆیان و لەسەر دینی راست لایان بردن بۆ ناڕەوایی، و بۆیان حەرام کردن

ئەو شتانەی من بۆم حەڵاڵ کردبوون، و فەرمانیان پێکردن کە هاوەڵ بۆ خودا دابنێن لەو شتانەی کە دەسەڵاتیان نییە و خودا هەرگیز فەرمانی پێنەکردووە.

لە لایەکی ترەوە ئەو ئامۆژکاری و یاسایانەی پەیامە ئاسمانییەکان کە خوای گەورە بە پێغەمبەراندا بۆ مرۆڤەکانی ناردووە بریتین لە پرۆگرامە وەرگیراوەکان بۆ ئاراستەکردن و رێکخستنی هەڵس وکەوتی مرۆڤەکان، ئەمانەن کە تەکلیف و هەڵبژاردنیان لەسەرە و لێپرسینەوەیان لەبارەوە دەکرێت لە رۆژی دواییدا: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا وَلَوْ شَاء اللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَـكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَآ آتَـاكُم فَاسْتَبِقُوا الخَيْرَاتِ إِلَى اللهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ (المائدة:٤٨)، واتە: بۆ هەموو یەکێك لە ئێوە بەرنامەیەك و پرۆگرامێکمان بۆ داناون، پەروەردگار دەیتوانی هەمووتانی بکردایە بە یەك کۆمەڵ و ئوممەت، بەڵام ئەم جیاوازییە بۆ تاقیکردنەوەی ئێوەیە و بەرپرسیارن لەسەری، دەی ئێوەش پێشبڕکێ بکەن لە چاکە کردندا، هەمووتان دەگەڕێنەوە بۆ لای خودا، کە پێتان دەڵێت و بۆتان رووندەکاتەوە ئەو شتانەی کە جیاوازیتان تێیدا هەبوو.

لێرەوە دەتوانین بڵێین ئەو نیگایەی کە گۆڕانکاری و دەستکاری بەسەردا نەهاتووە (کە قورئان و سوننەتە)، بریتییە لە بەرنامەیەکی وەرگیراو و پرۆگرامێکی کۆنترۆڵ کردن و بەڕێوەبردنی هەڵس وکەوتی مرۆڤە (ئەگەر تاك بن یان کۆمەڵ یان گەلان)، کە دەبێتە هۆی جێبەجێ کردنی سوود و بەرژەوەندییەکانی ئێستا و داهاتوویان، ئەمەش یەك دەگرێتەوە لەگەڵ مەفهوومی ئایەتێکی تر کە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَ الْأَرْضِ وَ الْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا﴾ (الاحزاب:٧٢)، واتە: ئێمە (ئەمانەت)مان بۆ ئاسمانەکان و زەوی و شاخەکان باس کرد، ئەوانیش رازی نەبوون هەڵیگرن و لێی ترسان، بەڵام مرۆڤی هەڵیگرت کە بەڕاستی دروستکراوێکی ستەمکار و نەزانە، ووشەی (ئەمانەت) لێرەدا مانای بریتییە لە رازی بوون بە وەرگرتنی تەکلیف و لێپرسینەوە لەسەر گوێڕایەڵیی خودا، لەسەر بنەمای ئازادی هەڵبژاردن کە لە مێشك و دەروونی مرۆڤدایە.

مرۆڤیش تەنها دروستکراوێکە کە خوای گەورە ئەم خاسییەتەی پێداوە، کە بریتییە لە توانای سەیرکردن و بیرکردنەوە و تێڕوانین و پاشان وەرگرتنی بڕیارێك لەو بوارەدا و دواییش هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی دەربارەی هەموو کار و هەڵس وکەوتێکی کە دەیکات جا خێر یان خراپە بێت، لەسەر بناغەیەك کە لە دەروونی ئەو مرۆڤەدا چەسپیوە، و هەروەها بەرنامەیەکی تریش کە لە دەوروبەرەوە وەریگرتووە.

ئێمەی موسوڵمان کە خاوەنی یاساکانی ئاینی راستین لە بیروباوەڕ و رەوشت و بەهاکاندا و لەبەر ئەوەی کە سەرمایەیەکی گەورەمان هەیە لە پەروەردە و پوختەکردندا، کە بە هەمووی پرۆگرامێکی یەکتری تەواوکەرە، و شەریعەتەکانی هەموو پێغەمبەران بە یەکەوە کۆدەکاتەوە، و لەلایەن دروستکەری زانا و داناوە بۆ مرۆڤەکان نێردراوە.

ئەم پرۆگرامە مرۆڤ رێنموونی دەکات بۆ باشترین رێگە لە ژیاندا، و هەڵس وکەوتی بەداناییەوە ئاراستە دەکات، سەرەنجام دەبێتە هۆی پاکردنەوەی غەریزەکانی و ئاوات و ئامانجەکانی دێنێتەدی، و دڵ ودەروونی پڕدەکات لە هێمنی و ئارامی، و دەیپارێزێت لە بێئومێدی و دڵەڕاوکێ و هەموو بەلا دەروونی و لاشەییەکانیش.

هەربۆیە دەبێت ئێمەی موسوڵمان ئەم پرۆگرام و پەیمانە سلووکییە گشتگیرە بۆ هەموو لایەنەکانی ژیان تەنها ئابلووقە نەدەین بەخزمانەوە و پێشکەش بە هەموو مرۆڤایەتی سەرگەردانی بکەین، ئەویش لەرێی راست کردنەوە و بنچینە دانانەوە بۆ پرۆگرامەکانی پەروەردە و فێرکردن لەژێر سایە و رووناکی ئەم ئیسلامە پیرۆزەدا، ئەم پرۆگرامە راستانە دەبنە هۆی نەك تەنها پێشخستنی تواناکانی وەرگرتن و توانا دەروونییەکان، بەڵکو رێنومایی مرۆڤیش دەکەن و یارمەتی دەدەن بۆ وەرگرتنی بڕیاری راست و چاك لە هەموو ووتە و هەڵس وکەوتێکیدا، بەم شێوەیەش ئەو ووتەیەی پەروەردگار دێنینە دی کە دەفەرموێت:
﴿وَ اللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَ هُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ﴾ (الاحزاب٤).

**بەڵگە زانستی‌یەکانی سەلمێنەری ئەم راستی‌یانە:**

١- جیاکردنەوە یان فەوتانی ناوچەوانەپڵ دەبێتە هۆی تێکچوونی کەسێتی لە ووتە و کردارەکانـدا: بەڵگـە کرداری‌یـەکان (الأدلـة السـريرة) سـەلماندوویانە کە فـەوتان یـان جیاکردنـەوەی ناوچـەوانەپڵ (بـەهۆی نەشـتەرگەری یـان رووداو و برینـداری) وا لـە نەخۆشـەکە دەکـات کـە کـۆنترۆڵی بەسـەر هـەڵس وکەوتـە کۆمەڵایەتی‌یـەکانی و توانـای بـەکارهێنانی ووشـەدا نـەمێنێت، هـەروەها چـەندین گۆڕانکاری گەورە لە جیاکردنەوەی کەسێتی‌یەکەی‌دا روودەدات.

دەبینین کە توانـای تـەرکیز و گیـانی دەسـت پێشـخەری و خۆڕاگرتنی زۆر کەم دەبێتەوە، و توانای چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی نامێنێت کە توانایەکی عەقڵی باشـی بوێـت، توانـای نـەخۆش بـۆ بڕیـاردان لەسـەر رووداوەکـانی ژیـان کـاری تێ‌دەکرێت، و هەستکردن بـە بەرپرسیارێتی بەرامبـەر بـە خـۆی لەدەست دەدات هـەروەها چـەندین گۆڕانکـاری سـۆزداری (عـاطفي) روودەدات، و نەخۆشـەکە نیشـانەی دڵخۆشـی و کامەرانی و رازی بوون لـەخۆی پیشـان دەدات، و لـە لایـەکی تریشـەوە شێوەی دەرەوە و کۆمەڵایەتی‌یانـەی خـۆی پشـتگوێ دەخـات، ئەمانـەی لەسەرەوە باسمان کرد وەك بەڵگەیەکی بەهێز وەرگیراوە لەسـەر کارەکـانی تـوێکڵی مێشکی ناوچـەوانەپڵ، و کۆنترۆڵ کردنـی ئـەم ناوچـەیە بـۆ لایەنـە زۆر ئاڵۆزەکانی هەڵس و کەوت و سلووکی مرۆڤ.

٢- پێوانـە کردنـی چـوونی خـوێن بـۆ تـوێکڵی مێشـك: لـەم سـاڵانەی دوایـیدا توانراوە کە پێوانەی چوونی خوێن بۆ توێکڵی مێشك و هەر بەشێکی تری بکرێت ئـەویش لـەرێی مـاددە تیشـك دەرەکـان و ئـامێری لـەرەی موگناتیسـی‌یەوە (الـرنين المغناطيسـي يـان MRI)، ئـەم هۆکارانـە بـەکار هێنـراون بـۆ لێکۆڵینـەوەی کـاری بـەرزەکانی مێشـك (الوظـائف العليـا للـدماغ)، بـە تایبـەتی لـە بـواری کارەکـانی ئـەم بەشانەی مێشك کە تایبەتن بە زمانەوە کە یـەکێکن لـە خاسی‌یەتەکانی مـرۆڤ، لـە توێژینەوانەوە دەرکەوتووە کە: لە ناوچەوانەپڵدا چوونی خوێن بۆ چەندین سەنتەر تێ‌یدا زیاد دەکات لە کاتی: بیرکردنەوە لە مانای ووشەکان، و لە کاتی ووتنیاندا

هەروەها بینراوە کە چالاکی لە پارچەکانی بینین لە پلی پشتەوەی مێشکدا زیاد دەکات لەکاتی بینینی هەندێک پیت یان وێنەوەی ووشەیەک کە مانای هەبێت (بڕوانە وێنەی ژمارە ٥).



وێنەیەکی تیشکیی مێشک کە بە ئامێری (MRI) گیراوە

**ئەنجام:**

لەوانەی پێشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە کۆنترۆڵ کردنی کردار و چالاکییە خۆویستەکان دەکەوێتە ناوچەوانەپلەوە، ئەوەش زانراوە تونکڵی مێشک ئەو شوێنەیە کە کۆنترۆڵی هەموو کار و ئەرکە هەست پێکراوەکان یان کردارە خۆویستەکان دەکات، لێرەوە دەتوانین بە دڵنیایییەوە بڵێین کە: تونکڵی مێشک لە ناوچەوانەدا بەرپرسە لە ناردنی بڕیارە جووڵەییە خۆویستەکان بۆ هەموو پارچەکانی لەش، کە لە نێویاندا بریتین لە: جووڵەی زمان بۆ ووتە دروستکردن، و جووڵەی سەر و چاوەکان بۆ تەرکیز کردنی بینین بە ئاراستەیەک لەکاتێکی دیاری کراودا، ئەمانە بە پشت بەستن بەو زانیارییانەی پێشتر تیدا چەسپیوە و هەڵگیراون.

ئەم زانیارییانە بریتین لە سروشتێکی خودایی (فطرة إلامية) یان سروشتێکی ئیمانی، و هەروەها بە پشت بەستن بەو زانیارییانەش کە لە دەوروبەرەوە وەریدەگرێت بۆ ئاراستە کردن و کۆنترۆڵ کردنی کار و هەڵس وکەوتەکان، دەتوانین بڵێین کە هەڵگرتنی راسپاردەی خودایی (ئەمانەتی تەکلیف) یان ئیرادی هەڵبژاردنی ووتەکان و کردەوەکان دەکەونە ناوچەوانە پلی مرۆڤەوە.




## لایەنی ئیعجازیی ئایەتەکان:

قورئانی پیرۆز ئاماژەی بەوە داوە کە سەرکردایەتی هەموو گیاندارانی سەر زەوی و شوێنی بەڕێوەبردنی کارەکانی و سەرپەرشتی جێبەجێ کردنیان دەکەوێتە بەشی پێشەوەی سەری یان ناوچەوانییەوە، هەروەك لە ئایەتی: ﴿مَا مِن دَآبَّةٍ إِلاَّ هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا﴾دا هاتووە، هەروەها خوای گەورە وەسفی ناوچەوانی مرۆڤی بە درۆزن و هەڵەکەر کردووە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە هەر ئەم شوێنەیە کە سیفەتی راستگۆیی و راستیشی دەدرێتەپاڵ، ئەمەش وەسفێکی راستەقینەی ناوچەوانە بە بوونی سیفاتی سلووکی و هەڵس وکەوت تێیدا: ﴿نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ﴾.

لەم لێکۆڵینەوەیەوە بۆمان دەرکەوت کە ناوچەوانە پل کە دەکەوێتە ناو ئێسکی ناوچەوانی مرۆڤەوە، سەنتەرەکانی کۆنترۆڵ کردن و ئاراستە کردنی کار و چالاکییە خۆویستەکان، و ووتن و هەڵبژاردنی قسەی تێدایە، لەگەڵ سەنتەری ئاراستەکردن و کۆکردنەوەی بینین بۆ ئاراستەیەکی دیاری کراویش، هەروەها رووبەری توێکڵی مێشکی ناوچەوانەپل بریتییە لە گەورەترین رووبەر لە هەموو

ێشکدا، کە ڕۆڵێکی سەرەکی و ئاشکرا دەبینێت لە کۆنترۆڵ کردنی خۆویستانەی ردارەکان، لەرێی ئەو زانیاری و پسپۆڕی‌یانەی کە تێیدا هەڵگیراوە.

کە پاش وەرگرتنەوەیان بۆ سەنتەری بیرکردنەوە و ژیریی (کە سەلماوە ئەمیش ەر لە ناوچەوانە پلدایە و زانایان شوێنەکەیان دیاری کردووە) شیدەکرێنەوە و سوودیان لێوەردەگیرێت، لەمانەوە بە دڵنیایی‌یەوە دەتوانین بڵێین: قورئانی پیرۆز ماژەی بە ڕۆڵی ناوچەوانە پلی مێشک داوە کە دەکەوێتە ناو ناوچەوانەوە لناصیة)، لە ئاراستە کردنی هەڵس وکەوتی مرۆڤ، ئەویش بە کۆنترۆڵ کردنی ڕتەکان و کردەوەکان لەرێی بوونی سەنتەرەکانی دروست کردنی ووتەکان، و ۆنترۆڵکردنی جووڵەکانی قسەکردن و بینین، و هەموو کرداره خۆویستەکانی شت پارچەکانی لەشیش.

هەروەها بوونی ڕووبەرێکی فراوان لە توێکڵی مێشک لەم پلەدا بوار بە مرۆڤ ەدات کە زانیاری‌یەکان وەرگرێت و شی‌یان بکاتەوە، کە سەرەنجام پسپۆڕی‌یەکی ۆری پێدەدەن لە هەڵبژاردنی ووتەکان و کردەوەکاندا، و ئاراستە کردنی هەڵس کەوتی، ئەویش بە یارمەتی سەنتەری ژیری و لێکدانەوە لەم پلەدا، لێرەوە ەتوانین بڵێین کە توێکڵی ناوچەوانەپل (لەبەرئەوەی ئەم سەنتەر و توانایانەی ێدایە) بریتی‌یە لە ناوچەی بەرپرس لە هەر کردارێکی ڕاست یان هەڵە و هەر ڕتەیەکی ڕاست یان درۆ، ئەم دەرئەنجامەش یەکدەگرێتەوە لەگەڵ دەقەکانی ورئان و سوننەت کە بۆ محمد پێغەمبەر (ﷺ) هاتۆتە خوارەوە، کە زۆر بەڕوونی و شکرا ئاماژەی کردووە بۆ ئەم کارانەی ناوچەوانەپلی مێشک کە دەکەوێتە ڕاوەی ئێسکی ناوچەوان یان (ناصیة)، کە ئەمە نەزانراو بوو بۆ زانایان لەو ەردەمی پێغەمبەردا و دواتریش، و ئەم ڕاستی‌یانە تەنها لەدوای ناوەڕاستی ەدەی بیستەمەوە دۆزرانەوە، ئەویش دوای ئەو پێشکەوتنە گەورەیەی کە ئامێرە نستی‌یەکان بەخۆیانەوە بینی‌یان و ئەو توێژینەوە زۆرانەی لەبواری زانستی ارئەندامزانی (فیسیۆلۆژی) و کارەکانی پلەکانی مێشک و ناوچەوانەپلدا ەتایبەتی کران، ئایا ئەمە بەڵگەیەکی تر نی‌یە لەسەر ئەودی کە محمد (ﷺ)

پێغەمبەر و نێردراوی خودایە و ووتەکانی هەمووی نیگا و نووڕنکە لەلایەن پەروەردگارەوە: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى، إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى، عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَى﴾ (النجم: ٣-٥).



**سەرچاوەکان:**


١- تەفسیری (جامع البیان)/ دانراوی (محمد بن جریر الطبري)/ دار الفکر-بیروت.

٢- تەفسیری (الجامع لأحکام القرآن)/ دانراوی (محمد بن احمد القرطبي)/ دار إحیاء التراث.

٣- گۆڤاری (الإعجاز)/ ژمارە٢-١٤١٧ك، ١٩٩٦ز/ دەرکراوی (هیئة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة).

4- Review of Medical Physiology \ William F. Ganong - eighththeenth Edition - 1997.

5- Guyton`s Textbook of Medical Physiology \ W. B. Saunders - 8th Edition - 1991.

**سەرەتا:**

چارەسەری نەخۆشی و گەڕان بەشوێن دەرمانی نارەحەتی‌یە جیاوازەکانی مرۆڤدا یەکێکە لە کارە لەپێشەکانی ژیانی مرۆڤایەتی، و بەردەوام زانایان و پزیشکان هەوڵەکانیان لەم بوارەدا درێژە پێدەدەن و تەقەلاکان بەردەوامن و پێشکەوتنی زۆر باشیش لەم بوارەدا هاتۆتەدی، زوربەی نەخۆشی‌یە ناسراوەکان یان چارەسەریان بۆ دۆزراوەتەوە یان لە میکانیزم و ڕێڕەوی تووشکردن و سووڕی ژیانیان تێگەیشتووین.

ئەم هەولانە لەخۆیاندا کارێکی پیرۆز و پێزانراوە، ئەگەر سەیری فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) لەم بوارەدا بکەین دەبینین لە زۆرێک لە فەرموودەکانی قورئان و سوننەتدا ئاماژە بۆ چارەسەر کردنی نەخۆشی و گەڕان بەدوای دەرماندا هاتووە، و هانی موسوڵمانانیان داوە کە پێشەنگ بن لەم بوارەدا، ئەوەتا پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەیەکیدا دەفەرموێت: ﴿تَداوَوا عِبادَ اللهِ، فَإنّ اللهَ لَم يَضَع داءً إلاّ وَضَعَ لَهُ دَواءً، غَيرَ داءٍ واحِدٍ، الهَرَم﴾ رواه أحمد و أصحاب السنن، واتە: ئەی بەندەکانی خودا دەرمان بەکار بهێنن و خۆتان چارەسەر بکەن و بەدوای‌دا بگەڕێن، چونکە پەروەردگار هیچ دەردێکی دانەناوە کە دەرمانیشی بۆ دانەنابێت، تەنها یەک




**Drug Mode of Action**
Certain drugs work by interacting with receptors, special sites on the surface of body cells. Drugs may bind to a specific receptor, possibly preventing naturally occurring chemicals from binding to the receptor. In so doing, if a drug enhances cell activity, it is called an *agonist*; if it blocks cell activity, it is called an *antagonist*.

## میکانیزمی کارکردنی دەرمانە جۆراوجۆرەکان

ـد نەبێت کە ئەویش پیری‌یە، هەروەها پێغەمبەر خۆیشی دەرمانی بەکاردەهێنا
ـایبەتی لەنەخۆشی کۆتایی ژیانی‌دا، لە کتێبی (صفة الصفوة)ی (إبن الجوزي)دا
ـتووە: عوروەی کوڕی زوبەیر لە عائیشەی خێزانی پێغەمبەری (ڕەزای خوای
ـێت) پرسی: من سەرم سوڕماوە لە زانیاری زۆری تۆ لە بواری پزیشکی و
ـەسەردا؟! عائیشەش ووتی: ئەی عوروە، پێغەمبەر (ﷺ) لە کۆتایی ژیانیدا
خۆش بوو، وەفدی تیرە عەرەبی‌یەکانیش دەهاتن بۆ لای لە هەموو لایەکەوە و
ـوازی چارەسەر و دەرمانی دەردەکەیان بۆ باس دەکرد، منیش گوێم لێدەگرتن و
ـەسەرەکانم بۆ پێغەمبەر ئامادە دەکرد، زانیاری‌یەکانی من لەوێوەیە.
لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) باسی چەندین شت کراوە کە چارەسەری
خۆشی تێدایە بۆ مرۆڤ، بە تایبەتی پێکهاتووە رووەکی‌یەکانی وەك: زەیتوون و
ـەکەی، سیر و پیاز، ڕەشکە، و سرکە ... هتد، هەروەها چارەسەر بە هەنگوین،
ـارەسەر بە میزی ووشتر، و چارەسەر بە کەڵەشاخ گرتن.
ئەمانە هەمووی بەڵگەی گرنگیدانی پێغەمبەرە (ﷺ) بە دەرمان و چارەسەری
خۆشی‌یەکانی مرۆڤ، ئێمە لەم باسەماندا تیشك دەخەینە سەر هەندێك لە
ـەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کە رووەکێك دەکاتە چارەسەری زۆرێك لە
خۆشی‌یەکانی مرۆڤ ئەویش رووەکی رەشکەیە، کە لە زمانی عەرەبی‌دا بە (الحبة
سوداء) یان (حبة البركة) ناسراوە، لەڕێی نوێترین دۆزینەوەکان و توێژینەوە
ـستی‌یەکان لەم بوارەدا دەیسەلمێنین کە ئەم فەرموودانە یەکێك لە باشترین
ـکاری خۆپاراستن و چارەسەریان بۆ مرۆڤ باسکردووە، و گرنگی گەورەی ئەم
ـوەکە روون دەکەینەوە لە بواری پزیشکی و دەرمانسازی‌یەوە (علم الصيدلة
Pharmacolog)، کە خۆی لەخۆی‌دا موعجیزەیەك و بەڵگەیەکی گەورەی
ـیامبەرێتی (محمد)ە لە لایەن خوداوە.

**ـقی فەرموودەکان:**

- ﴿عَلَيكم بهذة الحَبّة السَّوداء، فَإنّ فيها شفاءً من كُلّ داء إلاّ السّام﴾ رواه البخاري،
السّام: الموت، وفي رواية اخرى: ﴿إنّ في الحَبّة السوداء شفاءً من كُلّ داء، إلاّ السّام﴾

رواه البخاري ومسلم، واته: ئێوه ڕەشکه بەکاربهێنن، لەبەرئەوەی شیفای تێدایە بۆ هەموو نەخۆشییەك، تەنها یەك شت نەبێت کە ئەویش مردنە.

– عن أنس ابن مالك، أنَّ النَّبيَّ (ﷺ): (كان إذا اشتكى تقمَّحَ كفّاً من شونيز، ويشربُ عليهِ ماءً و عسلاً) رواه الطبراني، تقمَّحَ: اي استفَّ، الشونيز: هو الحبة السوداء أو (حبة البركة). واته: ئەنەسی کوڕی مالیك (کە هاوەڵێکی نزیکی پێغەمبەر بووە) دەڵێت: هەر کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) نەخۆشییەك یان شەکوایەکی هەبوایە بە لەپی دەستی هەندێك ڕەشکەی دەخوارد، پاشان هەندێك گیراوەی ئاو و هەنگوینی بەدوادا دەخواردەوە.

ئەمانە و چەندین فەرموودەی تر هەن کە باسی گرنگی ئەم ڕووەکە و دەنکەکەی دەکەن لە چارەسەر کردنی نەخۆشییە جیاوازەکاندا، دەبا ئێستا لە ڕووی زانستییەوە ئەم دەنکە و سوودەکانی باس بکەین:



## ڕەشکە چییە؟

بریتییە لە ڕووەکێکی گیایی کە بۆ دەنکە تۆوەکانی یان گوڵەکەی دەڕوێنرێت، ناوی زانستی ئەو جۆرەی ئەم ڕووەکە کە لە بەکارهێنانە پزیشکییەکاندا بەکاردێت، بریتییە لە (Nigella Sativa)، لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) پێی دەوترا (الشونیز) کە لە ناوی (شەش هەنین)ی فارسییەوە وەرگیراوە، ڕەنگی دەنکەکانی ڕەشن و چەندین ناوی هەیە لە وڵاتە جیاوازەکاندا، ئەم ڕووەکە میسرییە کۆنەکان ناسیویانە و ناویان نابوو (شنقت) کە باسی سوودەکەیان کردووە بۆ نەخۆشییەکانی سنگ و کۆکە، ڕۆن یان زەیتی ڕەشکە کە لە پێویستییە پزیشکییەکاندا بەکاردێت لە دەنك یان تۆوەکەی دەردەهێنرێت.

لە پێکهێنەرەکانی تۆوی ڕەشکە:

– ١,٥٪ی لە زەیتی بەهەڵمبوو پێکدێت کە ماددەی نیگیللۆن (Nigellon)ی تێدایە، ئەم ماددەیەیە کە کاریگەرییە پزیشکییەکانی ڕەشکەی بۆ دەگەڕێتەوە، ٣٢٪ی لە زەیتی جێگیر پێك دێت، ڕۆن یان زەیتی ڕەشکەش هەمان پێکهاتەی هەیە کە پێکدێت لە:

١- زەیتی جێگیر (الزیت الثابت Fixed Oil): ئەو توێژینەوەیەی کە لە نەخۆشخانەی زانکۆی (کینگ King) لە لەندەن لە ساڵی ١٩٩٣دا کرا دەریخست کە ئەم زەیتە لە ٤ جۆر ترشەڵۆکی چەوری تێر و ٤ جۆری تر لە ترشەڵۆکی چەوری ناتێر پێك دێت.

٢- زەیتی فڕیو یان بەهەڵم بوو (الزیت الطَّیار Volatile Oil): ئەم زەیتە پێکهاتەکەیەکی چالاکی تێدایە کە ناوی ثایمۆکوینۆنە (Thymoquinone) کە ٢٥٪ی ئەم زەیتە پێك دێنێت، و هەروەها بەرێژەیەکی کەمیش لە زەیتی جێگیردا هەیە، پێکهاتەیەکی گرنگی تریش کە لەمەوە نزیکە و لەم زەیتەدا هەیە هەر ماددەی نیگیللۆنە (Nigellon).

## بەکارهێنانە پزیشکییەکانی ڕەشکە و توێژینەوەکان لەو بوارەدا:

لە زۆرێك لە کتێبە پزیشکییەکانی تایبەت بە خۆراك و تەندروستیدا باسی سوودەکانی بەکارهێنانی ڕەشکە کراوە، لەوانە: کتێبی بەناوبانگی (گیازانی نوێ) (Modern Herbal)، چاپی (١٩٩٢) کە دەڵێت: ڕۆمانییەکان ڕەشکەیان ناسیوە و لە خواردنیاندا بەکاریان هێناوە، هەروەها لە فەرەنسا و هیندستانیش بەکاردێت وەك ماددەیەکی ووریا کەرەوە و ئارەق کەرەوە، و باوەڕوایە کە ڕژاندنی شیری دایك زیاد دەکات، و هەروەها بۆ سکئێشە و باش هەرس نەکردنی خۆراکیش بەکاردێت.

هەروەها لە کتێبی (فەرهەنگی خۆراك و چارەسەر بە رووەك)ی (د.أحمد قدامة) دەربارەی ڕەشکە دەڵێت: ڕەشکە وەك بەهارات بەکار دەهێنرێت، و هەروەها شیرینی لێدروست دەکرێت، کە وەك موقەوی و بۆ باداری باشە، هەروەها

زەیتەکەی بە دڵۆپ دەکرێتە قاوەوە و مرۆڤ هێمن دەکات و بۆ کۆکە و نەخۆشی سنگ باشە.

هەروەها (د.فوزي طە قطب) لە کتێبی (رووەکە پزیشکییەکان)دا دەڵێت: زەیتی رەشکە بۆ کۆکە باشە و بە ئازار شکێنێکی بەهێزیش ناسراوە، و هەروەها لە چارەسەری تەنگەنەفەسی و کۆکە رەشە یان کۆکەی کەڵەشێر (السعال الديكي Whooping cough)دا بەکاردێت، ئەمانە بە گشتی چەند تێبینییەك بوون لەسەر بەکارهێنانەکانی رەشکە لە نەخۆشییە جیاوازەکاندا، ئێستا پێم خۆشە کە بە تایبەتی باسی بەکارهێنانەکانی رەشکە لە نەخۆشی سیستمە جیاوازەکانی لەشدا بکەین:

## بەکارهێنانی رەشکە لە نەخۆشییەکانی کۆئەندامی هەناسەداندا:

### رەشکە و نەخۆشی تەنگەنەفەسی (الربو القصبي Asthma):

تەنگەنەفەسی یان رەبو بریتییە لە نەخۆشییەك کە تووشی بۆرییەکانی هەناسەدان دەبێت، لەنیشانە ناسراوەکانی ئەم نەخۆشییە بریتییە لە: تەنگەنەفەسی، کۆکە و خیزە (دەنگێکی مۆسیقییە کە لەگەڵ هەناسەداندا دروست دەبێت)، نەخۆشییەکی زۆر باوە، سەرژمێرییە تازەکان دەڵێن کە ٥٪ی پێگەیشتوان و ٥-١٠٪ی منداڵان لە جیهاندا ئەم نەخۆشییەیان هەیە، لە هەموو تەمەنێکدا روودەدات بەڵام زیاتر لە منداڵاندا، بینراوە کە زیاتر لە نیوەی حاڵاتی رەبو لە پێش تەمەنی ١٠ساڵیدا دەست پێدەکەن، دوو جۆری سەرەکی هەیە:

١- تەنگەنەفەسی هەستیاریی (Extrinsic or Allergic Asthma) (الربو الذاتي): زۆرجار نەخۆشەکە لە خێزانەکەیاندا کەسێکی نزیکی هەیە کە حاڵەتی هەستیاری هەبوو بێت، وەك هەستیاری لووت و رێڕەوەی سەرەوەی هەناسەدان، یان هەستیاری پێست بە تایبەتی نەخۆشی ئیکزیما.

ئەم جۆرە لە تەنگەنەفەسی بەزۆری لەو کەسانەدا روودەدات کە لە سەرەتای تەمەنیاندان (منداڵ یان هەرزەکار).

٢- تەنگەنەفەسی خۆیی (الربو الذاتي Intrinsic Asthma): ئەم جۆرەیان تووشی ئەو کەسانە دەبێت کە لە تەمەنی سەروو ٤٠ساڵییەوەن و هۆکارێکی ئاشکرای نییە.

**میکانیزمی روودانی تەنگەنەفەسی:**

سەرەتا هەوا دەچێتە ناو بۆرییەکانی هەوا (القصبات Bronchi) پاشان بۆ بۆریچکەکانی هەوا (القصيبات Bronchioles) و دوایی بۆ توورەکەکانی هەوا یان سیکڵدانۆچکەکان (الحويصلات الهوائية Alveoli)، بۆریچکەکانی هەوا دیوارێکی ماسولکەییان هەیە، کە دەتوانێت بکشێت و تەسك ببێتەوە، ئەم بۆریچکانە لەو کەسانەی کە رەبویان هەیە هەستیار دەبێت بۆ زۆرێك لە کارتێکەرە فیزیایی و کیمیایی و ژینگەییەکان، وەك: تۆزی ناوماڵ، تووك یان پەڕی ئاژەڵ، هەڵاڵەی گوڵ یان خۆهیلاك کردن و ماندوویی زۆر و هۆکاری تریش، کاتێك ئەو کارتێکەرانە دەچنە بۆریچکەکانی هەواوە دەبنە هۆی دروست بوونی کارلێك لە دژیان لە دیواری بۆریچکەکاندا، و سەرەنجام دەبنە هۆکاری تەسك بوونەوەی بۆشایی (Lumen)ی ناو ئەم بۆریچکانە، و چوونە ناوەوە و هاتنەدەرەوەی هەوا بەناو ئەم بۆریچکانەدا زۆر زەحمەت دەبێت، و نەخۆشەکە هەناسەی توند (تەنگە نەفەس) دەبێت، ئەم باری تەنگە نەفەسییە بە نۆرە (جار لەدوای جار) روودەدات، واتە بەردەوام نییە.

لەکاتی هەر نۆرەیەکی تەنگەنەفەسیدا هەناسەدان زۆر قورس و ناڕەحەت دەبێت، نەخۆشەکە زیاتر لە کاتی هەناسەدانەوەدا ناڕەحەت دەبێت وەك لە هەناسە وەرگرتن، لەکاتی هەناسەدانەوەدا دەنگێکی مۆسیقایی پەیدا دەبێت کە لە فیکە دەچێت و پێی دەووترێت خیزە (Wheeze)، هەروەها نەخۆشەکە کۆکەی دەبێت (کە لەوانەیە وشك بێت یان بەڵغەمی لەگەڵدا بێت)، ئەرکی هەناسەدان قورس دەبێت و ماسولکەکانی تایبەت بە هەناسەدان و هاوپێچەکانیان ئەرکێکی زۆریان دەکەوێتە سەر، هەر بۆیە دەبینین لەو نەخۆشانەدا ماسولکەکانی سنگ وملیان زۆر گرژ دەبن، و ئەو ئەرکە زیادەیە دەردەکەوێت لەبەر گرانی بردنی هەوا بۆ ناو

سی‌یەکان بەهۆی تەسک بوونەوەی بۆری‌یەکانی هەواوە، لە بارە هەرە گرانەکانی ڕەبودا نەخۆشەکە تووشی شینبوونەوەی پێست و لێوەکانی دەبێت و لەوانەیە ئارامی لێ‌ببڕێت، ئەم تاوانەی تەنگەنەفەسی لەوانەیە چەند دەقیقەیەك بخایەنێت، لەوانەشە درێژببێتەوە بۆ چەند سەعاتێك یان چەند ڕۆژێك، پێویستە لە نۆرەکانی تەنگەنەفەسی‌دا نەخۆشەکە نیشانی پزیشك بدرێت و دەرمانی تایبەت بخوات، چونکە نەخۆشەکە تووشی هیلاکی و ماندوو بوونێکی زۆر بووە بەهۆی هەوڵەکانی بۆ وەرگرتنی هەوا، ئەگەر چارەسەری گونجاو و تەواو نەکرێت سەرەنجام لەوانەیە تووشی داڕووخان و شکست هێنانی کۆئەندامی هەناسەدان (عجز الجهاز التنفسي **Respiratory Failure**) ببێت و بمرێت.



**Dust Mite**
The dust mite is a microscopic insect that lives in human homes, where it feeds on the dust produced by human and animal skin. Dust mites are not harmful in themselves, but their droppings, which contain left-over digestive enzymes, are a significant cause of asthma and other allergic diseases.



**House Dust**
Even clean homes contain house dust, which is among the most common causes of allergies. A speck of dust like the one shown here—magnified more than 100 times—may contain fabric fibers, human and animal skin, food particles, bacteria, and microscopic insects called dust mites.

### هۆکارە سەرەکی‌یەکانی تەنگەنەفەسی:

زۆر هۆکار هەیە کە دەبنە هۆی تەسک بوونەوەی دیواری بۆری‌یەکانی هەناسە (ئەم تەسک بوونەوەیە لە چەند شوێنێکی دیوارەکەدا دەبێت:

١- ماسولکەی دیوارەکە گرژ دەبێت.

٢-ناوپۆشی دیوارەکە دەئاوسێت.

٣-بۆشایی ناو دیوارەکە بە دەردراو (بەڵغەم **Mucus Plug**) دەگیرێت.

لە هۆکارە سەرەکی یەکانی تووش بوون بە تەنگەنەفەسی:



**Pollen Grains**
Pollen grains, shown here at more than 1000 times their actual size, are a common source of allergies. All trees, grasses, weeds, and flowering plants produce pollens, which can be carried in the wind for miles and are light enough to be easily inhaled. People with pollen allergies may be helped by staying indoors during the midday and afternoon—the times when pollen concentrations are highest.

- هەندێك لە نەخۆشەکان هەستیاری یان هەیە بۆ ماددەیەکی دیاری کراو، کاتێك دووچاری ئەم ماددانە دەبنەوە تووشی نۆرەی تەنگە نەفەسی یەکە دەبن لەماوەی چەند دەقیقەیەکدا، لەو ماددانە: هەڵاڵەی گوڵەکان و هەندێك لە گیاکان (غبار الطلع و للحشائش Grass & Flower Pollens)، سپۆری کەڕووەکان (Fungal Spores)، جۆرە مێروویەك کە لە ناو تەپ وتۆزی ناو جێگە و دۆشەك و فەرش و ڕاخراوی ناوماڵدا دەژی و پێی دەووترێت (House Dust Mite) (بڕوانە وێنەی لاپەرەی پێشتر).

- هەندێك جۆر لە خواردەمەنی لەوانەیە ببنە هۆکاری تووشبوون بە نۆرەیەکی توندی تەنگەنەفەسی.

- دووچاربوون بە دووکەڵی جگەرە بە تایبەتی لەوانەی کە جگەرەکێش نین هۆکارێکی گرنگی تەنگە نەفەسی یە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا، هەروەها دووکەڵی کارگەکان و ئۆتۆمبێلەکانیش هەمان ڕۆڵی خراپ دەبینن.

-لەوانەیە تەنگەنەفەسی ڕووبدات بەهۆی تووش بوون بە ڤایرۆسێك یان میکرۆبێکی زیانبەخش و نەخۆشکەوتنی بۆری یەکانی هەناسە یان سی یەکان بەهۆیانەوە.

-خۆهیلاك کردن و ماندوو بوونی زۆر و دووچاربوون بە هەژاندنە دەروونی یەکان لەوانەیە ببنە هۆی تووشبوونی ئەو کەسە بە نۆرەیەکی توندی تەنگە نەفەسی.

**چۆنێتی چارەسەرکردنی تەنگەنەفەسی:**

ئەو تاوانە یان ئۆرانەی تەنگەنەفەسی چارەسەر دەکرێن بە بەکارهێنانی دەرمانە فراوان کەرەکانی بۆری‌یەکانی هەناسە (موسعات القصبات Bronchodilators)، وەك ماددەکانی: سالبیوتامۆڵ (Salbutamol)، تێربیوتالین (Terbutalin) و (Ipratropium Bromide)، ئەم ماددانە بەزۆری بەشێوەی پرژدەر (بخاخ Inhalors) یان شلە بۆ ئامێری هەڵمدەر (Nebulizer Solution) هەن و نەخۆشەکە هەڵیان دەمژێت لەگەڵ هەناسەدا، و کاریگەریی راستەوخۆیان بۆ سەر بۆری‌یەکانی هەناسەدان هەیە، دەبنە هۆی خاوبوونەوەی ماسولکەکانی بۆری‌یەکانی هەناسەدان و فراوان بوونیان، لەوانەیە نەخۆشەکە پێویستی بە دەرمانی تریش ببێت وەك: ئاوێتەکانی ئەمینۆفیللین (Aminophylline) و ثیوفیللین (Theophylline)، یان ئاوێتەکانی کۆرتیزۆن (Cortisone) بۆ ماوەیەکی کورت.




پێویستە هۆکاری تووشکەر ئەگەر زانرا، یان نەخۆشەکە هەر یەکێیانی هەبوو بە تەواوەتی لا ببرێت و لێی دووربکەوێتەوە.

هەروەها چەند دەرمانێك هەیە کە بەکار دەهێنرێت بۆ چارەسەر یان خۆپاراستن لە ئۆرەکانی تەنگەنەفەسی بەتایبەتی لە منداڵاندا، وەك دەرمانی سۆدیۆم کرۆمۆگلایکەیت (Sodium Cromoglycate).

ئەم دەرمانانەی تەنگەنەفەسی بەگشتی لەگەڵ سوودەکانیاندا لەوانەیە ببنە هۆی چەندین کاریگەری لاوەکی بۆ سەر نەخۆشەکە وەك: گیان لەرزین، دڵ

لەپەل و ریك لێنەدانی دڵ، سەرئێشە و شتی تریش، بەکارهێنانی کۆرتیزۆن بۆ وەیەکی زۆر لەوانەیە بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، هەوکردنی گەدە و ...لزبوونی ئێسك دروست بکات.

## رۆڵی رەشکە لە چارەسەری نەخۆشی تەنگەنەفەسی (رەبو)دا:

زانا و پزیشکی بەناوبانگ (إبن سینا) لە کتێبی (القانون في الطب)دا دەڵێت: ...ەشکە دەرمانێکی باشە بۆ کۆکە و بۆ هەناسە توندی سوودی زۆرە).

(د. محمد ناظم النسیمي) لە کتێبی (الطب النبوي و العلم الحدیث)دا دەڵێت: ...نراوە لەناو نەخۆشەکانی رەبو لە ناوچەی دەوری دەریای سپی ناوەڕاستدا (کە ...وەکی رەشکە زۆر بڵاوە)، زەیتی رەشکە زۆر دەخۆنەوە بۆ چارەسەری ...خۆشییەکانی سنگ و کۆکە، بە تایبەتی لەلای خەڵکی عامیی وڵاتی میسر، ...گەڵ ئەوەشدا کە زۆر کەس تامی زەیتەکەی بەدڵ نییە و ماددەیکی هەژێنەرە بۆ ...اوپۆشی کۆئەندامی هەرس.

لەم دواییەدا تیمێکی پزیشکی لە میسر بە سەرۆکایەتی (د. محمد المحفوظ) ...(د. محمد الدخاخني) توانییان ماددەی چالاکی زەیتی رەشکە بە شێوەیەکی ...وخت و بەبێ ماددە هەژێنەرەکان جیابکەنەوە و ناویان نا نیگیللۆن ...Nigellone)، کە هیچ جۆرە زیانێکی لاوەکیشی نییە، ئێستا ئەم ماددەیە ...ەلایەن (کۆمپانیانی میسر بۆ پێکهاتە پزیشکییەکان) دروست کراوە بە شێوەی ...ەپلە (حەب) و قەترە، هەردوو ئەم پزیشکە بە تاقیکردنەوە سەلماندیان کە ...یگیللۆن ماددەیەکی رێگرە لە گرژبوونی ماسولکەکانی بۆرییەکانی هەوا و ...اوکەرەوەیە بۆیان، هەربۆیە لە نەخۆشی رەبودا سوودێکی زۆر باشی هەیە و ...ەبێتە هۆی کەم کردنەوەی تەنگە نەفەسی و نۆرەکانی رەبو، دەتوانرێت رەشکە ...هاڕرێت و لەکاتی نۆرەکانی رەبودا کەوچکێکی بچووکی لێبخورێت، یان ...ەتوانرێت لەو نەخۆشانەی تەنگەنەفەسییان هەیە بەیانیان یەك کەوچك لە ...ەشکەی هاڕراو بخۆن بۆ رێگرتن لە نۆرەکانی تەنگەنەفەسی.

## رۆڵی رەشکە لە نەخۆشی هەستیارییدا (الحساسية):

لە توێژینەوەیەک* کە لە پەیمانگای دەرمانسازی (فارماکۆلۆجی Pharmacology) لە زانکۆی (ئۆدێسە)ی وڵاتی دانیمارک کرا بە سەرپەرشتی (د. ئافارتی) سەرۆکی بەشی هەستیاریی، ئەویش لەسەر کاریگەریی ماددەی چالاکی رەشکە کە (نیگیللۆن)ە، (د.ئافارتی) لە توێژینەوەکەیدا دووپاتی کردەوە کە زەیتی رەشکە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی رژاندنی ئەو ماددانەی کە لەکاتی هەستیاریدا دەرێژرێن بە تایبەتی ماددەی هیستامین (Histamine)، هەروەها لە توێژینەوەیەکی تردا کە (د. خمیس جمعة) مامۆستای فارماکۆلۆجی زانکۆی ئیسکەندەریە لە میسر پێی هەستا لەسەر هەندێک نەخۆشی رەبودا (کە وەک وتمان ئەمیش جۆرێکە لە هەستیاری)، بینی باشبوونێکی بەرچاو روودەدات لەکار و جووڵەی ناوپەنچک (الحجاب الحاجز Diaphragm)دا، و هەروەها فراوان بوونی بۆرییەکانی هەناسەدانی ئەو کەسانەی کە پوختەی رەشکەیان درایە، سەرەنجام تەنگەنەفەسییان کەم دەبووەوە و هەناسەدانیان زۆر باش دەبوو.

## رەشکە و نەخۆشی هەڵامەت:

نەخۆشی هەڵامەت (الرشح Common Cold) بەهۆی چەند ڤایرۆسێکەوە (زیاتر لە ١٠٠جۆرن) تووشی مرۆڤ دەبێت، کە دەبێتە هۆی هەوکردنی رێڕەوەکانی هەناسەدان، ئەم نەخۆشییە بەهۆی ئەو پرژانەی لە کاتی کۆکین و پژمیندا لە دەمی نەخۆشەکەوە دێنەدەرێ دەگوێزرێتەوە، زۆرتر تووشی منداڵ دەبێت و بە تایبەتی لە وەرزی زستاندا، لە کتێبی (Advances in Internal Medicine)دا هاتووە: هەڵامەت گرفتێکی گەورەیە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا،ساڵانە ئەمریکییەکان ٣٠ ملیۆن جار سەردانی پزیشک دەکەن بەهۆیەوە، کە تێچوونی چارەسەرکردنیان دەگاتە زیاتر لە ١,٥ ملیار دۆلار، و زیاتر لە ٥ ملیار دۆلاریش زەرەر دەدەن بەهۆی دواکەوتنیان لە کار و چالاکییەکانیان.

---

* ئەم توێژینەوەیە لە کۆنگرەی کۆمەڵەی میسری بۆ هەستیاری و بەرگری لە ساڵی (١٩٩٢)دا پێشکەش کرا، ئەویش لە دانیشتنێکیدا لەسەر رەشکە و سوودەکانی.

نیشانەکانی هەڵامەت بریتین لە: سووربوونەوە و ئاوکردنی لووت، خووران لە ورگدا و کۆکە، پژمین، سەرئێشە و هیلاکی و ئازار لە هەموو لەشدا، دەرکەوتنی ئەم نیشانانە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت.

سەبارەت بە چارەسەری هەڵامەت خۆی لە ئیسراحەت و دژە هەستیاری‌یەکان و ڤیتامین (C)دا دەبینێتەوە، لە گۆڤاری (Rocky Mountain News)ی ئەمریکی‌دا هاتووە: ئەگەر دەتەوێت چارەسەری هەڵامەت بکەیت ئەوا لیمۆیەکی پارچەکراو بکوڵێنە لە ئاودا، و پاشان هەنگوینی بۆ زیادبکە و بەدرێژایی ئەو ڕۆژە لێی بخۆرەوە، هەروەها هەمان گۆڤار پێشنیاری ئەوە دەکات کە سیر بەکاربهێنین لەکاتی هەڵامەتدا.

سەبارەت بە بەکارهێنانی ڕەشکە لە هەڵامەتدا (د. الفاضل العبید عمر) لە کتێبی (الحبة السوداء في الطب الشعبي)دا دەڵێت: بۆ چارەسەری هەڵامەت و سەرمابوون زەیتی ڕەشکە (کەوچکێکی گەورە) دەکرێتە ناو ئاوێکی کوڵاوەوە و دەبێت نەخۆشەکە خاولی‌یەك بدات بەسەری‌دا و ئەو هەڵمە هەڵمژێت کە لە ئاوە کوڵاوەکەوە بەرز دەبێتەوە، ئەم کردارە باشتر وایە بەیانیان و ئێواران دووبارە بکرێتەوە تا چاك بوونەوە، هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و شوێن کەوتووەکانیان چارەسەری هەڵامەتیان بە ڕەشکە دەکرد، زانا (ابن القیم الجوزیة) لە کتێبی (الطب النبوي)دا دەڵێت: شونێز (ڕەشکە) شیفایە بۆ هەڵامەت ئەگەر بێتو بکوترێت و بکرێتە توورەکەیەکەوە و بە بەردەوامی بۆن بکرێت، لە کتێبی (فتح الباري)دا هاتووە: (موستەغفیری) گێڕاوی‌یەتەوە لە هاوەڵێکی پێغەمبەرەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ئەم ڕەشکەیە شیفای تێدایە، لێیان پرسی: چۆنی لێبکەین؟ فەرمووی: هەندێك بهێنە و بیخەرە توورەکەیەکەوە و شەو بیخەرە ئاوەوە، بۆ بەیانی چەند قەترەیەك بکەرە لووتتەوە و بەردەوام ببە بۆ چەند ڕۆژێك.

### ڕەشکە و نەخۆشی دەردەشا:

دەردەشا (النقرس او داء الملوك Gout) نەخۆشی‌یەکە تووشی جومگەکان دەبێت، بە تایبەتی جومگەکانی پەنجەگەورەی پێ، و دەبێتە هۆی دروست کردنی

ئازارێکی زۆر ناڕەحەت تێیدا، و لەوانەشە بەردی گورچیلە دروست بکات، هۆکاری دەردەشا بریتییە لە زیادبوونی رێژەی ترشی یۆریا (Uric Acid) لە خوێندا (لە حاڵەتی ئاساییدا رێژەی ترشی یۆریا لە خوێندا نابێت لە ٧میللیگرام/ ١٠٠میللیلیتر زیاتر بێت)، ئەم ماددەیە لە تێکشکاندنی پرۆتینەوە دروست دەبێت و بە تایبەتی لەو کەسانەدا روودەدات کە گۆشت و پرۆتین زۆر دەخۆن.

سەبارەت بە نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە لە (Clinical Medicine)دا هاتووە: دەردەشا لە خەڵکانی توێژی سەرەوەی کۆمەڵگادا روودەدات، و ٥٠٪ی تووشبووەکان لەوانەن کە مودمینن لەسەر مەشروب خواردنەوە، نۆرەی ئازاری ئەم نەخۆشییە لە سەعاتەکانی یەکەمی بەیانیدا دەست پێدەکات بە ئازارێکی نێجگار زۆر و ناڕەحەت لە پەنجە گەورەی پێدا، لە هەندێك خەڵکی تردا لەوانەیە بە بەردی گورچیلە و نیشانەکانی خۆی دەربخات.

چارەسەری نۆرەی ئازاری دەردەشا بە دەرمانی ئیندۆمیثازین (Indomethacin) دەکرێت، بۆ خۆپاراستن لەو ئازارە، دەرمانی دابەزێنەری ترشی یۆریا لە خوێندا بەکاردێت وەك ئەلۆپیورینۆڵ (Allopurinol).

ئایا رۆڵی رەشکە چییە لە چارەسەری ئەم نەخۆشییەدا؟

بینراوە کە پێکهێنەرەکانی رەشکە دەبنە هۆی دابەزاندنی ترشی یۆریا لە خوێندا ئەویش بەهۆی یارمەتیدانی دەرکردنی ئەم ماددەیە لە گورچیلەوە بۆ ناو میز، لە توێژینەوەیەکدا کە (د. محمد الدخاخني) پێی هەستا و لە گۆڤاری (الطب الإسلامي)دا بلاوی کردەوە هاتووە: کۆمەڵێك مشکی تاقی کردنەوەی هێنا و بۆ ماوەی چەند رۆژێك نان و شیری دەدانێ، ئەوەبوو میزی مشکەکان دوو دوو بۆ ماوەی ٢٤ کاتژمێر کۆدەکرایەوە و رێژەی ترشی یۆریای تێدا دەپێورا، پاشان هەندێك لەو مشکانە لەرێی دەرزی (٤ گرام/ کغم) ماددەی ثایمۆکوینۆن (Thymoquinone)ی پوختی وەرگیراو لە رەشکەوە لێیان دەدرا، رۆژانە بۆ ماوەی ٥ رۆژ، پاش پشکنینی میزی مشکە دەرزی لێدراوەکان، بینی کە ئەم وەرگیراوەی رەشکە بۆتە هۆی زیادکردنی دەردانی ترشی یۆریا لە میزی

مشکەکاندا، لە لایەکی ترەوە بینراوە کە بەکارهێنانی رەشکە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ئازاری جومگەکان بەگشتی.

## رەشکە و بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن:

بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن نەخۆشییەکی زۆر باوە لە جیهاندا، بینراوە کە ٢٠٪ی خەڵکی لە نێوان ١٩-٧٤ ساڵ پەستانی خوێنیان لە سەروو ٩٠/١٦٠ ملم جیوەدایە (پەستانی خوێنی مرۆڤێکی ئاسایی بەپێی تەمەن دەگۆڕێت بەڵام بەزۆری بریتییە لە ٨٠/١٢٠ ملم جیوە)، لەکۆنگرەی جیهانی دەرمانسازی ژمارە (٢٣) کە لە شاری (مونستر)ی ئەڵمانیا سازکرا چەندین توێژینەوە سازکرابوو لەسەر کاریگەرییە پزیشکییەکانی رەشکە، یەکێك لەو توێژینەوانە بەروونی باسی کاریگەری رەشکەی دەکرد لە دابەزاندنی پەستانی بەرزی خوێندا.

## رەشکە و مەیینی خوێن:

لەلای خەڵکی سادە باوەڕوایە کە زەیت و رۆنی رەشکە دەبێتە هۆی وەستاندنی خوێنی بەربوونی لووت، و بەشێوەیەکی بڵاو لەم بارەدا بەکارهاتووە، لە توێژینەوەیەکدا کە تیمێکی پزیشکی میسری پێی هەستان سەبارەت بە کاریگەریی وەرگیراوەکانی رەشکە لەسەر مەیینی خوێن لە دەرەوەی لەش لە کەروێشکدا، ئەنجامەکانی ئەم توێژینەوەیە ئەوەبوو کە هەندێك لە پێکهێنەرەکانی رەشکە دەبێتە هۆی یارمەتیدانی مەیینی خوێن، و خاوکردنەوەی کرداری لێکهەڵوەشانی تۆڕی فایبرینیی لە خوێندا {ماددەی فایبرین (Fibrin) رۆڵێکی سەرەکی هەیە لە کرداری مەیینی خوێندا}.

## رەشکە و دەردانی ماددەی زراو:

ماددەی زەرد یان زەرداو (الصفراء Bile) بریتییە لەو گوشراوەی کە لە پلەکانی جگەردا دروست دەبێت و دەچێتە ناو توورەکەی زراوەوە (کیس الصفراء او المرارة Gall bladder)، کە پاشان لەوێوە و بە کاریگەریی هۆرمۆنی (Cholecystokinin) دەڕژێنرێتە ناو ریخۆڵەی دوانزەگرێوە، پێکهاتەی گرنگی زەرداو بریتین لە ترشەڵۆکە زراوییەکان (الأحماض الصفراوية Bile Acids) کە

لـه جگـەردا و لـه مـاددەی (کۆلیسـترۆڵ)ەوە دروسـت دەبـن، و چـەندین کـاری سوودبەخشـیان هەیـە، لەوانـە: ئاسـان کردنـی دەرکردنـی مـاددەی کۆلیسـترۆڵی زیانبەخش لە لەش، و شیکردنەوە و هەڵمژینی چەوری‌یەکان بۆ ناو لەش.

دروستبوونی بەردی زراو لە زەرداوەوە نەخۆشی‌یەکی باوە، لە توێژینەوەیەکدا کە (د.محمد الدخاخني) پێی هەستا لەسەر مشك، بینی کە پێکهاتەی (کاربۆنیلی و ثیوکینـون) کـە دوو پێکهاتـەی سـەرەکی رەشـکەن، توانـای زیـادکردنی دەردانـی زەرداویان هەیە لە کیسی زەرداوەوە، کە ئەمە پارێزەرێکە لە تووش بوون بە بەردی زراو، هەروەها بینراوە کە ئەو دوو ماددەیە دەبنە هۆی زیادکردنی رێژەی دەردانـی زەرداو و ترشەڵۆکە زراوی‌یەکانی تواوە لەناوی‌دا.

## رەشکە و دەردانی شیر:

زۆر جـار ئافرەتـە شـیردەرەکان سـکاڵای ئـەوە دەکـەن کـە شـیرەکەیان بـەرەو کەمبوونـەوە دەچێت، بەهۆیـەوە لەوانەیـە هەنـدێك لـەو شیردەرانە واز لـە شیردانی سروشتی منداڵەکانیان بهێنن، یان پەنا بۆ هەندێك هۆکاری ناتەندروستی ببـەن بۆ زیـادکردنی شـیرەکەیان، هـەر لەکۆنـەوە موسـوڵمانان رەشـکەیان وەك ماددەیـەکی شیردەر یان شیر زیادکەر ناسیوە، ئەوەتا زانا (إبن القيم) دەڵێت: شـونیز (رەشـکە) ئەگـەر بکرێتـە نـاوەوە و بخورێتـەوە بـۆ چـەند رۆژێـك دەبێتـە هـۆی زیـادکردنی دەردانی شیر، و هەروەها میز و خوێنی بێنوێژیش، با بزانین توێژینەوە زانستی‌یە نوێکان چی دەڵێن؟

(د. ئـاگرا والا) و هاورێکـانی لـە کۆلیـژی (شـاه) لـە شـاری (جامناگـار) لـە هیندستان هەستان بەسازدانی توێژینەوەیەك لەسـەر مشـك بۆ زانینـی کاریگـەریی رەشکە لەسەر شیردان یەکسەر پاش منداڵبوون، ئەم مشکانە کران بە ٣ گروپـەوە: گروپێکیان لەسەر خواردنێکی ئاسایی دانران، گروپـی دووەم خواردنێکیـان درایـە کە رەشکەی تێدابوو، گروپەکەی تر خۆراکەکەیان جۆرێك لـە بـەهاراتی تێکرا، ئـەم تاقی‌کردنەوەیە ١٤ رۆژی خایاند (لەبەرئەوەی بەچکەی مشك تـەنها ٢٠ رۆژ شـیری دایکی دەخوات)، رادەی زیـادبوونی کێشـی بەچـکە مشـکە شیر خۆرەکان کـرا بـە

پێوانە بۆ کاریگەریی هەر سێ جۆری رژێمە خۆراکی‌یەکان، و دوای تەواو بوونی تاقی‌کردنەوەکە نموونە لە گوان و مەمکی دایکە مشکەکانیش وەرگیرا و لە تاقیگە پشکنینیان لەسەرکرا، ئەنجامی توێژینەوەکە و تاقی‌کردنەوەکان بەم شێوەیە بوو:

١- کێشی هەموو بەچکەکان بەگشتی زیادی کردبوو، هیچ جیاوازی‌یەکی ئەوتۆ نەبوو لە نێوان کێشی ئەو بەچکانەی کە خواردنێکی ئاسایی‌یان پێ‌درابوو لەگەڵ ئەو بەچکانەی کە خواردنە بەهاراتاوی‌یەکەیان پێ‌درابوو، کەواتە ئەو جۆرە بەهاراتە هیچ جۆرە خاسی‌یەتێکی زیادکردنی شیری تێدا نی‌یە.

٢- جیاوازی‌یەکی بەرچاو هەبوو لە زیاد بوونی کێشی ئەو بەچکانەی کە رەشکەیان درابوویە لەچاو ئەو بەچکانەی خۆراکی ئاسایی‌یان پێ‌درابوو، کە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی رەشکە کاریگەریی‌یەکی بەهێزی زیادکەری شیر دروست کردن و شیر دەردانی هەیە.

٣- بە پشکنینی ئەو نموونانەی لە گوانی مشکە دایکەکان وەرگیرابوو بینرا کە خانەکانی مەمکی ئەو مشکانەی رەشکەیان پێدرابوو زۆر گەورەتر و پێگەیشتووتر بوون لەچاو ئەو مشکانەی خۆراکی ئاسایی‌یان پێ‌درابوو.

لەمانەوە توێژەرەوەکان گەیشتنە ئەو راستی‌یەی کە رەشکە کاریگەریی‌یەکی بەهێزی هەیە لە زیادکردنی شیر دەردان لەلای دایکان و هەروەها دەبێتە هۆی باشتر کردنی پێگەیشتنی خانەکانی مەمکیش، ئەمە دەبێتە هۆی یارمەتیدانی دایکی شیردەر بۆ ئەوەی بەردەوام بێت لە شیر پێدانی کۆرپەکەی، و لە کەمبوونی رێژەکەیشی نەترسێت ئەگەر بێتو رەشکە بەکاربێنێت، چونکە بەشێوەیەکی زانستی سەلماوە کە شیری دایک باشترین خۆراکە بۆ منداڵی ساوا و تازە پێگەیشتوو.

لەلایەکی ترەوە (د. افروز الحق) کە پزیشکێکی توێژەرەوەیە لەم بوارەدا دەڵێت: سەلماوە کە رەشکە توانای جنسی بەهێز دەکات، دەبێتە هۆی دواخستنی عادەی مانگانە لای ئافرەت و دەردانی شیری دایک زیاد دەکات، هەروەها توانای وەڵامدانەوە و کاردانەوە لای مرۆڤ زیاد دەکات، و بیریشی باشتر و چالاکتر دەکات.




**T-Lymphocyte**
Scanning electron micrograph of a normal T-lymphocyte. T-lymphocytes are specialized white blood cells that identify and destroy invading organisms such as bacteria and viruses. Some T-lymphocytes directly destroy invading organisms, whereas other T-lymphocytes regulate the immune system by directing immune responses.

**رۆڵی رەشکە لە بەرگری لەشدا:**

لە لەشی مرۆڤدا کۆئەندامێکی تایبەتی هەیە کە بەرگری لە مرۆڤ دەکات، وەك سوپایەکی تایبەت وایە لە دژی هەموو ماددەیەکی زیانبەخش و میکرۆب و خانە شێرپەنجەیی‌یەکان، ئەم سیستمە لە چەندین خانەی تایبەتمەند پێك دێت، وەك: خانە لیمفی‌یەکانی جۆری (T): {کە ئەمانیش سێ جۆرن: خانەکانی (T)ی یارمەتیدەر یان (T - Helper Cells)، خانەکانی (T)ی کوژەر (T- Killer Cells) و خانەکانی (T)ی هێورکەرەوە (T- Suppressor Cells)}، هەروەها جۆری (B) {B-Lymphocytes} و خانە قووتدەرە گەورەکانیش (Macrophages).

جەنگ لە دژی ماددە زیانبەخشەکانی دەچنە ناو لەشەوە لە خانە قووتدەرەکانەوە دەست پێ‌دەکات، کاتێك چواردەوریان دەدەن و قووتیان دەدەن، و هەڵدەستن بە بانگکردنی خانەکانی یارمەتیدەر، و هەروەها رژاندنی ماددەکانی (Interleukine و Lymphokine)، کە خانە کوژەرەکان چالاك دەکات (کە میکرۆبەکان دەکوژن)، و لە هەمان کاتدا کار دەکاتە سەر سەنتەرەکانی مێشك بۆ بەرز کردنەوەی پلەی گەرمی لەش و (تا) روودەدات، کە ئەمیش دەبێتە هۆی چالاکتر کردنی کۆئەندامی بەرگری.

هەروەها خانەکانی (B) هەڵدەستن بە رژاندنی دژە تەنەکان بۆ لەناو بردنی ماددە زیان بەخشەکان و ئاسان کردنی قووتدان و پاك کردنەوەیان، بە هۆی

بوونەوەی ئەم هەموو سەربازانە لە مەیدانی جەنگەکەدا لەش دەتوانێت بەسەر
ربەی میکرۆبەکانی نەخۆشی‌دا سەرکەوێت و لەناویان بەرێت، لە کۆتایی‌دا خانە
ێورکەرەوەکان ئیشارەت دەدەن بە هەموو خانەکانی تر کە جەنگ تەواو بووە و
ێویستە هەموو خانەکان هێور ببنەوە و چالاکی‌یان خاو ببێتەوە، ئەگەر ئەم خانە
ێورکەرەوانە ژمارە و چالاکی‌یان کەم بێتەوە، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە چالاکی
ناوبەری خانەکانی بەرگری بەردەوام لە زیاد بووندا دەبێت، و کاتێك دوژمنی
ەرەکی نامێنێت کە لەناوی بەرن، ئەم خانانە هەڵدەستن بە هێرش کردنە سەر
انە ئاسایی‌یەکانی لەش، و زیان بە لەش خۆی دەگەیەنن، لێرەوە گرنگی
ەورەی ئەم خانانەمان بۆ دەردەکەوێت.

لە توێژینەوەیەکدا کە هەردوو زانا: (د.أحمد القاضي) و (د.اسامة قنديل) لـــە
ـەیمانگای (لکبـر) لە (فلۆریدا) لە ئەمریکا پـێ‌ی هەستان لەسەر کاریگەریـــی
ەشکە لەسەر کۆئەندامی بەرگری، ٢٧ خۆبەخشیان هێنا و کران بە دوو گروپەوە،
روپی یەکەم ١ گم رەشکەیـان دانـێ رۆژی ٢ جـــار، گرووپـــی دووەم تـــەنها
ماددەیـەکـــی چالاککـــەریان دانێ، پاشـان هەستـــان بـە هەڵسەنگاندنی کـاری
کۆئەنـدامی بـەرگری لـە هـەردوو گروپەکـەدا، بینی‌یـان لـەو کەسانەی رەشـکەیان
درابوویـــە خانـــە لیمفاوی‌یـــە پارمەتیـدەرەکان و هێورکـەرەوەکان بەرێـــژەی ٥٥٪
بەرزبوو بوونەوە، هەروەها خانە کوژەرەکانیش بەرێژەی ٣٠٪ بەرزبوو بوونەوە، کە
زیاد بوونێکی بەرچاو دەردەخات.

هەروەها بەم نزیکانە هەردوو ئەم توێژەرەوەیە ئـەنجامی توێژینەوەیەکی تریان
بڵاوکردەوە لەسەر هەمان بابەت، هەستان بە هەڵبـژاردنی ١٩ کەس (لە نێوان ١٢-
٥٠سـاڵ) کـە تەندروسـت دیـاربوون و بـە هەڕەمـەکی کردیـانن بـە دوو گروپـەوە،
بەهەمان شێوە گروپی یەکەم کە ١١ کەس بوون ١ گم رەشکەیان درایە رۆژی ٢جار،
گروپـی دووەم کـە ٨ کـەس بـوون تـەنها ماددەیـەکی چـالاککەریان درایـە، مـاوەی
تاقیکردنەوەکە ٤ هەفتە بوو، پاشان ئەم کەسانە پێوانی ژمارەی لیمفە خانەکانیان
بۆ کـرا، بینی‌یـان لـەو کەسانەی کـە رەشـکەیان درابوویـە بـە شێوەیەکی بەرچـاو

ژمارەی لیمفە خانەکانیان زیادی کردبوو بە تایبەتی خانە کوژەرەکان، تەنانەت بینییان ژمارەی خانە هێورکەرەوەکان بەرێژەی ٧٢٪ زیادی کردبوو، کە دووبارە دەرەنجامێکی بەرچاوە.

لێرەوە توێژەرەوەکان گەیشتنە ئەم راستییانە:

١-خواردنی رەشکە لە رۆژێکدا ١ گم دوو جار دەبێتە هۆی بەهێزکردنی کار و چالاکییەکانی کۆئەندامی بەرگری مرۆڤ.

٢-لە لایەکی ترەوە لەوانەیە ئەم چالاککەرە سروشتییە (رەشکە)، رۆڵێکی گرنگی هەبێت لە چارەسەر کردنی شێرپەنجە و نەخۆشی ئەیدز (AIDS)، و ئەو نەخۆشییانەی تر کە پەیوەندییان بە لاوازی بەرگری لەشەوە هەیە.

## رەشکە و نەخۆشی شێرپەنجە (السرطان):

گۆڤاری بەناوبانگی (Cancer Letters) لە ساڵی ١٩٩٢دا توێژینەوەیەکی بڵاو کردەوە سەبارەت بە کاریگەریی رەشکە لەسەر وەرەمە شێرپەنجەییەکان، توێژەرەوەکان بینییان کە پێکهاتە وەرگیراوەکان لە رەشکە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی چالاکی خانە شێرپەنجەییەکانی پێست لە مشکدا، لێرەوە گەیشتنە ئەوەی کە رەشکە چالاکییەکی لاوازکەری هەیە بۆ شێرپەنجە، هەروەها لە توێژینەوەیەکی تر کە لە (میسر) کرا بینرا کە زەیتی رەشکە دەبێتە هۆی رێگرتن لە پەیدابوونی شێرپەنجەی پێست لە مشکدا بە رێژەی ٨٠٪، هەروەها لە پەیمانگای (اکبر)یش لە (فلۆریدا) توێژینەوەیەکی تر کرا و بینرا کە هاوپراوەی رەشکە بووە هۆی کەمکردنەوەی قەبارەی وەرەمە سەرەتانییەکان، و زیادکردنی خانە لیمفییە یاریدەدەرەکان.

هەروەها زانراوە کە دەرمانەکانی دژی شێرپەنجە دەبنە هۆی چەندین کاریگەریی لاوەکی زیانبەخش بۆ نەخۆشەکە، لەوانە کەم کردنەوەی ژمارەی خرۆکە سپییەکانی خوێن و کەمخوێنی، (Cisplatin) یەکێکە لە دەرمانە دژە شێرپەنجە ناسراوەکان کە ئەم کاریگەرییە لاوەکییانەی هەیە، چەند توێژەرەوەیەك لە هیندستان ساڵی (١٩٩١) هەستان بە توێژینەوەیەك لەم بوارەدا و

بنی‌یان کە بەکارهێنانی پاڵفتەی رەشکە دەبێتە هۆی رێگرتن لە روودانی ئەم
اریگەری‌یە لاوەکی‌یانەی (Cisplatin)، کە بووە هۆی بەرز کردنەوەی رێژەی
ـرۆکە سپی و سوورەکانی خوێن (RBC & WBC).

| Site | New Cases | | | Deaths | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | Total | Male | Female | Total | Male | Female |
| Melanoma of skin | 47,700 | 27,300 | 20,400 | 7,700 | 4,800 | 2,90 |
| Other skin* | 9,200 | 6,800 | 2,400 | 1,900 | 1,200 | 70 |
| Lung, larynx, and other respiratory | 164,100 | 89,500 | 74,600 | 156,900 | 89,300 | 67,60 |
| Breast | 184,200 | 1,400 | 182,800 | 41,200 | 400 | 40,80 |
| Oral and pharynx | 30,200 | 20,200 | 10,000 | 7,800 | 5,100 | 2,70 |
| Esophagus | 12,300 | 9,200 | 3,100 | 12,100 | 9,200 | 2,90 |
| Stomach | 21,500 | 13,400 | 8,100 | 13,000 | 7,600 | 5,40 |
| Small intestine | 4,700 | 2,300 | 2,400 | 1,200 | 600 | 60 |
| Colon, anus, and rectum | 133,600 | 65,000 | 68,600 | 56,800 | 28,000 | 28,80 |
| Liver, gallbladder, and bile passages | 22,200 | 12,900 | 9,300 | 17,200 | 9,700 | 7,50 |
| Pancreas | 28,300 | 13,700 | 14,600 | 28,200 | 13,700 | 14,50 |
| Other digestive | 4,000 | 1,100 | 2,900 | 1,300 | 500 | 80 |
| Bladder, kidney, and other urinary | 86,700 | 58,600 | 28,100 | 24,600 | 15,700 | 8,90 |
| Leukemia | 30,800 | 16,900 | 13,900 | 21,700 | 12,100 | 9,60 |
| Lymphoma | 62,300 | 35,900 | 26,400 | 27,500 | 14,400 | 13,10 |
| Bone and joint | 2,500 | 1,500 | 1,000 | 1,400 | 800 | 60 |
| Multiple myeloma | 13,600 | 7,300 | 6,300 | 11,200 | 5,800 | 5,40 |
| Endocrine system | 20,200 | 5,600 | 14,600 | 2,100 | 1,000 | 1,10 |
| Eye and orbit | 2,200 | 1,200 | 1,000 | 200 | 100 | 100 |
| Brain and nervous system | 16,500 | 9,500 | 7,000 | 13,000 | 7,100 | 5,900 |
| Ovary | 23,100 | – | 23,100 | 14,000 | – | 14,000 |
| Uterus | 36,100 | – | 36,100 | 6,500 | – | 6,500 |
| Cervix | 12,800 | – | 12,800 | 4,600 | – | 4,600 |
| Other female genital | 5,500 | – | 5,500 | 1,400 | – | 1,400 |
| Prostate | 180,400 | 180,400 | – | 31,900 | 31,900 | – |
| Testis | 6,900 | 6,900 | – | 300 | 300 | – |
| Other male genital | 1,100 | 1,100 | – | 300 | 300 | – |
| Other and unspecified sites | 34,000 | 15,700 | 18,300 | 36,600 | 18,500 | 18,100 |
| **All sites** | **1,220,100** | **619,700** | **600,400** | **552,200** | **284,100** | **268,100** |

***Excludes an estimated 1 million cases of basal and squamous cell skin cancers**

Source: American Cancer Society \ 2002.

**سەرژمێری ساڵی ٢٠٠٢ی شێرپەنجە لە ئەمریکا (جۆرەکەی، ژمارەی مردووانی نێر و مێ ڕەگەز)**

## توێژینەوە نوێکان لەسەر کاریگەریی ڕەشکە :

توێژینـــەوە نوێکـــان لەســەر ڕەشــکە کاریگـەریی دژە گەشەکردنی میکرۆبـی (بـەکتیریی) ڕەشـکەیان دەرخسـتووە، بـە تایبـەتی بـۆ بـەکتریاکانی نەخۆشـی لـە جۆرەکـانی: ( E. coli, Streptoco. Fecalis, Bacillus subtilis, Staphyll. Aureus, Proteus vulgaris & Pseudomonas)، هەروەها کاریگەریی دژە کەڕووش لە دژی کەڕووی جۆری (Candida albicans).

هـەروەها دەرکـەوتووە کـە ڕەشـکە بـۆ خۆپاراسـتن لـە هـەوکردن و کلـۆریی ددان سـوودمەندە، هـەروەها بـەم نزیکانـە لـە توێژینەوەیـەك لـە (بـەنگلادیش) کاریگـەریی زەیتە بە هەڵم بووەکەی ڕەشکە لەسەر میکرۆبەکانی سکچوون لە جـۆری کـۆلیـــرا و شـیگێلـــلا (Shigella) دەرکـــەوت، کە لە دەفری تاقی کردنەوەدا بووە هـۆی لاوازکردنی زیادبوونیان و پووکانەوەیان.

بەم دواییەیانەش چەند کاریگەرییەکی گرنگی ڕەشکە دەرکەوت لە دابەزاندنی ڕێژەی شەکر لە خوێندا بە تایبەتی لەو کەسانەی کە نەخۆشی شەکرەیان هەیە، و لە لایەکی تریشەوە توێژینەوەیەکی تر کە لە زانکۆی (King) لە لەندەن کرا بینرا کە زەیتی ڕەشکە زۆر کاریگەر بووە لە دابەزاندنی دوو ماددەی بەرپرس لـە ئازار و هەوکردن لـە نەخۆشـییە ڕۆماتیزمییەکانـدا، کـە ئـەوانیش ( Thromboxane B2, Leukotriene B4) بوون.

ئەمانە و چەندین توێژینەوەی نوێی تر کە لە لایەن زانا بەناوبانگـەکانی بـواری پزیشکی و دەرمانسازی لە هەموو جیهاندا ئەنجام دراون، بەڵگـەن لەسـەر پیرۆزیـی و گرنگـی ئـەم ڕووەکـە و تۆوەکـەی کـە زۆر جوانـە لـە سـوننەتدا ناونراوە بـە تـۆوی پیرۆز (حبة البركة).

## پوختەی باس:

ئەمانەی لە سەرەوە باسکران گەورەیی و پیرۆزی ئەو فەرموودانە پێغەمبەرمان (ﷺ) بۆ روون دەکاتەوە کە سەبارەت بە رەشکە و سوودەکانی فەرموویەتی، کە ئەمەش سەلمێنەرێکی تری موعجیزەی زانستین لەو فەرموودە پیرۆزانەشدا، و لە رۆژگاری ئەمڕۆدا کەس ناتوانێت رەخنە لەو فەرموودانە بگرێت و هەموو راستی‌یەکی زانستی نوێی ئەمڕۆ پشتگیریی‌یان دەکەن.

لە لایەکی ترەوە بابزانین کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: رەشکە شیفای تێدایە، ووشەی (شفاء)ی بە تەنیا هێناوە واتە (نکرة)یە، کە مەبەست پێی ئەوە نی‌یە کە رەشکە تەنیا شیفایە، بەڵکو دەرمانی تر هەیە بۆ چارەسەری نەخۆشی کە هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) خۆی دەفەرموێت: ﴿إنَّ اللهَ أنْزَلَ الدَّاءَ وَ الدواء، وَ جَعَلَ لِكُلِّ داءٍ دَواءً فَلا تَـداوَوْا بِـالْمُحَرَّم﴾ رواه مسلم، واتە: خوای گەورە هەر ئەوە کە نەخۆشی و دەرمانیشی ناردووەتە خوارەوە، بۆ هەموو نەخۆشی‌یەکیش دەرمانێکی بۆ داناوە، لەبەر ئەوە ئەی بەندەکانی خودا نەخۆشی‌یەکانتان چارەسەر بکەن بەڵام بە شتی حەرام نەبێت، هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: ﴿لِكُلِّ داءٍ دَواء، فَإذا أصابَ الدَّواء الدَّاءَ بَـرِيءَ بِـإذْنِ الله﴾ رواه مسلم، واتە: بۆ هەموو دەردێك دەرمان هەیە، هەر کاتێك دەرمانەکە بگات بە نەخۆشی‌یەکە ئەوا بە ویستی پەروەردگار چاك دەبێتەوە، کەواتە موسوڵمان دەبێت بە دوای چارەسەری گونجاودا بگەڕێت بۆ نەخۆشی‌یەکانی، بەڵام لە هەمان کاتدا ئامۆژگاری‌یە خودایی‌یەکانیش پشتگوێ نەخات.

لە لایەکی ترەوە مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەکەی: ﴿عَلَيكم بِهذهِ الحَبَّةِ السَّوداء، فإنَّ فيها شِفاءً من كُلِّ داءٍ...﴾ ئەوە نی‌یە کە رەشکە بۆ هەموو نەخۆشی‌یەك کە ناسراوە چارەسەرە، بەڵکو وەك زانایان دەڵێن: مانای ئەم فەرموودەیە شتێکی گشتی‌یە کە مەبەست پێی شتێکی تایبەتی‌یە (العام الذي يراد به الخاص)، هەروەك موفەسیر و زاناکانی وەك: (الخطابي، إبن حجر، علي الطنطاوي، محمد علي الصابوني) بەم شێوەیە راڤەیان کردووە.

ئەم شێوە گوفتارە لە قورئانیشدا نموونەی زۆرە، ئەوەتا پەروەردگار لە باسی لەناوبردنی قەومی (عاد)دا دەفەرموێت: ﴿تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَـا﴾، واتە: ئەو رەشەبایەی کە خوای گەورە ناردی‌یە سەر ئەو خەڵکە تاوانبارە هەموو شتێکی لەناودەبرد و تێك و پێکی دەشکان بە فەرمانی خودا، لێرەدا مەبەست لەو شتانەی کە لەناوبران بریتی بوون لە خانووەکان و مرۆڤەکان، بەڵام شاخەکان و رووبارەکان و خۆر و مانگ (کە ئەمانیش هەر شتن) لەناو نەبران و وەك خۆیان مانەوە، ئەمە نموونەیەکە لەو زاراوە گشتی‌یەی کە مەبەست پێی چەند شتێکی تایبەتی‌یە.

لێرەوە مانای راست و دروستی فەرموودەکە ئەوەیە کە رەشکە شیفا و چارەسەری تێدایە بۆ زۆرێك لە نەخۆشی (نەوەك هەموو نەخۆشی‌یەك بەڕەهایی)، کە ئەمە رێگر نی‌یە لەوەی کە دەرمانی تری جۆراو جۆر بۆ چارەسەر بەکار بهێنین وەك پێغەمبەر (ﷺ) پێی راگەیاندووین.

هیوادارم توانیبێتم چەند شتێکی کەم لە دەریای موعجیزەکانی سوننەتی پیرۆزم روون کردبێتەوە و بەڵگەیەکم دابێت بە دەستەوە لەسەر راستی فەرموودەکانی قورئان و سوننەت بە گشتی، ئەمەش بەتایبەتی بۆ کەسانێکە کە بیر بکەنەوە و تێبگەن: ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾.

الله محمد

سەرچاوەکان:

١-فتح الباري شرح صحيح البخاري/ لإبن حجر العسقلاني.

٢-صحيح مسلم بشرح الإمام النووي.

٣-الطب النبوي لإبن القيم.

٤-الشفاء بالحبة السوداء بين الإعجاز النبوي و الطب الحديث/ الدكتور حسان شمسي باشا/ الطبعة السادسة ١٩٩٩.

**5-Davison's Principles & Practice of Medicine\ 19th Edition 2002 / Churchill Livingstone - UK.**

**6-Encyclopedia Britannica 2006 Ultimate reference suite DVD.**

﴿10﴾

# موعجیزەی چارەسەرکردن به هەنگوین و ئەوەی له سکی هەنگەوە دەردەچێت و چەند راستی یەکی سەلمێنراو

## هاندەری ئەم لێکۆڵینەوەیە:

لە کاتی گەڕانمدا بەناو سەرچاوە پزیشکی یەکان بە زمانی ئینگلیزی و عەرەبی بۆ بابەتی پزیشکی سەبارەت بە هەنگوین و سوودەکانی لە چارەسەری نەخۆشی یە جیاوازەکاندا چەندین شتی سەرسوڕهێنەرم بینی، لەم گەشتەدا چەندین سەلمێنەر و بەڵگەی سەرسوڕهێنەرم بینی لەسەر ئیعجازی زانستی قورئان و سوننەتی پیرۆز، لێکۆڵینەوەیەکم لە گۆڤاری پزیشکی بەریتانی‌دا (B.M.J.) بینی کە باسی ئەوە دەکات: پێدانی هەنگوین بەو منداڵانەی تووشی سکچوون بوو بوون بووە هۆی زووتر چاك بوونەوەیان، لێرەدا ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرم (ﷺ) بیرکەوتەوە کە ئیمامی (بوخاری) گێڕاوێتی یەوە: کاتێك پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر و ووتی: براکەم تووشی سکچوون بووە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەنگوینی بدەرێ، ئەوە بوو سێ جار ئەم کەسە هاتەوە و ووتی براکەم چاك نەبوو، پێغەمبەر هەر پێی دەفەرموو: هەنگوینی بدەرێ، ئەوەبوو لە چوارەم جاردا کە هەنگوینی دایە سکچوونەکەی چاك بوو.



هەروەها توێژینەوەیەکی ترم بینی لە گۆڤاری نەشتەرگەری بەریتانی‌دا، سەبارەت بە بەکارهێنانی هەنگوین بۆ چارەسەر کردنی ئەو برین و هەوکردنانەی پێست کە بە دەرمانە دژە بەکتیری یە بەهێزەکان چارەسەری نەبوو، و هەنگوین بووە هۆی چاك بوونەوەیان بە تەواوەتی، لێرەشدا هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر (عبدالله ی کوڕی عومەر)م بیر کەوتەوە کە هەر کاتێك تووشی برین یان هەوکردنی هەر شوێنێکی لەشی دەبوو هەنگوینی

دەخستە سەری (وەك لە تەفسیری (القرطبی)دا هاتووە)، ئایا (عبدالله ی کوڕی عومەر) یەکێك نەبووە لە هاوەڵ و قوتابی‌یە دڵسۆزەکانی قوتابخانەی محمد (ﷺ)؟!

هەروەها خوێندمەوە کە لە یەکێتی سۆڤێتی جاران و ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا چەندین نەخۆشخانەی تایبەت هەبووە کە نەخۆش تیایاندا تەنها بە هەنگوین و بەرهەمەکانی تری هەنگ چارەسەر دەکران، بۆ ئەم نەخۆشخانانە ئەو کەسانە دەهاتن کە نەخۆشی‌یەکانیان بە دەرمانی پزیشکی چارەسەر نەدەکرا و زۆریان چارەسەر دەکران بەم پێکهاتووانە، لێرەدا ووتەی پەروەردگارم بیر کەوتەوە کە دەفەرموێت: ﴿يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِّلنَّاسِ﴾، واتە: لە سکی هەنگەوە شلەیەك دێتە دەرێ کە چەند جۆر و چەند ڕەنگێکە و ئەم شلەیە شیفا و چارەسەری بۆ خەڵکی تێدایە.

لێرەوە بیرم لەوە کردەوە کە لێکۆڵینەوەیەکی زانستی نوێ سەباردت بە هەنگوین و پێکهاتووەکانی تری هەنگوین و سوودەکانی لە بەکارهێنانە پزیشکی‌یەکاندا بڵاوبکەمەوە بە زمانی شیرینی کوردی بۆ ئەوەی هاونیشتمانانم لەم زانیاری‌یە بەسوودانە بێ‌بەش نەبن و لە لایەکی تریشەوە گەورەیی موعجیزەی قورئان و سوننەتیان لە بواری زانستی‌دا بۆ دەربکەوێت، لەم باسەدا پشتم بە سەرچاوە زانستی‌یە نوێکان بەستووە لە بوارە پزیشکی‌یە جۆراوجۆرەکاندا.



## کورتەیەکی مێژوویی:

مرۆڤ هەر لە کۆنەوە هەنگوینی ناسیوە و بەکاری هێناوە بۆ چارەسەری نەخۆشی، میسری‌یە کۆنەکان یەکەم کەسێك بوون کە باسی

بەکارهێنانەکانی هەنگوینیان کردووە لە چارەسەردا، لە یەکەم کتێبێکی پزیشکی ناسراو لە مێژوودا کە بریتی‌یە لە پەڕە نووسراوەکانی سەر قامیش و زەل (أوراق بردي بابيرس) کە لە نزیکەی ۲۰۰۰ ساڵ پێش زایـیـندا پـەیـدا بـووە بـاسی هـەنگوین کـراوە لـە چارەسـەردا، هـەروەها هـەنگوین لـە زیـاتر لـە ۵۰۰ گـیراوەی پزیشـکیی ئـەو سـەردەمەدا بـەکار هـاتووە وەك لـە کتێبـی پزیشـکی بـەناوبانگی میسری‌یە کۆنەکان (أوراق بردي سميث Smith Papyrus)دا هاتووە.

یۆنانی و رۆمانی‌یەکانیش هەنگوینیان ناسیوە، (لرسطو طاليس)ی یۆنانی لە سەدەی چواری پێش زاییندا لە سەر سوودەکانی نووسیوە، بلینی (Pliny) کە لە نێوان (۲۳-۷۹)ی پێش زاییندا ژیاوە نووسیوێتی: (ئەگەر مرۆڤ بیەوێت تەمەنی درێـژ بێـت لـە دونیـادا و ژیـانێکی تەندروسـت بـژی ئـەوا دەبێـت هـەموو رۆژێـك هەنگوین بخوات)، هەروەها (أبو قراط)یش کە بە باوکی زانستی پزیشکی ناسراوە وەسـفی هـەنگوینی کـردووە و بـە دەرمـانێکی کاریگـەری دانـاوە بـۆ بـرین و کـێم دەردان، و باسـی ئەوەشـی کـردووە کـە بـۆ چارەسـەری نەخۆشـی‌یەکانی سنگ و پێست بەسوودە.

لـە لای چینی و هیندی‌یـە کۆنـەکانیش هـەنگوین وەك چارەسـەرێکی سروشـتی بەکار هاتووە بە تایبەتی لە برینەکان و نەخۆشی‌یە ئالۆزەکانی پێستدا و هـەروەها بۆ چارەسەری تەنگەنەفەسی، تەنانـەت هـەنگوینیان نـاو نـاوە بە دەرمـانی نـەمریی (دواء الخلـود)، تـا ئێسـتاش هـەنگوین رۆڵێکـی گـەورەی هەیـە لـە چارەسـەرە میللی‌یەکانی(الطب الشعبي) زوربەی وولاتانی دونیادا..

## هەنگوین لە قورئاندا:

خـوای گـەورە وەسـفی رووبارەکـانی بەهەشـتمان بـۆ دەکـات کـە بـۆ ئیمانـداران ئامادە کراوە و دەفەرموێت: ﴿مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ فِيهَا أَنْهَارٌ مِّن مَّـاءٍ غَيْـرِ آسِنٍ وَ أَنْهَارٌ مِن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ وَ أَنْهَارٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ وَ أَنْهَارٌ مِّنْ عَسَـلٍ مُّصَفًّى.....﴾(محمد:۱۵)، واتـە: نموونـەی ئـەو بەهەشـتەی بـۆ پارێزکاران ئامادە کراوە رووباری تێدا لە ئاوێکی بێ‌خڵتە و خەوشی، و رووباری تێدایە لە شیرێك کە

تامی نەگۆڕاوە و ناگۆڕێت، و لە شەرابێك كە لەزەت و خۆشی تێدایە بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە، هەروەها رووباری تێدایە لە هەنگوینی پاڵفتە كراو.

لە لایەكی ترەوە خوای پەروەردگار لە سوورەتی (النحل)دا باسی هەنگ و هەنگوینمان بۆ دەكات و دەفەرموێت: ﴿وَ أَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَ مِنَ الشَّجَرِ وَ مِمَّا يَعْرِشُونَ {٦٨} ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلاً يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاء لِلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ {٦٩}﴾، واتە: پەروەردگار هەنگی فێر كردووە كە شاخەكان و درەختەكان و شانەكان بكاتە خانوو و لانكە، پاشان فەرمانمان پێكرد كە لە هەموو میوە بخوات، و سوود وەرگرێت و ئەو رێگا ئاسانكراوانەی كە لەلایەن خوداوە بۆی دانراوە بگرێت، لە سكی هەنگەوە شلەیەك دێتە دەرێ كە چەند جۆر و چەند رەنگێكە، و ئەم شلەیە شیفا و چارەسەری بۆ خەڵكی تێدایە، بە ڕاستی ئەمە بەڵگەیەكە بۆ كەسانێك كە بیردەكەنەوە.

ووتەی موفەسیرەكانی قورئان:

- ئیمامی (الفخر الرازي) لە تەفسیرەكەی دا دەڵێت: مەبەست لێرەدا ئیلهامی خودایی یە بۆ ئەم زیندەوەرە وردە كە بە چەند كارێك هەڵدەستێت كە بلیمەتەكانی مرۆڤیش بەرامبەری دەستەوسانن، لەوانە:

١- خانووی شەش پاڵوو (شەش لا)ی یەكسان دروست دەكات، كە هەموویان هاو قەبارە و یەكسان و هاوشێوەن، و مرۆڤە زیرەكەكان تەنها بەهۆی راستە و پرگاڵەوە دەتوانن دروستی بكەن.

٢- لە رووی ئەندازیاریی یەوە سەلماوە كە ئەگەر ئەو خانووانە بە شێوازی تر غەیری شەش پاڵوویی بنیات بنرێت، ئەوا لە نێوانیاندا بۆشایی فەوتا و سوود لێوەرنەگیراو دەمایەوە، گەیشتنی ئەم زیندەوەرە لاوازە بەم دانایی یە گەورەیە شتێكی زۆر سەرسوڕهێنەرە!.

٣- لەناو هەنگدا یەكێكیان تێدایە كە سەرۆكیانە و لەوانی تر گەورەترە، و فەرمانی بەسەر هەموویاندا دەڕوات و خزمەتی دەكەن.



# أسرار العسل

## تتجلى في الطب الحديث

ما نال العسل حقه من اهتمام الباحثين الغربيين خلال العقود الماضية مثلما نال خلال السنتين الماضيتين، فقد نشرت عشرات الدراسات العلمية خلال العامين المنصرمين، ولا يكاد يمر أسبوع إلا ونجد دراسة علمية رصينة حول العسل تنشر في المجلات العالمية الموثقة.

فالله ـ سبحانه وتعالى ـ يقول في كتابه العزيز: ﴿وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ۞ ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِّلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ سورة النحل ٦٨ ـ ٦٩. ووردت في السنة النبوية الشريفة عدة أحاديث تذكر فوائد العسل وتحدد أهميته في العلاج:

فعن ابن عباس ـ رضي الله عنهما ـ قال: قال المصطفى صلى الله عليه وسلم: (الشفاء في ثلاثة: شربة عسل، وشرطة محجم، وكية نار وأنهى أمتي عن الكي) رواه البخاري. وعن ابن مسعود ـ رضي الله عنه ـ قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (عليكم بالشفاءين: العسل والقرآن) رواه ابن ماجة والحاكم في صحيحه.





شانە شەش پاڵووەکانی هەنگ موعجیزەیەکی ئەندازیارییە

٤- کاتێك ئەم سەرۆکە لە خانووەکەی دەردەچێت بۆ شوێنێکی تر، هەموویان لەگەڵی دەڕۆن و ئەگەر بیانەوێت بگەڕێنەوە چەندین جۆر دەنگ و مۆسیقا دروست دەکەن، تاوەکو دەیگەڕێننەوە بۆ خانووەکەی، کە ئەمەش شتێکی سەرسوڕهێنەرە.

- ئیمامی (قورطوبی)یش لە تەفسیرەکەیدا (الجامع لأحکام القرآن)دا دەڵێت: (وحي) لێرەدا بەمانای ئیلهامە، لە گەورەیی دەسەڵاتی خودا لە ژیانی هەنگدا ئەوەیە کە خانووەکەی بە شێوازی شەش پاڵوو دروست دەکات، چونکە شێوەکانی سێ‌پاڵو تا دە پاڵوویی ئەگەر بخرێنە پاڵ یەك نێوانەکانیان بە تەواوەتی پڕنابێتەوە، و بۆشایی‌یان تێ‌دەکەوێت، تەنیا شێوەی شەش پاڵوو نەبێت کە ئەگەر بخرێنە پاڵ یەك، یەك پارچەی تۆکمەی لێ‌دەردەچێت.

لێرەدا تێبینی ئەوە دەکەین کە ووتەی خودایی شێوازی (ئاخاوتن لەگەڵ مێینە)ی بەکار هێناوە (أنِ اتَّخذي)، کە ئەمە ئاماژەیەکی ئیعجازیی گەورەیە و یەك دەگرێتەوە لەگەڵ ڕاستی‌یەکانی دونیای هەنگدا، چونکە زۆربەی مێش هەنگەکان مێینە کارکەرەکانن و شاژنێکی مێینە سەرۆکایەتی‌یان دەکات، نێرینەکان زۆر کەمن و تەنها ڕۆڵیان بریتی‌یە لە پێشبڕکێ کردن لە پیتاندنی شاژندا و هەرکاتێك

ئەوە رووی‌دا نێرینەکان دەمرن، هەروەها پرسیارێکی تر دێتە ئاراوە کە ئایا بۆ پیتی (ثم) بەکار هاتووە لە دەستەواژەی (ثُمَّ كُلِي مِـن كُـلِّ الثَّمَـرَاتِ)، زانستی زمانەوانی بۆمان باس دەکات کە بەکار هێنانی پیتی (ثم) مانای خایاندنی ماوەیەك یان دواخستن دەگەیەنێت، با بزانین زانستی نوێ چ دیاردەیەکی دۆزیوەتەوە کە شایەتی بۆ ئیعجازی گەورەی قورئان دەدات.




کاتێك هەنگ لە شانەکەی دەچێتە دەرەوە بۆ بنیاتنانی شانەیەکی نوێ لەناو سکی‌دا بڕێکی زۆر لە هەنگوین هەڵدەگرێت بۆ ئەو گەشتە نەناسراوە، کاتێك خانووی نوێی دەدۆزێتەوە، سەرەتا پشوو دەدات بۆ خاڵی کردنەوەی ئەو هەنگوینە، کە هەندێکی دەکات بە مۆم بۆ ئەوەی کە خانە شەش پاڵووەکانی لێدروست بکات و هەنگوینەکەی ناوسکی تێدا خاڵی بکاتەوە، و پاشان دەچێتە دەرەوە و ملی ڕێگا دەگرێت بۆ گەڕان بەدوای خۆراکدا، کەواتە ماوەیەك دەخایەنێت لە نێوان خانوو دروست کردن و دەرچوون بۆ گەڕان بەدوای خۆراکدا، ئەمەش نموونەیەکی تری ئیعجازی قورئانە لەم ئایەتەدا.

هەروەها کە دەفەرموێت (مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ) واتە: لە هەموو میوەیەك بخۆ، دەبێت بۆچی یەکسەر نەیفەرموو بێت (ثم كلي من الثمرات)، واتە: پاشان لە میوەکان بخۆ، زانستی نوێی ناسینی هەنگ بۆمان باس دەکات کە هەنگ تەنیا لەو میوە شیرینانە دەخوات، کە درزیان بردووە لە گەیوی‌دا و میوە تاڵەکان ناخوات، کەواتە مەبەست لێرەدا لەو شتانەی دەیخوات دەبێت شتێك بێت کە هەموو میوە شیرین و تاڵەکان تێیدا بەشدار بن و هەیان بێت، کە ئەویش تەنیا شیلە و هەڵاڵەی گوڵەکانیانە کە هەموویان هەیانە، کەواتە مەبەست لە (مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ) بریتی‌یە لە شیلەی گوڵ کە هەموو میوەیەك هەیەتی.



هەروەها لە وردەکاری ئەم دەربڕینە قورئانی‌یە ئەوەیە کە پیتی (مِن) لە پێش (كُلِّ الثَّمَرَاتِ)دا هاتووە کە مەبەست پێی زۆربەی میوەکانە نەك هەموویان بە ڕەهایی (للتبضيع)، چونکە دۆزراوەتەوە کە هەندێك میوە گوڵەکانیان ئەندامی نێرینەی نی‌یە و هەڵاڵە و تۆو دروست ناکات، وەك: مۆز و هەندێك جۆر میوەی تر کە وەك بازدان لە میوەکانی تر پەیدا بوون و تۆویان نی‌یە.

ئەم زانیاری‌یانەش لە سەردەمی نوێ و لەم دوایی‌یانەدا نەبێت نەدۆزراونەتەوە، پاشان دەفەرموێت: (فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلاً) واتە ئەو ڕێگایانە بگرە کە پەروەردگار بۆی داناویت بە هێمنی، لە دۆزینەوەی ڕزق و ڕۆزیت و هەروەها لە دروست کردنی هەنگوین و بەرهەمەکانی تری هەنگ وەك: (خواردنی شاپانە، ژەهر، مۆم، هۆرمۆن و ئەنزایمەکان) کە لە شیلە و شیرینی گوڵەوە دروستیان دەکات.



لێرەدا پرسیارێکی تر دێتە مێشکمانەوە کە ئایا بۆ پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ﴾ واتە: لە سکی‌یەوە شلەیەك دەردەچێت، و بە ئاشکرا نەیفەرمووە کە هەنگوین ئەوەیە کە لە سکی هەنگەوە دەردەچێت؟

ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە هەنگ بە تەنها هەنگوین دروست ناکات، بەڵکو لەهەمان کاتدا خواردنی شاپانە (الغذاء الملكي)یش دروست دەکات کە کرمۆکەکانی هەنگ و شاژنی دواڕۆژ لەسەری دەژین، هەروەها ژەهری هەنگیش دروست دەکات کە لەگەڵ چزووەکەی‌دا دەیدات بە دوژمنەکانی‌یەوە، مۆمیش لە لەشی‌یەوە بە شلی دەردەچێت، بۆ دروست کردنی شانەکانی لە خانەی شەش پاڵوو کە کاتێك بەر هەوا دەکەوێت رەق دەبێت، هەروەها ماددەی (العِكبِر) کە کەتیرەیەکە لە درەختەکان کۆی دەکاتەوە، و پاشان دەیجوێت و دەیکات بە ماددەیەك کە شانەکانی پێ جێگیر دەکات، ئەمانە بێجگە لە هەڵاڵەی گوڵیش کە کۆی دەکاتەوە و لەسەری دەژی.



لێــرەوە ئیعجــازێکی تری ئایەتەکــە ئاشکــرا دەبێــت کــە ئەیفــەرمووە بە تــەنها هــەنگوین لــە سکی هەنگەوە دێتە دەرەوە، و هــەر ئەوە کە شیفای تێدایە، چونکــە لــە سکــی هەنگــەوە چەندیــن مــاددەی جیــاوازی چارەسەرکەر دێتە دەرەوە، کــە لــە ســەردەمی هاتنــە خــوارەوەی قــورئـــان بـــۆ ســـەروەری پێغەمبــەران نــەزانراوە، تــەنها لــە ســەدەی بیســتەمدا ئــەم بــەها گرنگــە چارەســەرکەرانەی هــەموو ماددەکــانی بەرهــەمهاتووی سـکی هــەنگ زانـراوە و دۆزراونەتەوە.

لە کۆتایی ئەم ئاماژانە بە لایەنە ئیعجازی‌یەکانی ئایەتەکە تێبینی ئەوە دەکەین کە خوای گەورە ووشەی (بطونها)ی بە کۆ هێناوە و ووشەی (شراب)ی بە تاك هێناوە، کە مەبەست پێی ئەوەیە کە هەر چەند هەنگەکان و سکەکانیان زۆرن بەڵام تــەنیا یــەك جۆر شلە لــە هەموویانــەوە دێتــە دەرەوە، کــە هاوپێکهاتــەن و خــوای پەروەردگار خاسی‌یەتی شیفا و رەحمەتی پێداوە بۆ خەڵکی.

هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَالِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ {١٤٢} إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ {١٤٣} فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ {١٤٤} وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ {١٤٥} أَتُتْرَكُونَ فِي مَا هَاهُنَا آمِنِينَ {١٤٦} فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ {١٤٧} وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ {١٤٨}﴾ (الشعراء)، ئیمامی (إبن عباس) دەڵێت: ئەمانە تەمەن درێژبوون بەشێوەیەك كە خانوو و بینا لەگەڵ تەمەنیاندا نەدەما و دەرنەدەچوو، هەر بۆیە (صالح) پێغەمبەر ئاگاداری كردنەوە كە رۆژێك دەبێت ئێوەش بمرن و تیابچن، لە یادخستنەوەی ئەو نیعمەتانەش كە خودا پێی داون دەفەرموێت: ئێمە چەندین باخات و سەرچاوەی ئاومان پێداون، هەروەها رووەك و دارخورمامان پێداون كە خورما و هەڵاڵەكەی زۆر ئاسانە بۆ خواردن و هەرس كردن، ئاشكرایە كە بەیەكەوە بەستنی تەمەن درێژی و خواردنی خورما و هەڵاڵەكەی، یەكێك لە مەبەستەكان پێی ئەوەیە كە خواردنی ئەو ماددانە بووە هۆی تەمەن درێژییان!!.

**پێكهاتەی دەنكە هەڵاڵە:**

هەموو ١٠٠گرامێك لە هەڵاڵە ئەمانەی تێدایە: ئاو ٢٤,٣ گم، پرۆتین ٢٤,١ گم، شەكر ٢٢,٨ گم، نیشاستە ١,٨ گم، چەوری ٤,٩ گم، ریشاڵ ٩,٣ گم، ماددەی تر ٣,٢ گم، هەڵاڵە چەندین كانزای تێدایە، لەوانە: پۆتاسیۆم، صۆدیۆم، كالیسیۆم، مەگنیسیۆم، ئەلەمنیۆم، ئاسن، زینك، مەنگەنیز، مس، قورقوشم، سیلیكۆن، فۆسفۆر، كلۆر و سیلینیۆم، ئەم ئەنزیمانەشی تێدایە: ئەمیلەیز، كاتەلەیز، دەیاستەیز و فۆسفاتەیز و هیتر.

**سوودەكانی دەنكە هەڵاڵە:**

لە گۆڤاری پزیشكی بەریتانیدا توێژینەوەیەك لەسەر كۆمەڵە كەسێك لە وڵاتی دانیمارك سازدرا كە هەموویان لەسەروو تەمەنی ٩٠ساڵییەوە بوون، ئەم كەسانە لە چەند شتێكدا هاوبەش بوون گرنگترینیان جگەرە نەكێشانیان و خواردنی بڕێكی زۆر لە هەنگوینی سروشتی دەوڵەمەند بە دەنكە هەڵاڵە بوو.لە توێژینەوەیەكی تر لە فەرەنسادا گرنگی هەڵاڵە دەركەوت بۆ چارەسەری كەسانی

گیراوەی عیکبیر (Melbrosia Propolis Tincture) لەم نەخۆشی‌یەدا بووە هۆی نەمانی ٨٠٪ی ئەم حاڵەتانە، هەروەها لە سووتان و هەوکردنە بەکتیریی و کەڕوویی‌یەکاندا زۆر بەسوودە.

## ٤- دەنکە هەڵاڵە ( حبوب الطَّلع أو حبوب اللقاح Pollen ):

لە فەرهەنگی زانیاریی بەریتانی‌دا هاتووە: هەڵاڵەی گوڵ لە ئەندامە نێرینەکانی گوڵدا دروست دەبن و بە هۆکاری جیاوازی وەك: (با، ئاو، مێروو....هتد) دەگوێزرێنەوە بۆ ئەندامە مێینەکانی گوڵ، لە فەرهەنگی زانستی گشتی ئەمریکی (Everyman Encyclopedia)دا هاتووە: بریتین لە پێکهاتەی نێرینەی رووەکە گوڵدارەکان و بە داپۆشەرێکی دژە گەنین داپۆشراوە، و لە جۆرەکانی رووەکدا شێوەیان جیاوازە، تەنانەت ئەگەر تەمەنی ١ ملیۆن ساڵ بێت دەتوانین رووەکە سەرچاوەکەی بدۆزینەوە.

لە قامووسی (ئۆکسفۆرد)دا هاتووە: ووشەی هەڵاڵە (Pollen) کە ووشەیەکی لاتینی‌یە و بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٧٥١ی زایینی‌دا بەکارهاتووە، کاتێك زانای سویدی (کارڵ لیینە Linne) بۆ یەکەم جار وەسفی کرد، ئەگەر کەمتر لە ٣٠٠ ساڵ بێت کە زانستی مرۆڤ باسی هەڵاڵە (Pollen)ی کردبێت، با بزانین کە قورئانی پیرۆز پێش ١٤٠٠ساڵ لەمەوبەر ووشەی هەڵاڵە (الطلع)ی هێناوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِيَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَأَخْرَجْنَا بِهِ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا وَمِنَ النَّخْلِ مِن طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّاتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ وَالزَّيْتُونَ وَالرُّمَّانَ مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَابِهٍ انظُرُواْ إِلِى ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ وَيَنْعِهِ إِنَّ فِي ذَلِكُمْ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ (الانعام:٩٩)، واتە: خوای گەورەیە کە لە ئاسمانەوە ئاوێکی ناردۆتە خوارەوە، کە بەهۆیەوە هەموو رووەکێکی پێ‌دەردێنێت و لەم رووەکانەوە ماددەیەکی سەوز پەیدا دەبێت کە هەموو جۆرە دەنکێك دروست دەکات، هەروەها لە دارخورماوە کە لە هەڵاڵەکەیەوە بوڵی خورما پەیدا دەبێت .....تاد، بەڕاستی سەرسوڕهێنەرە و پێش هەموو زانستێکی داوەتەوە.

(د.ئاگارد Aagaard) له دانیمارك لەسەر ١٦٠٠٠ كەس پێی هەستا، بینی كە بەكارهێنانی عیكبیر لە ٩٧٪ی نەخۆشەكاندا كاریگەر بوو بۆ چارەسەر كردن و ئازار شكاندن.

٤- **نەخۆشییەكانی دەم و ددان:** كاریگەرییەكی سەركەری مەوزیعی هەیە لەسەر پێست و پەردە داپۆشەرەكان، و پرۆسەی نوێ بوونەوەیان خێراتر دەكات، لەگەڵ رووەكی (الصبار Aloe) بۆ چارەسەری هەوكردنەكانی ناودەم و ددانەكان بەكارهێنرا و زۆر كاریگەر بوو، هەروەها بینراوە كەعیكبیر بەسوودە بۆ چارەسەری كلۆریی ددانەكان (Dental Decay)، و ئەگەر وەك مەعجونی ددان بەكاربێت پارێزەرە بۆ ددانەكان، هەروەها بۆ چارەسەری هەوكردنی زمان بەكاردەهێنرێت.

٥- **عیكبیر لە نەخۆشییەكانی چاودا:** یارمەتی نوێبوونەوە پەردەی سووتاوی چاو دەدات و بۆ هەوكردنەكانی چاویش بەسوودە ئەگەر وەك قەترەیەك بەكاربهێنرێت.

٦- **ئازاری جومگەكان و ئەزێتی وەرزشیی:** لە توێژینەوەیەك لە نەمسا دەركەوت كە بەكارهێنانی ئەم ماددەیە وەك مەرهەمێك دەبێتە هۆی باش بوونی هەوكردنی جومگەكان و هەروەها چەند وەرزشكارێك كە تووشی برینی جۆراوجۆربوو بوون بەهۆی وەرزشەوە، مەرهەمی عیكبیر درا لەو شوێنانە بۆ ماوەی ٥ رۆژ، بینرا لە ماوەی ٣ رۆژدا بە تەواوەتی ئازاریان نەما و زوربەیان پاش ٥ رۆژەكە دەستیان بە راهێنان كردەوە.

٧- **چارەسەری برینی گەدە:** لە توێژینەوەیەك لەسەر ١٢٦نەخۆشی قورحەی گەدە و دوانزەگرێدا، ئەم نەخۆشانە رۆژانە و بۆ ماوەی (٢١-٢٨) رۆژ (٥٠-٦٠) قەترەیان لە گیراوەی عیكبیر لەناو شیردا درایە رۆژی ٣ جار، لە ئەنجامدا بینرا كە ٧٥٪ی نەخۆشەكان بە تەواوەتی چاكبوو بوونەوە.

٨- **نەخۆشییەكانی پێست:** لە زۆر نەخۆشی پێستدا بە سەركەوتوویی بەكاردێت، وەك: زیبكە (حب الشباب Acne)، بالووكە (Warts)، ئیكزیما (Eczema)، دركە و مێكوتە (Shingles) كە (د.فیكس)ی نەمساوی دەڵێت: بەكارهێنانی

**سوودە پزیشکی‌یەکانی عیکبیر:**

**١- دژە میکرۆب و کەڕووە:** لە یەکێتی سۆڤێتی جاراندا چەندین توێژینەوە کراوە لەسەر ئەم ماددەیە و دەرکەوتووە کە کاریگەری‌یەکی بەرچاوی هەیە لەسەر میکرۆب و بەکتریای نەخۆشی‌یەکانی وەك: میکرۆبی سیل (تەدرن) (Mycobacterium Tuberculosis)، هەروەها میکرۆبە زیانبەخشەکانی وەك: (Streptococci & Proteus)، لە توێژینەوەیەکی تردا کە لەسەر ٣٩جۆری بەکتریا و ٣٩ جۆری کەڕوو کران کە زۆر باون لە دروست کردنی نەخۆشی لە مرۆڤدا، دەرکەوت کە (عیکبیر) زۆر کاریگەرە لەسەر ٢٥ جۆری بەکتریاکان و ٢٠ جۆری کەڕووەکان، (د.هاڤستین) باوەڕی وایە کە عیکبیر کاریگەری‌یە دژە میکرۆبی‌یەکەی هیچ کەمتر نی‌یە لە دەرمانە دژە میکرۆبەکانی وەك: تێتراسایکلین و پەنسلین و ستریپتۆمایسین، لە توێژینەوەیەکی تر کە هەر لە یەکێتی سۆڤێتی جاراندا سازدرا ئەم ماددەیە درا بە چەند بەرازێکی تاقی کردنەوە و پاشان ئەم بەرازانە میکرۆبی وەناق (Corynebacterium Diphtheriae) لەڕێی دەرزی کرایە لەشیانەوە، و چەند بەرازێکی تریش کە عیکبیریان نەدرابوویە بەهەمان شێوە میکرۆبەکە بە دەرزی کرایە لەشیانەوە، بینی‌یان ئەوانەی عیکبیرەکەیان درابوویە هیچ جۆرە نیشانەیەکی نەخۆشی‌یەکەیان تێدا دەرنەکەوتبوو، بەڵام ئەوانەی تر کە میکرۆبەکە کرابوویە لەشی‌یانەوە و عیکبیریان نەدرابوویە هەموویان مردن.

**٢- سیستمی بەرگری لەش بەهێز دەکات:** بەرگری لەش بەرامبەر بە هەڵامەت و ئینفلوەنزا و هەوکردنی ئالوەکان و هەوکردنی میزەڵدان زیاد دەکات، هەروەها خانە بەرگری‌یەکانی لەش بەتایبەتی خانە قووتدەرەکان (Phagocytes) بەهێزتر دەکات بۆ قووتدان و لەناو بردنی ڤایرۆس و بەکتریاکان.

**٣- ئازار شکێنە:** هاوشێوەی (ئەسپرین Aspirin)ە بۆ ئازار شکاندن، یەکێك لە نەخۆشی‌یە باوەکان بریتی‌یە لە هەوکردنی قوڕگ (Sore Throat) کە ئازار و ناڕەحەتی زۆر لە قوڕگدا دروست دەکات، لە توێژینەوەیەکی زانستی تردا کە

زمانەوانی (ئۆکسفۆرد)دا هاتووە: عیکبیر ماددەیەکی لینجی مۆمی‌یە و هەنگ لە خونچەی دار و توێکڵەکانی‌یەوە کۆی دەکاتەوە و خانە شەش پاڵووەکانی هەنگوینی پێ‌جێگیر دەکات، کەواتە کەتیرە یان سیکۆتینی هەنگە (صمغ النحل Bee Glue).

هەروەها وەك ماددەیەکی چیمەنتۆیی بەکاری دێنێت بۆ گرتنی دەرگای شانەکە و ڕێگرتن لە هاتنە ناوەوەی بێگانە، ئەوەی سەرسوڕهێنەرە ئەوەیە کە هەر کاتێك دوژمنێك بێتە ناو شانەکەوە ئەوا هەنگ دوای ئەوەی دەیکوژن بە چزوو و ژەهرەکانیان بەم ماددەیە چواردەوری دەدەن و مۆمیای دەکەن، هەنگ بە درێژایی ساڵ ئەم ماددەیە کۆناکاتەوە و تەنیا ڕۆژە خۆرەتاوەکانی هاوین هەڵدەبژێرێت بۆ هەستان بەم کارە، کە لەم کاتەدا نەرمە و ئاسان کۆدەکرێتەوە.

هەنگ مێروویەکی زۆر پاکە و پاك و خاوێنی شانەکەی لە میکرۆب دەپارێزێت، پرۆفیسۆری فەرەنسی (شوفان) لێکۆڵینەوەی لەسەر گەشەکردنی میکرۆب کرد لەسەر ئاژەڵان و بە تەنیا شانەی هەنگ خاڵی بوو لە کێڵگە میکرۆبی‌یەکان، و دەڵێت لە عیکبیردا ماددەیەکی دژە میکرۆب هەیە و هەنگ بەکاری دەهێنێت وەك ماددەیەکی دژە میکرۆب (Disinfectant) لەگەڵ کاری چەسپاندنەکەی‌دا، شانەی هەنگ زۆر خاوێنە لە میکرۆب بە بەراورد لەگەڵ زۆرێك لە نەخۆشخانەکاندا، لەگەڵ ئەوەشدا کە زیاتر لە ٥٠٠٠٠ هەنگی تێدا دەژی.

**پێکهاتەکەی:** لەم ماددانە پێکدێت:

- ماددەیەکی کەتیرەیی لینج و بۆنخۆش بە ڕێژەی ٥٠-٥٥٪ .
- مۆمی هەنگ بە ڕێژەی ٣٠٪ .
- چەند زەیتێکی بنچینەیی بە ڕێژەی١٠-١٥٪ .
- هەڵاڵەی گوڵ بە ڕێژەی ٥٪ .

ماددەی فلاڤۆنۆید (Flavonoid) کە کاریگەرترین بەشی عیکبیرە.

دەبێت ئاگاداری ئەوەش بین کە لە نێوان ٢٠٠٠ کەسدا یەکێکیان هەستیاریی (حەساسی‌یەت)ی هەیە بۆ ئەم ماددەیە و نابێت بە هیچ جۆرێك بۆیان بەکاربێت.

رەقبوونی خوێنبەرەکانی مێشك بەسوودە، توێژینەوەیەکی تر دەریخست کە دەبێتە هۆی چالاك کردنی زاکیرە و بیرهاتنەوە و یارمەتی مرۆڤ دەدات بۆ سەرکەوتن لە خوێندندا، لە توێژینەوەیەکی تر کە لە وولاتی (بولگاریا)دا سازدرا بینرا کە ئەو بە تەمەنانەی هەنگوین و خواردنی شایانەیان دەدرێتێ چالاکتر دەبن و بەگشتی باری تەندروستی‌یان باشتربوو.

کاریگەریی تر:

چەند توێژینەوەیەکی تر دەریانخست کە خواردنی شایانە زۆر بەسوودە لە هەندێك حالاتی تەنگەنەفەسی (رەبو) و سنگە کوژێ (الذبحة الصدرية)، هەروەها بینرا کە رێژەی کۆلیسترۆڵ لە خوێنی ئەو کەسانەی خواردنی شایانەیان بەکارهێناوە زۆر کەمتر بوو وەك لە خەڵکی ئاسایی.

## ٢- عیکبیر (العكبر Propolis):

ماددەیەکی کەتیرەیی بۆنخۆشە و هەنگ وەك ماددەیەکی یەکخەر بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی نێوان خانەکانی بەکاری دێنێت، هەر لە کۆنەوە وەك چارەسەرێك لە لایەن میسری‌یە کۆنەکان و یۆنانی‌یەکان بەکارهاتووە، هیپۆکرات (٤٦٠-٣٧٧ پێش زایین) وەك مەرهەمێك بۆ چارەسەری برین بەکاری هێناوە، هەروەها وەك ماددەیەکی دژی هەوکردن و لە چارەسەری هەلامەت و ئازاری جومگەکاندا بەکارهاتووە، کاتێك منداڵیش لەدایك دەبوو پاش برینی پەتی ناوکی کەمێك لەم ماددەیە دەخرایە سەر پاشماوەی ناوکەپەتکەکە، لە سەرەتای سەدەی بیستەم و لە کاتی جەنگی بوێر (Boer War) لە نێوان ساڵەکانی (١٨٩٩-١٩٠٢)ن عیکبیر وەك مەرهەمێك بۆ برینەکانی جەنگ بەکار هێنراوە.

عیکبیر چی‌یە:

ووشە لاتینی‌یەکەی (Propolis) لە دوو بەش پێك دێت: (Pro) بە مانای لەبەردەم یان لەپێش دێت، (polis) بەمانای شار دێت، کەواتە ماددەیەکە کە هەنگ بۆ بەهێزکردنی شارەکەی (شانەی هەنگ) بەکاری دێنێت، لە فەرهەنگی

له چەند توێژینەوەیەکی نوێدا بۆ زانینی کاریگەریی خواردنی شایانە لەسەر گەشە کردن، کاتێك ئەم ماددەیە درا بە چەند مشکێکی تاقی کردنەوە بینرا کە دەبێتە هۆی زیاتر کردنی گەشە کردنیان و زووتر پێگەیشتنیان لەڕووی جنسییەوە، بەهەمان شێوەی کاریگەریی ئەم ماددەیە لەسەر شاژنی هەنگ.

توێژەرەوەکان بینییان کە کاریگەریی خواردنی شایانە هاوشێوەی هەردوو هۆرمۆنی ئیستراديۆل (Estradiol) لە مێینەدا و تیستۆستیرۆنە (Testosterone) لە نێرینەدا، کە ئەم دوو هۆرمۆنە دەبنە هۆی زووتر گەشە کردنی جنسی لە نێر و مێدا.

**خواردنی شایانە وەك بەهێزکەرێك:**

بەکارهێنانی خواردنی شایانە وەك ماددەیەکی بەهێزکەر کارێکی باوە، بینراوە کە ئەم ماددەیە دەبێتە هۆی چالاك کردنی مێشك و دڵ و جگەر، و توانای وەرگرتنی ئۆکسجین لە لایەن ئەم ئۆرگانانەوە زیاد دەکات، هەروەها توێژەرەوەکان توانییان لە هەنگەوە ماددەیەکی هاوشێوەی هۆرمۆنی (تیستۆستیرۆن Testosterone) لە خواردنی شایانەدا جیابکەنەوە.

**بەکارهێنانی لە نەخۆشییەکانی چاودا:**

خواردنی شایانە وەك مەرهەمێك بە ڕێژەی ١٪ رۆژانە (٣-٤) جار بەکارهێنرا بۆ حاڵەتی سووتاوی ڕەشێنەی چاو و بینرا کە کاریگەرییەکی سارێژکەری زۆر باشی هەیە، هەروەها ئەم ماددەیە بە تێکەڵاوی لەگەڵ (لیثۆمایسین Lithomycine) بەکارهێنرا بۆ هەوکردنەکانی پێڵو و بەشەکانی چاو، و بینرا زۆر بەسوودە.

**لە نەخۆشییە دەمارییەکاندا:**

(د. ئاگامۆنۆف)ی رووسی لە گۆڤاری (نەخۆشییە دەماری و دەروونییەکان)دا بابەتێکی بڵاوکردەوە کە تێیدا هاتووە: توێژینەوەکان دەریان خستووە کە خواردنی شایانە خاسییەتێکی دژی گرژبوون و تەشەنوج و بەهێزکەری بۆ کۆئەندامی بەرگری هەیە، بۆ حاڵەتەکانی ئازارە دەمارییەکان و بێهێزی جنسی و

**پێکهاتەی خواردنی شایانە:**

لەم ماددانە پێکدێت: ئاو ٦٦٪ ، شەکر ١٤٪ ، پرۆتین ١٣٪ ، چەوری ٥٪ ، ئەو ٢٪ی کە دەمێنێتەوە پێکهاتووە لە رێژەیەکی زۆر لە ڤیتامینەکان و کانزاکان و هەندێك ماددەی هۆرمۆنی و ماددەی کاریگەری لەناوبەری میکرۆب، بڕێکیش لە ئەسیتایل کۆلین (Acetyl Cholin) کە بۆ گواستنەوە دەمارییەکان لە مرۆڤدا گرنگە، و ئینۆسیتۆل (Inositol) کە هەڵدەستێت بە تواندنەوەی چەوری لە جگەردا و دابەزاندنی رێژەی کۆلیسترۆڵ لە خوێندا، شەکر لەناو خواردنی شایانەدا لە: گلوکۆز و فرەکتۆز و سوکەرۆز پێك دێت.

ئەم ماددانە هەموو بە پێکهاتەیەکی چوونیەك و ناوازە کۆبوونەتەوە بۆ ئەوەی گەشەی لەش زیاد بکات بەبێ بەفیڕۆدان، چەوریش رێژەکەی زۆر کەمە کە لەگەڵ ئامۆژگارییە پزیشکییەکاندا دەڕوات، خواردنی شایانە دەوڵەمەندە بە کۆمەڵەی ڤیتامین (B) کە گرنگترینیان: (B1) کە بە ثایامین ناودەبرێت، (B2) کە بە رایبۆفلاڤین ناودەبرێت و نایاسین و ترشی پانتۆثینیك و بایۆتین، هەروەها ڤیتامین (B6) و ترشی فۆلیك (Folic Acid) و ڤیتامین (B12) کە ئەم دووانەی کۆتایی گرنگن بۆ خۆپاراستن لە کەم خوێنی، لەگەڵ ئەم برە زۆرەی ڤیتامین (B) بەلام ڤیتامینەکانی تری وەك (A) و (C) و (D) و (E) بەرێژەیەکی کەمتر لە خواردنی شایانەدا هەن، هەروەها کانزاکانی: کالیسیۆم، مس، ئاسن، پۆتاسیۆم، فۆسفۆر، سیلیکۆن و گۆگرد لە خواردنی شایانەدا هەیە.

**سوودەکانی خواردنی شایانە:**

پرۆفیسۆر (وینتەر گریفیث) لە زانکۆی (ئەریزۆنا) لە ئەمریکا لە کتێبەکەی (الڤيتامين الحيوي)دا دەڵێت:

سوودەکانی خواردنی شایانە لەمانەدا خۆی دەبینێتەوە: ١- تەمەن درێژدەکات. ٢- چارەسەری نەخۆشییە رۆماتیزمییەکانی جومگەکان بە تایبەتی نەخۆشی (Rheumatoid Arthritis). ٣- خۆپاراستن لە تووش بوون بە شێرپەنجەی خوێن. ٤- ماددەی دژە میکرۆبی تێدایە.

## ٢- خواردنی شایانە (الغذاء الملكي Royal Jelly):

ئەم بەرهەمەی سکی هەنگ سەرنجی زانایانی بۆ چەندین سەدە ڕاکێشاوە، خواردنی شایانە ئەو ماددە گرنگەیە کە دەبێتە هۆی پێگەیاندنی شاژنی مەزنی شانەی هەنگ کە هەزاران هەنگی تر بەرهەم دێنێت، لە فەرهەنگی بەریتانیدا هاتووە: خواردنی شایانە (هەروەها پێی دەووترێت شیری هەنگ) ماددەیەکی خۆراکیی، چڕی، ڕەنگ سپییە دەدرێت بە کرمۆکەکانی هەنگ، لە چەند ڕژێنێکی تایبەتەوە لە مێشکی کارکەرەکانی هەنگەوە دەردەدرێت، کرمۆکە نێرینەکان و کارکەرەکان تا ٣ ڕۆژ ئەم خۆراکەیان دەدرێتێ، بەڵام ئەو کرمۆکەیەی کە دەبێت بە شاژنی داهاتوو لە هەموو قۆناغی کرمۆکەدا ئەم خواردنەی دەدرێتێ، خواردنی شایانە ئاو و پرۆتین و شەکر و زۆر کانزای دەگمەن و ڤیتامینی تێدایە، هەروەها دەوڵەمەندە بە ترشی پانتۆثینیك (جۆرێکە لە ڤیتامین B) کە زۆر پێویستە بۆ کرداری تێکشکاندنی شەکر و چەورییەکان، هەروەها ڤیتامین (B6) یان (پایرۆکسیدین Pyroxidine)ی تێدایە کە زۆر گرنگە بۆ کرداری تێکشکاندنی ترشە ئەمینییەکان.

لەناو شانەی هەنگدا ٤٠٠٠٠ تا ٦٠٠٠٠ کارکەر هەیە و لەسەری هەموویاندا ئەو ڕژێنە تایبەتییانە هەیە کە ماددەی خواردنی شایانە دەردەدات، کرمۆکە کە لە هێلکۆکەکە دەجووقێت کێشی ١٥,٠ میلیگرام دەبێت، لەپاش ٥ ڕۆژ و بەهۆی خواردنی شایانەوە کێشی کرمۆکەی شاژن ٢ هەزار جار زیاد دەکات! لە کاتێکدا کێشی کرمۆکەی کارکەرەکان تەنها بە نیوەی ئەوە زیاد دەکات، لەپاش ١٦ ڕۆژ کێشی شاژن دەگاتە باری ئاسایی و ئامادە دەبێت بۆ زاووزێ، لە کاتێکدا کارکەرەکان پاش ٢١ ڕۆژ پێدەگەن و ناشتوانن زاووزێ بکەن و نەزۆکن و قەبارەشیان بچووکە، شاژن ڕۆژانە ٢ هەزار هێلکۆکە زیاتر دادەنێت، کە ئەمە تەنها دەستکەوتی شاژن نییە، بەڵکو بۆ ماوەی (٤-٥) ساڵیش دەژی لەکاتێکدا کارکەرەکان ناتوانن زیاتر لە ٤٥ ڕۆژ بژین، کەواتە دەبێت خواردنی شایانە ڕۆڵێکی گەورەی هەبێت کە ئاوا سیفەتی بەرز بە شاژنی هەنگ دەبەخشێت.

١٠٠ ساڵ زیاتر ژیاوە و ئەویش هەر نان و هەنگوینی دەخوارد، هەروەها باوکی زانستی پزیشکی (لبو قراط) کە زیاتر لە ١٠٨ساڵ ژیاوە، رۆژانە هەنگوینی دەخوارد، بەهەمان شێوە شاعیری یۆنانی بەناوبانگ (ئاناکریۆن) زیاتر لە ١١٥ ساڵ ژیاوە و کاتێك (یۆلیۆس قەیسەر)ی رۆمی لێی پرسی لە هۆکاری تەمەن درێژی و تەندروستی باشی، ئەویش وەڵامی دایەوە: هەنگوین دەخۆم و زەیتی زەیتوون دەدەم لە گیانم.

(د.لۆرەنس گیلبەرت) لە زانکۆی تەکساس لە ئەمریکا توێژینەوەیەکی سازدا و لە گۆڤاری ئەکادیمیای زانستی نیشتمانی ئەمریکی‌دا بڵاوی کردەوە، توێژینەوەکەی لەسەر پەپوولە سازدا، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەنگوینی بەکارنەهێنا بەڵام گیراوەیەکی تێکەڵاوی لە هەڵاڵە و شیلەی گوڵی بەکار هێنا کە هاوشێوەی پێکهاتە سەرەتاییەکانی هەنگوینە، (د.گیلبەرت) بینی ئەو جۆرە پەپوولانە کە لە باری ئاسایی‌دا بۆ چەند هەفتەیەك دەژین تەمەنیان درێژ بوو بۆ چەند مانگێك (زۆرترینیان ٦مانگ)، کاتێك ئەو گیراوەیەیان بە رێك وپێکی دەدرایە، هەروەها بینرا ئەمانە تا ماوەی ٥ مانگ چەندین جار گەرایان دانا کە خۆی لە باری ئاسایی‌دا ئەم پەپوولانە تەنها ١ جار گەرا دادەنێن لەسەرەتای ژیانیاندا، کەواتە ئەو گیراوەیە لەهەمان کاتدا بووە هۆی زیاتر کردن و بەهێز کردنی ژیانی جنسی‌یان، کەواتە خواردنی گیراوەکە (بە هەمان شێوەش هەنگوین) بووە هۆی درێژتر کردنی تەمەنی پەپوولەکان، لەگەڵ زیاد بوونی زاووزێ و گەرا دانانیان.

ئەمە نموونەیەکە لە زیندەوەراندا، بەڵام پێویست دەکات لە مرۆڤیشدا چەندین تاقی کردنەوەی لەو جۆرە بکرێت، تاوەکو بڕیاری کۆتایی بدەین کە هەنگوین مرۆڤ تەمەن درێژ دەکات.

لە کۆتایی ئەم باسەماندا سەبارەت بە سوودە پزیشکی‌یەکانی هەنگوین وتەی کۆمەڵەی (Safe Food)ی بەریتانی دێنین، لە کتێبەکەیاندا کە لە ساڵی ١٩٩٠دا دەرچووە، دەڵێن: (کۆمەڵەکەمان زۆر بە باش و بەسوودی دەزانێت کە منداڵان ماوە نا ماوەیەك بڕێکی کەم لە هەنگوینی سروشتی‌یان بدرێتێ، لەبەر ئەوەی هەنگوین پێویستە بۆ ژیانێکی باشتر بۆیان و بریتی‌یە لە بەرهەمی چەند کارگەیەکی بەها گەورە و سەرسوڕهێنەر لە سکی هەنگدا).

بینراوە کە خواردنی هەنگوین دەبێتە هۆی هێمن کردنەوەی مێشك و نەهێشتنی سەرئێشە، هەروەها بۆ حاڵەتی ڕوودانی فێ (صرع) زۆر بەسوودە، هەروەها تێکەڵ کردنی هەنگوین لەگەڵ سرکەی سێو زۆر سوودمەندە بۆ خەوزڕان (الأرق) ئەگەر پێش نوستن بخورێت، بەڵام نووسەری بەناوبانگ (باربارە گارتلاند)ی ئەمریکی لە کتێبی سیحری هەنگوین (The Magic of Honey)دا ئامۆژگاری ئەو کەسانە دەکات کە خەوزڕانیان هەیە بەوەی لە ڕۆژدا چەند جارێك هەنگوین بخۆن، و پێش نوستن هەنگوین لەگەڵ نەعناع و گوڵی لیمۆدا بکوڵێنن و بیخۆن.

لە کۆتاییدا تێبینی کاریگەریی زۆر بەسوودی هەنگوین کراوە بۆ کەمکردنەوەی نیشانەکانی سەرەتای سکپڕی لە ئافرەتانی دووگیاندا بە ڕێژەی ٨٥٪، هەروەها ئەگەر ئافرەتان لەکاتی منداڵبووندا بیخۆن ئازاری منداڵبوون کەم دەکاتەوە، هەروەها بۆ حاڵەتی هەوکردنەکانی کۆئەندامی زاووزێی مێینە زۆر بەسوودە.

## هەنگوین و تەمەن درێژی:

لەناو خەڵکیدا باوەڕێکی وا بڵاوە کە ئەو کەسانەی هەنگ بەخێو دەکەن تەمەنیان لە خەڵکی ئاسایی درێژترە، لە پەیمانگایەکی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا توێژینەوەیەکی سەرژمێری کرا لەسەر ٥٨٠ کەسی بەخێوکەری هەنگ کە لە نێوان ساڵەکانی (١٩٥٠-١٩٧٨) مردبوون بۆ دیاری کردنی هۆکاری مردنیان، و بەراورد کران لەگەڵ خەڵکانی تر لەهەمان تەمەندا، ئەم توێژینەوەیە دەریخست کە ڕێژەی شێرپەنجە لە بەخێوکەرەکانی هەنگدا زۆر کەمتر بوو.

پزیشکە رووسییەکان چەندین کتێبیان سەبارەت بە چارەسەر بە هەنگوین نووسیوە، لەوانە هەردوو نووسەر (زوباریف) و (یویوریتش) سەبارەت بە خاسییەتە چارەسەرییەکانی هەنگوین نووسیویانە، ئەم دوو نووسەرە لە کتێبەکانیاندا چیرۆکی چەندین کەسیان باس کردووە کە زیاتر لە ١٠٠ ساڵ ژیاون و تەنیا یەك سیفەتی هاوبەش لە نێوانیاندا هەبووە ئەویش خواردنی هەنگوین بووە ڕۆژانە.

لە مێژوودا چەندین کەسی بەناوبانگ هەبووە کە زیاتر لە ١٠٠ ساڵ ژیاون و هەموویان ڕۆژانە هەنگوینیان دەخوارد، لەوانە زانای بیرکاری (فیساغۆرس) کە ٩٠ساڵ ژیاوە و خواردنی بریتی بووە لە نان و هەنگوین، هەروەها (ئەپۆلۆنیۆس) کە

هەردوو (د. عادل قنديل) و (د.أسماء منير) هەستان بە توێژینەوەیەك كە تێیدا ژمارەیەك مشكیان بەكار هێنا و تووشی ژەهراوی بوونی جگەریان كردن و كردیانن بە ٢ گرووپەوە، گرووپێكیان وەك چارەسەر هەنگوینیان دانێ بۆ ماوەی ١٥ ڕۆژ، و گرووپەكەی تر ماددەی جۆراو جۆر یان هیچیان نەدانێ، بینییان هەموو ئەو مشكانەی هەنگوینیان نەدرابوویە لە ماوەی ٢ هەفتەدا مردن، بەڵام ئەوانەی تر كە هەنگوینیان درایە ٩٠٪یان چاك بوونەوە، لەگەڵ ئاسایی بوونەوەی كاری جگەریان، لێرەوە ئەم كاریگەرییە زۆرباشەی خواردنی هەنگوین لەسەر جگەریان گێڕایەوە بۆ ئەمانە:

١- چاكبوونی حاڵەتی دابەزینی شەكر لە خوێندا.

٢-پڕبوونەوەی هەڵگیراوی ناو جگەر لە ماددەی گلایكۆجین.

٣-ئاگادار كردنەوەی خانەكانی جگەر بۆ زاڵ بوون بەسەر نیشتنی چەوری لە جگەردا.

هەنگوین چوونی خوێن بۆ گورچیلەكان باشتر دەكات، هەروەها دەبێتە هۆی فراوان كردنی بۆری میز، كە ئەگەر لەگەڵ زەیتی زەیتوون و شەربەتی لیمۆدا بەكاربێت زۆر بەسوودە بۆ فڕێدانی بەردی گورچیلەكان، هەروەها وەك ماددەیەكی میز دەردەر (مدرر) بەكاردێت لە كاتی سست بوونی گورچیلەكاندا.

لە لایەكی ترەوە لە توێژینەوەیەكدا لە وڵاتی (میصر) هەنگوین بەكار هێنرا بۆ ٥٠ نەخۆشی تووش بوو بە هەوكردنی میزەڵدان بەهۆی نەخۆشی (بەلهارزیا)وە، ڕۆژانە كەوچكێك هەنگوینیان لە ڕێی دەمەوە درایە هەروەها لە ڕێی سۆندەی میزەوە كرایە ناو میزەڵدانیشانەوە بۆ ماوەی ٢مانگ.

بینرا كە ٥٦٪ی نەخۆشەكان چاك بوونەوە، و نیشانەكانی نەخۆشییەكە وەك بوونی خوێن لە میزەكەیاندا بەتەواوەتی نەما، و توێژەرەوەكان باوەڕیان وایە كە ئەگەر بۆ ماوەی زیاتر لە ٢مانگ بەردەوام بوونایە ئاكامی زۆر باشتریان بەدەست دەهێنا، هەروەها بینراوە كە پێدانی یەك كەوچك هەنگوین پێش نووستن بە منداڵان و بەتەمەنا چوواندا دەبێتە هۆی كەمكردنەوە یان نەمانی دیاردەی میز ڕانەگرتن و تەڕكردنی جێگە بەشەو لەناویاندا.




له توێژینەوەیەکی تردا کە پرۆفیسۆر (ماکسیمینکۆ)ی رووسی پێی هەستا لەسەر کاریگەری هەنگوین بۆ چارەسەر کردنی سووتانی رەشێنە، و سپێنەی چاوی ٢٦ نەخۆش بەهۆی ماددەی کیمیایی یان ئاگرەوە، ئەم نەخۆشانە مەرهەمی هەنگوینیان بۆ بەکار هێنرا، ١٥ کەسیان لەماوەی ١٠ رۆژدا بە تەواوی چاك بوونەوە، ٦ نەخۆشی تر لەماوەی ٤ هەفتەدا، و ٥ نەخۆشی تریش لەماوەی ٢مانگدا، واتە هەموو سووتاوی‌یەکان چاکبوونەوە و تەنانەت راددەی بینینیشیان زۆر بەرەو باشتر رۆیشت.

## کاریگەریی تری بەسوودی هەنگوین:

هەنگوین دەبێتە هۆی زیادکردنی ژمارەی خڕۆکە سوورەکانی خوێن (RBC) و ماددەی هیمۆگلۆبین (Hemoglobin) کە ئەمانە دەبنە هۆی باشتر گەیاندنی خۆراك و ئۆکسجین بۆ شانەکانی لەش، هەنگوین ڤیتامین (K)ی تێدایە کە یارمەتی مەیینی خوێن و راگرتنی خوێن بەربوون دەدات، هەروەها بینراوە کە هەنگوین خواردنێکی گەشێنەرەوەیە بۆ ماسولکەکانی دڵ.

هەنگوین سوودمەندە بۆ گەدە و قەبزی کەم دەکاتەوە، هەروەها لە توێژینەوەیەکدا لەسەر مشك دەرکەوت کە هەنگوین کاریگەریی‌یەکی لاوازکەر و لەناوبەری هەیە بۆ بەکتریای (Helicobacter pylori) کەزێنێکی سەرەکی هەیە لە دروست کردنی هەوکردنی گەدە (قرحة المعدة Gastritis & Gastric Ulcers).

ئەو هەوكردنە كێمی یانەی لەگەڵی‌دا ڕوودەدەن، هەروەها وەك ماددەیەكی داپۆشەر و باندجێك بەكاربهێنرێت بۆ سارێژ كردنەوەی برینەكانی نەشتەركاری بە تایبەتی ئەو برینانەی كە پیس بوون.

(د. ڕۆمانینكۆ) لە گۆڤار ناسراوی (نەخۆشی‌یەكانی پێست و كۆئەندامی زاووزێ)دا نووسینێكی بڵاوكردەوە، كە تێیدا دەڵێت: بەكارهێنانی هەنگوینی پوخت و سروشتی بۆ ماوەی (٢٤-٤٨) سەعات كاریگەریی زۆر سوودمەندی هەبوو لە چارەسەری بڵق و دوومەڵی پێست، و هەوكردنی میكرۆبیی پێست، و هەوكردنی ڕژێنەكانی عارەق، هەروەها بۆ باری سووتانی پێست و كێم كردنە بڵقی‌یەكان (Trophic Ulcer)، لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا هەنگوین یارمەتی پاك ڕاگرتنی برینەكە، و زوو چاكبوونەوەی داوە.

هەروەها هەنگوین بۆ پاراستنی نەرم و نیانی پێست، و نەمانی چرچ و لۆچی، و جوان ڕاگرتنی پێستی دەم وچاو بەكار دەهێنرێت، (د.گرینوود) لە نووسینێكدا لە گۆڤاری (Lancet)دا دەڵێت: كاریگەریی دژە میكرۆبی هەنگوین دەگەڕێتەوە بۆ بوونی ماددەی (پیرۆكسیدی هایدرۆجین) كە بەهۆی ئەنزیمەكانی ناو هەنگوینەوە دەردەچێت و هەروەها بۆ ماددەی دژە میكرۆبی وەرگیراو لە هەندێك جۆری گوڵەوە.

## بەكارهێنانی هەنگوین لە نەخۆشی‌یەكانی چاودا:

توێژەرەوەكان كاریگەریی‌یەكی زۆر باشیان دەست كەوت لە كاتی بەكارهێنانی هەنگوین، بەشێوەی چەوری و مەرهەم بۆ حاڵەتەكانی: هەوكردنی پێڵووەكان، و سپێنە و ڕەشێنەی چاو، و هەوكردنە میكرۆبی‌یەكانی تری چاو.

(د.یوبریتش) ی ڕووسی لە كتێبەكەی‌دا (چارەسەر بە هەنگوینی مێش هەنگ) دەڵێت: لە كاتی بەكارهێنانی هەنگوین بۆ چارەسەری هەوكردنی ڕەشێنەی چاو (إلتهاب القرنية) ئەنجامی زۆر باشمان دەست كەوت، و لێرەوە ئامۆژگاریی نەخۆشەكانمان كرد بە بەكارهێنانی مەرهەمەكانی هەنگوین بۆ نەخۆشی‌یە جیاوازەكانی ڕەشێنەی چاو.

ئەم پێکهاتانە هەیە، کە لە لیمۆ و هەنگوین پێکهاتووە، لە گۆڤاری نەخۆشی‌یەکانی قورگ و گوێ و لووت (Oto-Rino-Laryngology)دا هاتووە: لە توێژینەوەیەکی نوێدا کە (د.بۆنیسکۆ)ی رووسی پێی هەستا لەسەر (٢٤٣٧) نەخۆش بە هەوکردنەکانی لووت و قورگ و قورقوڕاگە و گێرفانە هەوایی‌یەکان (الجیوب الأنفیة)، ئەم نەخۆشانە چەندین دەرمانی جۆراوجۆریان پێدرابوو بەڵام سوودی نەبوو، چارەسەری دەرەکی‌یان بۆ کرا بە هەندێك لە دروستکراوەکانی هەنگ بەم شێوەیە:

١- هەڵمژینی دەنکە وردەکانی عیکبیر (Propolis) بەهۆی پرژێنەرێکی ئاسایی‌یەوە، ئەم دەنکانە لە دەرمانسازی‌دا پێیان دەوترێت (Propopeliarth, Proporhinol).

٢- چەورکردنی دەرەکی بەهۆی ئەو پێکهاتانەوە.

٣- غەرغەرە کردن لە قورگدا بە گیراوەیەکی تایبەتی وەرگیراو لە گوڵەوە.

ئەم نەخۆشانە چارەسەرێکی گشتی‌یان درایە لەم شتانە: هەنگوین، شەرابی عیکبیر، دەنکە هەڵاڵە و خواردنی شایانە، ئەم تیمە پزیشکی‌یە گەیشتنە ئەنجامێکی بەرچاو و زۆر گرنگ، کە ئەم چارەسەرە بووە هۆی چاك بوونەوە یان باش بوونی باری تەندروستی ٩٧٪ی نەخۆشەکان.

## هەنگوین و نەخۆشی‌یەکانی پێست:

پێشتر باسمان کرد کە چەندێك هەنگوین بەسوودە بۆ چارەسەر کردنی برینەکانی جێگا (Bed Sores)، (د.محمد نزار الدقر) لە کتێبی (العسل فیه شفاء للناس)دا دەڵێت: لە بینینەکانمەوە دەتوانم بڵێم کە هەنگوین بێگومان کاریگەری‌یەکی زۆر باشی هەیە بۆ چاك بوونەوە، و پاشان ساڕێژ بوونەوەی هەموو جۆرە کێم کردنێکی پێست و لەناوبردنی هەوکردنەکانی هاوڕێ لەگەڵ نەخۆشی‌یەکانی پێستدا، هەر بۆیە ئێمە بە گرنگی دەزانین کە هەنگوین وەك چارەسەرێکی بەتەنها بەکاربهێنرێت، یان بخرێتە ناو پێکهاتەی ئەو مەرهەم و کرێمانەی بەکاردێت بۆ چارەسەر کردنی نەخۆشی‌یە پێستی‌یە درێژ خایەنەکان و

١-دەبێت هەنگوینەکە پوخت (صافی) بێت و نابێت دووچاری گەرمیی و دروست کردنی کارگەیی بووبێتەوە.
٢-دەبێت هەنگوینەکە رێژەیەکی بەرز لە هەلآلەی گوڵی تێدابێت، واتە نابێت هەنگوینەکە پاڵفتە کرابێت (Not Filtered) بەهۆی ئامێری پاڵفتە کردنەوە.
٣-دەبێت هەنگوین بەرێژەیەکی کەم، بە رێك وپێکی و بەردەوام بخورێت بۆ ماوەیەکی زۆر.

لە کتێبی دەرمانخانەی خواردەمەنیدا (The Food Pharmacy)ی نووسەری بەناوبانگی ئەمریکی (جین کاریەر)دا، ئەمانە هاتووە: (د.وان) کە مامۆستای زانکۆی (هیلدبێرگ)ە لە ئەمریکا، توێژینەوەیەکی لەسەر کاریگەریی هەلآلەی گوڵ بۆ چارەسەری نەخۆشییە هەستیارییەکان و رەبوو لە منداڵاندا ئەنجامدا، و بۆی دەرکەوت ئەو منداڵانەی گیراوەی هەلآلەکەیان دەدرێتێ زۆر باریان باشتر بوو، و نیشانەی نەخۆشییەکەیان کەمتر بوو بەرێژەی ٨٤٪ لەچاو ئەوانەی پێیان نەدرا، لێرەوە توێژەرەوەکان وایان لێکدایەوە کە هەلآلەی گوڵ هەرس نابێت، و بە ساغی لە ریخۆڵەکانەوە دەچێتە سووڕی خوێنەوە، و ئەم ماددەیە کرداری نەهێشتنی هەستیاری (Desensitization) لە خوێندا ئەنجام دەدات، خواردنی هەنگوینێك کە هەلآلەی تێدا بێت هەمان کاری نەهێشتنی حەساسیەت بە ئەنجام دەگەیەنێت، بەتایبەتی لەو کەسانەدا کە هەستیاریی و رەبویان هەیە.

هەروەها لە چەند توێژینەوەیەکی نوێی ترەوە دەرکەوت کە هەردوو کانزای (مس و مەگنیزیۆم) کە لە هەندێك جۆری هەنگوینی سروشتیدا رێژەیان زۆرە، دەبنە هۆی باشترکردنی نیشانەکانی هەستیاریی و تەنگەنەفەسی درێژخایەن بە تایبەتی لە منداڵاندا.

### هەنگوین و هەوکردنەکانی بۆشایی ناودەم و لووت:

هەنگوین چووەتە ناو پێکهاتەی زۆرێك لە خەپلەکانی مژین (Lozenges)، کە لە هەوکردنەکانی قوڕگ و قوڕقوڕاگەدا بەکاردێت، لە زۆرێك لە دەرمانخانەکاندا

(فلافنۆیـــد)، کـــە لـــە پێکهاتەکـــەیدا لـــە دەرمـــانی کرۆمۆکلایگـــەیت (Cromoglycate) دەچـێت کـە ماددەیەکـە دەدرێـت بـە نەخۆشـی ڕەبـو بـۆ پاراستنی لـە نۆرەکانی تەنگەنەفەسی، کەواتـە نـەك بە تـەنیا بۆ چارەسەری ڕەبو بەکاردێت بەڵکو بۆ خۆپاراستن لە نۆرەکانی تەنگەنەفەسیش بەکاردێت).

(د.کرۆفت) لـە ووتـەکانیدا بەردەوام دەبێت و دەڵێت: (چارەسەر بە هـەنگوین پێویستی بە بەکارهێنانی برێکی کەمە لە هەنگوین ڕۆژانـە و بۆ ماوەیەکی زۆر، با بشزانین کە هـەنگوین بۆ چارەسەری تـاوە توندەکانی تەنگەنەفەسی لـە نەخۆشی ڕەبودا بەکارنایەت، بەڵکو مرۆڤ دەپارێزێت لە تووش بوون بەو نۆرانە، ئەویش بە بەکارهێنانی بەردەوام.

لەوانەیە لێکدانەوەیەکی تر هەبێت بۆ کاریگەریی هـەنگوین لـە ڕەبودا، ئەویش بـەهۆی بـوونی ڕێژەیـەکی کـەم لـە ژەهـری هـەنگ لـەناو هەنگوینـدا، ئـەم ژەهـرە کارکەرەکانی هەنگ تونژاڵێکی کەمی لێدەکەن بەسەر ئەو خانانەی کە پڕیان دەکەن لـە هـەنگوین و پاشـان دایـان دەپۆشـن، ئـەویش بـە مەبەسـتی هێشـتنەوەی هەنگوینەکە بە تازەیی و پاڵفتەیی و پاراستنی لە خراپ بوون).

سەبارەت بە ژەهری هـەنگ (د.کرۆفت) دەڵێت: (توێژینـەوە نوێکان دەربارەی ژەهری هەنگ دەریان خستووە کە ماددەیـەکی زۆر ئاڵۆزە، لـەم گیراوەیـەدا زانایـان ماددەیـــەکی دژی هـــەوکردن و ئیلتیهـــاب (Anti-Inflammatory)یـــان دۆزیوەتـەوە، کـە لەگـەڵ هەڵاڵـەی گوڵـدا کارلێك دەکـات، و لـەڕێی ڕیخۆڵەکانـەوە دەمـژرێت و دەچـێتە سـووڕی خوێنـەوە، و لـەوێدا کـارە دژە هەوکردنەکـەی بەجێدەگەیەنێت، بەڵگەی بەهێزیش هەیە کە کاریگـەریی هـەنگوین بۆ چارەسەری هەستیاریی (حەساسیەت) و تەنگەنەفەسی بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی ئەو ماددە گرنگانە).

لـە کۆتـاییدا (د.کرۆفـت) ئـەم ڕایانـە کـورت دەکاتـەوە و دەڵێـت: بـۆ ئـەوەی هەنگوین کاریگەر بێت بۆ چارەسەری نەخۆشییە هەستیارییەکان پێویستە سێ بنەما بێتەدی:

چارەسەر، بینراوە کە هەنگوینی پاڵفتە ڕێدەگرێت لە تووش بوون بەو نۆرانەی هەستیاریی و بەرگری بۆ نەخۆشەکان دروست دەکات لە دژی هەڵاڵەی گوڵ.

(د. جارفیس) لە کتێبی (الطب الشعبي)دا پێشنیاری پێدانی ۱ کەوچك لە هەنگوین دەکات ڕۆژی ۲ جار بەو کەسانەی هەستیارییان هەیە، ٤ مانگ پێش ئەو وەرزەی تێیدا نەخۆشەکە خراپ دەبێت، ئەم ڕەچەتەیە بووە هۆی چارەسەری تەواوی چەندین کەس لەو نەخۆشانە، هۆکاری ئەم چارەسەرە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەڵاڵەی گوڵانەی لە هەنگویندایە کە دەبێتە هۆی دروست کردنی بەرگری لە لەشی نەخۆشەکەدا، چونکە ئەو هەڵاڵانەی هەنگوینەکە بەشێوەیەك چارەسەرکراوە کە زەرەر بە لەشی ئەو کەسە نەگەیەنێت و لەشی ئەو کەسە بتوانێت بەهۆی ئەمەوە جۆرێك لە بەرگری بەرامبەر هەموو جۆرە هەڵاڵە بڵاوبووەکانی گوڵەکان دروست بکات)، بەڕاستی وەرگێڕانێکی سەرسوڕهێنەرە لە هۆکاری نەخۆشییەوە بۆ چارەسەر!!.

## بەکارهێنانی هەنگوین لە ڕەبوودا ( Asthma ):

هەر لە کۆنەوە هەنگوین لە چارەسەری نەخۆشی تەنگەنەفەسیدا بەکار هاتووە، بە تایبەتی لای هیندییە کۆنەکان، (جۆن هیل) لە کتێبەکەیدا (سوودەکانی هەنگوین) کە بەر لە نزیکەی ۲۵۰ ساڵ چاپی کردووە (۱۷٥۹ز)، پێشنیاری بەکارهێنانی هەنگوینی کردووە لە چارەسەری تەنگە نەفەسیدا.

(د.کرۆفت) لە کتێبەکەیدا (هەنگوین و تەندروستی) دەڵێت: (لە ڕاستیدا هەنگوین زۆر سوودبەخشە لە چارەسەری نەخۆشی هەستیاریی تردا، بە تایبەتی نەخۆشەکانی ڕەبوو کە زۆر سوود دەبینن لە بەکارهێنانی هەنگویندا، میکانیزمی ئەم سوودەی هەنگوین دەگەڕێتەوە بۆ بوونی ماددەیەك تێیدا بەناوی (براسینۆلید Brassinolide) کە لە پێکهاتندا لە ماددەی بیکلۆمیثازۆن (Beclomethasone) دەچێت، کە جۆرێکە لە کۆرتیزۆن یان کۆرتیکۆستیرۆید (Corticosteroids)، کە لە چارەسەری ڕەبوودا بەکاردێت، هەروەها زانایان توانییان ماددەیەکی تر بدۆزنەوە لە هەڵاڵەی گوڵ و هەنگویندا بە ناوی

(بریگمـان) لـه کۆتـایی نووسـینەکەیدا دەڵێـت: (پێویسـته توێژینـەوه و لێکۆڵینەوەی زیاتر بکرێت لەسەر ئەم مادده بێژەهر (Nontoxic) و هەستیاریی دروست نەکەره (Non Allergic)ی کە زۆر بە ئاسانی دەست دەکەوێت لە هەموو شوێنێك (واتە هەنگوین)، و پێویسته بکرێـت بـه بەشێك لـه چارەسـەره تەندروسـتیيه پزیشکیيەکان).



## کاریگەریی هەنگوین لەسەر نەخۆشی رەبوو و هەوکردنی هەستیاریی لووت:

نەخۆشی کـا (Hay Fever) یان هەوکردنی هەستیاریی لووت، هەستیارییيەکه لە لووت و قورگ و چاودا روودەدات، لـه ئـەنجامی زیاد بوونی هەستیاری (حەساسیەت)ی ئەو کەسه بە کـا یان بە هەڵاڵەی گوڵ (Pollen)، خـوران و سـووربوونەوە لـه لـووت و چـاو و قورگـدا روودەدات و نەخۆشەکه بە بەردەوامی دەپژمێت، لەوانەیه هەناسه توندی و خیـزەی لەگەڵدا بێت ئەگەر ئەو کەسه (رەبوو)ی هەستیاریی هەبێت.

سەبارەت بە چارەسەری ئـەم نەخۆشـيیه بە هـەنگوین (د.لۆری کرۆفت) لـه زانکۆی مانچێستەر لە بەریتانیا دەڵێت: (بەکار هێنانی هـەنگوین بۆ چارەسـەری هـەوکردنی هەسـتیاریی مێژوویـەکی پـڕ سـەرکەوتنی هەیـه، لەگـەڵ ئـەوەدا کـه هۆکاری سەرەکی تووش بوون بەم نەخۆشیيه بریتیيه لە هەستیاریی بۆ هەڵاڵەی گوڵ، بەڵام لەهەمان کاتدا هەنگوینیش کە چارەسەره بۆ ئەم نەخۆشـیيه هـەر لەو شیله و هەڵاڵەی گوڵەوەیه کە هەنگ دروستی دەکات؟! ئەویش بەهۆی ئەو کارگە زیندووەی کە لە سکی هەنگدا هەڵدەستێت بە گۆڕینی ئەم هۆکاری نەخۆشـیيه بۆ

بڵاو و سەرکەوتووانە بەکاردێت بۆ چارەسەری برینە هەوکردووەکان و پیس بوونیان بە میکرۆب.

**میکانیزمی ئەم کارەی هەنگوین:**

دکتۆر (بون) نووسینێکی لەگۆڤاری لانسێت (Lancet)ی بەریتانی بەناوبانگدا بڵاوکردەوە سەبارەت بە میکانیزمی بەسوودی هەنگوین لە چارەسەری برینەکاندا، کە تێیدا هاتووە: ئەم کارەی هەنگوین بەهۆی چەند فاکتەرێکەوەیە، لەوانە:

١- شەکری میوە (فرەکتۆز) کە لە هەنگویندایە خاسیەتێکی لاوازکەر و دژی هەیە بۆ گەشەکردنی میکرۆبەکان.

٢- ترشیی هەنگوین (Low PH of 3.5) دەوروبەرێکی نەگونجاو دروست دەکات بۆ گەشەکردنی میکرۆب، کە ئەم سیفەتە لە شەکری ئاساییدا نییە.

٣- هەنگوین خاسیەتێکی ووشك کەرەوەی هەیە بۆ شانەکان، و ئاوی ناو شانەی هەوکردوو بە خێرایی دەمژێت و ووشکی دەکاتەوە.

پاشان نووسەر دەڵێت: (هەنگوین زۆر لە شەکر و ماددە خواردەمەنییەکانی تر سوودی زیاترە بۆ چارەسەری برینەکان، منیش وەك نووژدارێك کە لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکاندا کارم کردووە، بینیومە و هەستم کردووە کە هۆکاری سەرکەوتنی شیرین (Sweet Success) بەهۆی بەکارهێنانی هەنگوینەوە هیچ ماددەیەکی تر نایگاتێ).

زانا (بریگمان)یش چەند میکانیزمێکی تری باس کردووە کە کاری یارمەتیدەر و سارێژکەری هەنگوین روون دەکاتەوە بۆ برینەکان، لەو میکانیزمانە:

١- هەنگوینی پوخت ئەنزیمی وەك (Catalase)ی تێدایە کە لەوانەیە رۆڵی هەبێت لە سارێژ بوونەوەی بریندا.

٢- هەنگوین ماددەیەکی تێدایە کە بە (Inhibin) ناودەبرێت واتە (رێگر) کە رێ لە گەشەکردنی میکرۆب دەگرێت و دژە میکرۆبە.

٣- هەنگوین سەرچاوەیەکی زۆر باشی ووزەیە بۆ شانەکان، کە ئەمە یارمەتی سارێژ بوونەوەی برینەکان دەدات.

گۆڤـاری نەشـتەرگەری بـەریتانی توێژینەوەیـەکی بڵاوکـردەوە کـە تـێ‌یدا هەنگوینی سروشتی بەکار هێنرا بۆ چارەسەری برینی هەوکردووی (٥٩) نەخۆش بەهۆی چەندین هۆکاری جۆراوجۆرەوە، کە چاك بوونەوەیان شکستی هێنابوو بە پـاك کـەرەوەکان و دژە میکرۆبـەکان، کـە بـۆ مـاوەی نێـوان ١مـانگ تـا ٢سـاڵ بـۆ برینەکانیان بەکار هاتبوو، رۆژانە و بۆ ماوەی ١ هەفتە هەنگوینی پاڵفتەی دروست نـەکراو (Unprocessed) دەخرایـە سـەر برینـەکانیان، پاشـان نموونـە لـە برینـەکانیان وەرگـیرا و نێردرا بـۆ پشـکنینی تاقیگـەیی مایکرۆبـایۆلۆجی، پێش بـەکارهێنانی هـەنگوین لـە کـاتی چاندنی نموونـەی وەرگـیراو لـە برینـەکانیان و پشـکنینیان چـەندین جـۆر بـەکتریای نەخۆشـی قـورس دەردەچـوون وەك (Pseudomonas, E. coli, Staphylococcus)، بەڵام پاش بەکارهێنانی هـەنگوین بـۆ ١ هەفتـە هـیچ جـۆرە بەکتریایـەك لـە نموونـە وەرگیراوەکانـەوە دەرنەدەچـوو، و بەتـەواوی پـاك بـوو بـووەوە، برینـەکان ووردە ووردە ووشـکیان دەکـرد و ئاوسـاوی دەوروبـەریان نـەدەما، دەتـووانرا ووشـکی‌یەکان و شـانە فـەوتاوەکان بـە ئاسـانی لـە برینەکـە بکرێتـەوە، لێکۆڵـەرەوەکان گـرنگترین خاسی‌یەتەکانی هەنگوینیان بۆ برین بۆ دەرکەوت کە ئەمانەیە:

١- نەهێشتنی بۆنی ناخۆشی برینە هەوکردووەکان.

٢- پاککردنەوەی برینەکە بەهۆی کارێکی کیمیایی و ئەنزیمی‌یەوە.

٣- مژینەوە و نەهێشتنی ئاوساوی دەوروبەری برینەکە.

٤- لەناوبردنی میکرۆبە زیانبەخشەکان.

٥- یارمەتیدانی دروست بوونەوەی شانەی بەستەر و شانەی سارێژکەر لە شوێنی برینەکەدا.

٦- باشتر کردنـی خـۆراك پێدانی شـوێنی برینەکـە، ئـەم توێژینەوەیـە گـەورەترین توێژینەوەیە لەسەر کاریگەریی سارێژکەرەوەی هەنگوین بۆ برینەکان.

لـە گۆڤـاری کۆلیـژی پزیشـکی بەریتانیشـدا بابـەتێك بڵاوکرایـەوە لەسـەر نەشتەرگەری لە ووڵاتی (کینیا)دا، کە تێیدا هاتبوو کە لـەو ووڵاتـەدا هـەنگوین زۆر

نەشتەرگەری‌یەکانی، و بینی دەبێتە هۆی چاك بوونەوەی تەواوی برینی نەشتەرگەری‌یەکە، تەنانەت بە پشکنینی تاقیگەییش هیچ جۆرە بەکتریایەکی لەو برینانەدا نەدەدۆزی‌یەوە، بە هەمان شێوە زانا (البرت شویتن) کە هەڵگری پروانامەی (نۆبڵ)ە، دوای نەشتەرگەری‌یەکانی هەنگوینی بەکار دەهێنا بۆ سارێژ بوونەوەی برینی نەشتەرگەری‌یەکە.

لە گۆڤارە پزیشکی‌یە جیهانی‌یەکانـدا وەك: (Lancet)ی بریتانی و (JAMA)ی ئەمریکی چەندین توێژینەوەی تێدایە لەسەر کاریگەریی هەنگوین بۆ چارەسەر کردنی برینەکانی کەوتنی زۆر لەسەر جێگا (Bed Sores) کە لەو نەخۆشانەدا روودەدات کە ناتوانن لەسەر جێگا هەستن بۆ ماوەیەکی زۆر، بەهۆی بێهێزی یان ئیفلیجی، بینرا کە هەنگوین دەبێتە هۆی خێرا کردنی چاك بوونەوەی ئەو برینانە، چەند ساڵێك لەمەوبەر توێژینەوەیەك کرا لەسەر کاریگەریی هەنگوین بۆ چاکردنەوەی ئەو برینانەی لە مشکدا بەدەستکرد دروست دەکران، درێژەی ئەم توێژینەوەیە لە گۆڤاری ئەمریکی بۆ نەخۆشی‌یە نووژداری‌یەکان (The American Journal of Surgery)دا بڵاو کرایەوە، بینرا کە چاك بوونەوەی ئەو برینانەی کە هەنگوینیان دەخرایە سەر زووتر و بە شێوەیەکی باشتر دەبوو، لێرەوە گرنگی هەنگوین بۆ چاك بوونەوەی برینەکان بە ئاشکرا دەرکەوت، هەر لەم توێژینەوەیەدا توێژەرەوەکان خاسی‌یەتێکی گرنگی ناوازەی هەنگوینیان بۆ دەرکەوت کە وەك ئاماژەمان پێدا رێدەگرێت لە گەشە کردنی مێکرۆب و دژی هەردوو مێکرۆبەکانی جۆری (Gram +ve) و (Gram -ve) کاردەکات.



ایـه، کـه ئەمـه کاریگەریی‌یـەکی زۆر بەسـووده و منداڵەکـه دەپارێزێـت لـه ریگەریی خراپی صۆدیۆمی زیاده له خوێن و لەشی‌دا.
- ئەم توێژینەوەیه سەلماندی که پێدانی هەنگوین دەبێته هۆی کەمکردنەوەی وەی سکچوون بەهۆی هەوکردنه میکرۆبی‌یەکانەوە.
- بەکارهێنانی هـەنگوین زۆر سـەلامەت و بێزیانـه، و هەسـتیاریش دروسـت کات، و لـه هـەموو کۆمەڵگایەکـدا هەیـه، ئەگـەر بـەو شـێوەیەی کـه بـاس کـرا کاربهێنرێت زۆر بەسوود و کاریگەره له چارەسەری سکچووندا.
لێرەدا بەرامبەر بەو ئامۆژگاری‌یەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) که بەو کەسەی ووت براکەی سکی دەچوو: برۆ هەنگوینی بدەرێ، تەنها دەتوانین ئەوەنده بڵێین که ێند بێ به پەروەردگاری بوونەوەر که ئەمه نیگا و وەحی ئاسمانی‌یه و ووتەی ئەر نی‌یه.
له توێژینەوەیەکی تردا که (د.سالم نەجم) پێی هەستا، ٥٢ نەخۆش هێنران که سـەنیان لـەنێوان (٣١-٥٥) سـاڵدا بـوو و هـەموویان دووچـاری سکچـوونی ێژخایەن بوو بوون، لەگەڵ ئازاری سك که چەندین مانگ و ساڵ بەردەوام بوو، م نەخۆشانەدا سەلما بوو که هۆکاری سکچوونەکەیان میکرۆبی یان ئۆرگانی یه، هەموو جۆره دەرمانێکی دژه سکچوونیان درابوویه و سوودی نەبوو.
ئەم نەخۆشانه بەوە ئامۆژگاری کران که رۆژانـه بەیانیان و ئێواران پێش نان واردن ٢ کەوچـکی گـەوره هـەنگوین بخۆن، بـۆ مـاوەی ٣ هەفتـه، ئەنجامی ئـەم ێژینەوەیـه زۆر دڵخۆشـکەر بـوو بـۆ نەخۆشـەکان، که بینـرا زیـاتر لـه ٨٣٪ی ئـەو نۆشانه یان بەتـەواوی چاك بوونـەوه یان نیشـانه و توندی سکچوونەکەیان به اوەتی کەمی کرد.

## کاریگەریی هەنگوین لەسەر برین و هەوکردنەکانی:

لێکۆڵەرەوەکان باسی ئەوە دەکەن که سەربازه رووسی‌یەکان له جەنگی جیهانی ەمـدا هـەنگوینیان بـەکار دەهێنـا بـۆ چارەسـەری برینـەکانیان، پزیشـکێکی ـتەرگەری بـەریتانی بـەناوی (کاڤانـا) هـەنگوینی بـەکاردەهێنا دوای کـرداره

کەڕووە لەناو بەرێت، بە تایبەتی ئەوانەی کە بەرگەی دەرمانە دژە کەڕووەکانیان دەگرت، لەمەوە توێژەرەوەکان کاریگەریی دژە کەڕووی بەهێزی هەنگوینیان بۆ دەرکەوت، بەڕاستی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر راستی فەرمووە: ﴿عَلَيْكُم بِالشِّفَاءَيْنِ العَسَلُ وَالقرآن﴾.

## هەنگوین و هەوکردنی گەدە و ریخۆڵەکان:

گۆڤاری پزیشکی بریتانی (B.M.J.) توێژینەوەیەکی بڵاو کردەوە سەبارەت بە بەکارهێنانی هەنگوین بۆ چارەسەری هەوکردنی گەدە و ریخۆڵە و سکچوون لە منداڵاندا، لەسەر ١٦٩منداڵ سازدرابوو کە سکچوونیان هەبوو و تەمەنیان لە نێوان (٨ رۆژ – ١١ ساڵ) بوو، کران بە ٢ گرووپەوە، گرووپی یەکەم چارەسەری ئاسایی سکچوونیان درایە کە شلەمەنی و گیراوەی کانزاکانە و شەکری (گلوکۆز)یشی تێدایە، گرووپی دووەم هەمان شلەمەنی و گیراوەیان درایە بەڵام لە جیاتی شەکری گلوکۆز ٥٠ میللیلیتر هەنگوینی پاڵفتەیان درایە، لە ئەنجامی ئەم توێژینەوەیە لێکۆڵەرەوەکان گەیشتنە ئەم ئەنجامانە:

١- هەنگوین دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ماوەی سکچوون لەو ئەخۆشانەی تووشی هەوکردنی گەدە و ریخۆڵەکان بوون، بە تایبەتی ئەوانەی بەهۆی بەکتریای سالمۆنێلا (Salmonella) و شیگێلا (Shigella) و (E. coli)وە تووشی مرۆڤ دەبێت.

٢- ئەم کاریگەرییەی هەنگوین دەگەڕێتەوە بۆ سیفەتە دژە میکرۆبییەکەی و ماددەکانی ناوی وەك پێشتر باس کرا.

٣- پێویستی ئەو منداڵانەی کە هەنگوینیان درابوویە بۆ دەرمانی دژە میکرۆب، کەمتر بوو لەو منداڵانەی کە هەنگوینیان نەدرابوویە.

٤- دەتوانرێت هەنگوین بەکار بهێنرێت لە گیراوەی دژە سکچوونەکاندا لەبری شەکری گلوکۆز، کە زۆر کاریگەرتر و سوودبەخش تریشە.

٥- ئەو شەکری فرەکتۆزەی کە لە هەنگویندایە بووە هۆی زیاتر مژینەوەی ئاو لە ریخۆڵەکانەوە بەبێ زیاد کردنی مژینەوەی صۆدیۆم لەو کەسانەی کە هەنگوینیان

کەڕووی بەهێزی وەك نیستاتین (Nystatin)، بینرا کە کاریگەری دژە میکرۆبی هەنگوین لەم ماددانە بەهێزترە، لەو بەکتریایانەی کە ئەم تاقیکردنەوەیان لەسەر کرا بەکتریاکانی: ( E. coli, Proteus, Klebsiella, Salmonella, Shigella) بوون.



لەگەڵ ئەوانەی باسمان کرد هێشتا بە تەواوەتی فاکتەرەکانی ئەم کاریگەرییە دژە میکرۆبییەی هەنگوین بە تەواوەتی نەدۆزراونەتەوە، و چەندین نهێنی تر ماوە کە هێشتا پەردەی لەسەر لانەدراوە، و وەك نهێنییەکی خودایی سەرسوڕهێنەر ماوەتەوە.

## کاریگەریی هەنگوین لەسەر کەڕووەکان:

هەندێك جۆر کەڕوو نەخۆشی لە مرۆڤدا دروست دەکەن کە بەناوبانگترینیان کەڕووی (Candida)یە، کە چەندین شوێنی لەشی مرۆڤ تووش دەکات بە تایبەتی لۆچەکانی پێست، دەبێتە هۆی سووتانەوە و خوران و سووربوونەوە لە شوێنی تووش بوودا، ئەم کەڕووە بە زۆریی تووشی ئەو کەسانە دەبێت کە نەخۆشی شەکرە یان ئایدز یان شێرپەنجەیان هەیە، هەروەها تووشی ئافرەتی دووگیانیش دەبێت، چەندین جۆر دەرمانی دژە کەڕووی کاریگەر هەیە لەوانە: نیستاتین (Nystatin) و مایکۆنازۆل (Miconazole).

لەم دواییانەدا تاقیکردنەوەیەك سازکرا بۆ زانینی کاریگەریی هەنگوین لەسەر ئەم جۆرە کەڕووە، ئەم توێژینەوەیە لەسەر ٧٢ئافرەت سازکرا، بینرا کە دەرمانە دژە کەڕووەکان زۆر کاریگەرن لەسەر ئەم جۆرە کەڕووە، بەڵام هەندێك گرووپی ئەم کەڕووە توانییان بەرگری لە کاریگەریی ئەم دەرمانانە بکەن، لێرەدا توێژەرەوەکان هەنگوینیان بەکار هێنا و بینییان کە دەتوانێت هەموو گرووپەکانی ئەم جۆرە

(Catalase) کەئەم هەڵدەستێت بە گۆڕینی ماددەی (Hydrogen Peroxide) بۆ ئۆکسجین و ئاو.

٦- ڤیتامینەکان: هەنگوین چەندین جۆر ڤیتامینی تێدایە وەك (A, B, K) کە ڕێژەیان زۆر کەمە، جۆری ڤیتامینەکان بە پێی جۆری هەنگوینەکە و سەرچاوەی گوڵەکەی دەگۆڕێت، هەندێك جۆری هەنگوین ڕێژەیەکی زۆر لە ڤیتامین (C) تێدیە.

## بەکارهێنانە پزیشکییەکانی هەنگوین:

### کاریگەریی هەنگوین لەسەر میکرۆب و کەڕوودکان:

زۆرێك لە توێژینەوە تاقیگەییەکان کاریگەریی دژە میکرۆبی (Antimicrobial) هەنگوینیان دەرخستووە، سەلماوە کە هەنگوین لەناوبەری بەکتریایە بە هەردوو جۆری گرام پۆزەتیڤ (Gram +ve) و گرام نێگەتیڤەوە (Gram -ve)، زۆر لێکدانەوە کراوە بۆ ئەم کاریگەرییەی هەنگوین لەوانە:

١- بەکارهێنانی هەنگوین دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی پەستانی ئۆزمۆڵی (Osmotic Pressure) لەسەر رووی برینەکە، کە ئەمە دەبێتە هۆی ڕێگرتنی گەشەکردنی میکرۆب و لاواز کردنی چالاکییەکەی.

٢- هەنگوین ناوەندێکی ترشی هەیە (ph: 3.5) کە رۆڵی هەیە لە کاریگەرییە دژە میکرۆبییەکەیدا.

٣- فاکتەری سێیەم بریتییە لە بوونی ماددەی (Inhibin) کە بریتییە لە پیرۆکسیدی هایدرۆجین (Hydrogen Peroxide) و دژە میکرۆبە.

ئەم سێ فاکتەرە نەك بەتەنها گەشەکردنی میکرۆب لاواز دەکەن بەڵکو لە هەمان کاتدا دەبنە هۆی تێکشکاندنی ئەو ژەهرانەی (Toxins) کە هەندێك میکرۆب دروستیدەکەن.

لە لێکۆڵینەوەیەکی تاقیگەییدا هەنگوین بەراورد کرا لەگەڵ چەند دژە میکرۆب و بەکتریایەکی بەهێزی وەك ستریپتۆمایسین (Streptomycin)، و دژە

| بڕەکەی | ماددە | بڕەکەی | ماددە |
| --- | --- | --- | --- |
| ٢ میللیگرام | مەگنیسیۆم | ٧٦,٤ گرام | کاربۆهیدرات |
| ١٧ میللیگرام | فۆسفۆر | ٢٣ گرام | ئاو |
| ٠,٤ میللیگرام | ئاسن | ٠,٥ گرام | پرۆتین |
| ٠,٠٥ میللیگرام | مس | ٠ | چەوری |
| ١ میللیگرام | گۆگرد | ٢٨٨ کیلۆ کالۆری | بـــــــڕی ووزە (السعرات الحراریە) |
| ١٨ میللیگرام | کلۆر | ١١ میللیگرام | صۆدیۆم |
| ٠,٠٥ میللیگرام | رایبـــــــۆفلاڤین (ڤیتامین B2) | ٥ میللیگرام | پۆتاسیۆم |
| ٠,٢ میللیگرام | ترشی نیکۆتینی | ٥ میللیگرام | کالیسیۆم |

٤- پرۆتینــەکان: هـەنگوین چەندین جـۆر ترشـی ئـەمینی تێدایـە، هـەموویان بێجگە لە ترشـی (پـرۆلین) لـە شـیلەی گوڵەکانـەوە وەرگیراون، پـرۆلین هـەنگ خـۆی زیـادی دەکـات بـۆ هەنگوینەکـە لـە کـاتی دروسـت کردنـیدا، هـەنگوین ٠,٥./ی لـە پرۆتینەکان پێکدێت.

٥- ئەنزیمــەکان (Enzymes): لـە هەنگوینـدا چـەندین جـۆر ئـەنزیم هەیـە، لەوانە: ئەنزیمی ئینڤێرتەیز (Invertase) کە لـە هـەموو ئەنزیمەکانی تـر زۆرتـرە لـە هەنگویندا و هەڵدەستێت بـە تێکشـکاندنی شـەکری دووانـی بـۆ شـەکری تـاکی (گلوکۆز و فرەکتۆز).

هـەروەها ئـەنزیمی گلوکـۆز ئۆکسیدەیز (Glucose Oxidase) کـە گلوکـۆز دەگۆڕێت بـۆ ترشـی گلوکۆنیـك (Gluconic Acid) کـــە لـــەمیشەوە ماددەی (Hydrogen Peroxide) پەیـدا دەبێـت کـە سـیفەتی دژە میکرۆبـی بـەهێزی هەیـە، ئـەنزیمی دایەسـتەیز (Diastase) ئـەمیش هەڵدەسـتێت بـە تێکشـکاندنی شەکرە ئاڵۆزەکان (نیشاستەکان) بۆ شەکری بچووکتر و ئاسانتر، ئەنزیمی کەتەلەیز

١- شـــەكر: شـــەكرەكان (Sugars) جـۆرێكن لـە كاربۆهیـدرات و٢ بەشـی سەرەكی‌یان هەیە: شەكری تاك (Mono Saccharides) كە ١ جۆر شەكری تێدایە، شەكری دووانی (جووت Disaccharides) كە ٢ جۆر شەكری تێدایە، ئەو شەكرە سادەیەی كە ئێمە بەكاری دێنین بۆ شیرین كردن لە ژیانی رۆژانەماندا شەكرێكی دووانی‌یە، و ناودەبرێت بە سوكەرۆز (Sucrose)، شەكرەكان بەگشتی لـە رووی پێكهاتـەی بنچـینەیی‌یانەوە دوو جـۆری سـەرەكی پێكـدێنن، كـە هـەردووكیان شـەكری تـاكن: شـەكری تـرێ یـان گلوكـۆز (Glucose)، و شـەكری میوە یان فرەكتۆز (Fructose).



شەكری هـەنگوین لـە هـەردوو جـۆری گلوكـــۆز و فرەكتـــۆز پێكـدێت، هـەردووكیان ٧٦،٤٪ی هـــەنگوین پێكـــدێنن، شـــەكری دووانـی جـۆری (سـوكەرۆز)یـش ١٪ی پێكهاتـەی گشتی هـەنگوین پێكدێنێت.

٢- ئاو: ١٦-٢٠٪ی هەنگوین پێكدێنـێت، بوونـی ئـــاو لـــە هەنگوینـــدا بـــەم رێژەیـــە گرنگی‌یەكی زۆری هەیە، چونكە ئەگەر رێژەی ئاو لە هەنگویندا لە ٢٠٪ زیاتر بووایە دەبووە هۆی تەخەمموری (بۆگـەن كردنـی) هەنگوینەكـە و تێكچوونی، چـونكە هـەنگوین مـاددەی خـومرە (خمائر Yeasts)ی زۆری تێدایە كە زۆر حەزیان لە شەكرە.

٣- كانزاكان: رێژەی كانزاكان لە هەنگویندا دەگۆڕێت لە ٠،٠٤٪ لە هـەنگوینی رەنگ كاڵ، و ٠،٢٪ لە هەنگوینی تۆخدا، لەم خشتەیەی خوارەوەدا نرخی خـۆراكی و بڕی هەر ماددەیەك و كانزایەك لە ١٠٠گرام هەنگویندا روون كراوەتەوە:

بەردەوام بوونی، و شتێکی بەڵگە نەویستیشە کە ئەم زانیاری و شارەزایییە پێویستانە دەبێت دوای پەیدا بوونی کۆمەڵگاکە بەدەست هاتبێت، لێرەوە هەنگ پێش مرۆڤی داوەتەوە لە زانینی کاریگەریی خۆراك لەسەر گەشە کردن لە باروودۆخێکی دیاری کراودا).

پاش ئەوەی کە زانا (مۆریسۆن) لە کتێبەکەیدا چەند نموونەیەکی تری ژیانی زیندەوەران باس دەکات، دەڵێت: (بێگومان دەبێت دروستکەرێك رێنموویی کردبن بۆ هەموو ئەم کارە سەرسوڕهێنەرانە).

هەربۆیە زانا (ماترلینك)یش لە کتێبەکەیدا دەڵێت: (ئەگەر کەسێك لە جیهانێکی تری دەرەوەی زەوییەوە بێتە خوارەوە بۆ سەر زەوی و پرسیار بکات لە تەواوترین و ناوازەترین شتێك کە لە ژیاندا بەدەست هاتبێت و دروست کرابێت، ئێمە ناتوانین جگە لە شانەی سادەی هەنگ شتی تری پیشان بدەین، ئەویش لەبەر ووردی و تەواوی لەهەموو رووییەکەوە).

## ئەو شلەمەنییانەی لە سکی هەنگەوە دەردەچێت و گرنگییان لە رووی پزیشکی و دەرمانسازییەوە:



### ١- هەنگوین:

پێکهاتەی هەنگوین:

پێکهاتەی هەنگوین لە چەندین ماددەی سوود بەخشە، لەوانە: شەکر، ئاو، ترشە ئەمینییەکان، ڤیتامینەکان، کانزاکان و ئەنزیمەکان، با ئێستا بچینە سەر باس کردنی ئەم پێکهاتانە بە درێژی:

بۆ ئەوەی بەم رۆڵانەیان هەستن؟ بێگومان ئەو کەسە پەروەردگاری باڵادەستە کە دەفەرموێت: ﴿وَ مَا مِن دَآبَّةٍ فِي الأَرْضِ وَ لاَ طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلاَّ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم﴾، ﴿وَ أَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَ مِنَ الشَّجَرِ وَ مِمَّا يَعْرِشُونَ {٦٨} ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلاً يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاء لِلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ {٦٩}﴾.

زانای بەناوبانگ (کریس موریسۆن) کە سەرۆکی ئەکادیمیای زانستی نیویۆرک بووە، لە کتێبی {(الإنسان لا يقوم وحده) یان (العلم يدعو للأيمان)} دا دەڵێت:

(کارکەرەکانی هەنگ هەڵدەستن بە دروست کردنی خانەی شەش پاڵوویی جۆراوجۆر لە قەبارەدا بۆ پێگەیاندنی کرمۆکەکان، خانە بچووکەکان بۆ کارکەرەکان دادەنێت، لەو گەورەتر بۆ نێرینەکان دادەنێت، ژووری تایبەت بۆ شاژنی سکپڕ دادەنێن، شاژنە هەنگیش هێلکۆکەی نەپیتێنراو لەو خانانەی بۆ نێرینەکان دانراوە دادەنێت، هێلکۆکەی پیتێنراویش دەخاتە ئەو خانانەوە کە بۆ کارکەرەکان و شاژنەکانی دوارۆژ دیاری کراوە، پاشان کارکەرەکانیش بەوپەڕی سۆزەوە هەنگوین و هەڵاڵەی جووراو دەدەن بە کرمۆکە سەرەتاییەکان، کە پاش ماوەیەک بۆیان ناجوون و هەنگوین و هەڵاڵەیان راستەوخۆ پێ دەدرێت، ئەو مێینانەی بەم شێوەیە خۆراکیان دەدرێتێ لە دواییدا کارکەری نوێ و بەهێزی شانەی هەنگیان لێ دەردەچێت.

لەلایەکی تردوە ئەو مێینانەی کە لە خانە شاهانەکاندا دانراون بۆ ئەمان خواردنی تایبەتی و جووراو بە بەردەوامی دەبێت و ئەمانەی کە ئاوا بە تایبەتی مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت گەشە دەکەن بۆ شاژنی هەنگ، ئەمانن کە بە تەنیا دەتوانن هێلکە دابنێن، ئەم کرداری بەردەوام بوونی بەرهەمهێنانە پێویستی بە خواردن و خانەی تایبەت هەیە و لەهەمان کاتدا شوێنەواری سەرسوڕهێنەری گۆڕینی خۆراك دەردەخات، بەردەوام بوونی ئەم کرداری بەرهەمهێنانە پێویستی بە چاودێری و جیاکردنەوە و خۆراکی تایبەتی هەیە، ئەم گۆڕانکارییانەش بە تایبەتی بەسەر ژیان لە کۆمەڵگادا دەچەسپێت، و زۆر گرنگ و سەرەکییە بۆ

ئەگەر کارکەرەکان ئەم نیشانە ئاشکرایە نەبینن، ئەوا دەزانن کە جووت بوونەکە شکستی هێناوە و خۆیان ئامادە دەکەن بۆ ئاهەنگێکی شاهانەی تر.

## هەنگ بانگەشە دەکات بۆ ئیمانداریی:

نووسەری بەناوبانگ (مۆریس ماترلینك) لە کتێبێکی‌دا بەناوی (ژیانی هەنگ Life of Bee)دا وەسفی ئەو هێزە رۆحی‌یە شاراوەیەمان بۆ دەکات کە کاری هەموو ئەندامانی شانەی هەنگ رێك دەخات و دەڵێت:

(کارکەرەکان بە کاری خۆیان هەڵدەستن هەریەکە و بە پێی تەمەن و رۆڵی خۆی، دایەنەکان و بەخێوکەرەکان ئاگاداری و سۆز و گەرمی بە کرمۆکەکان دەبەخشن، هاوەڵەکانی شاژن هەمیشە لەگەڵیدان و لەخزمەتیدان، کارکەری تایبەتی هەڵدەستن بە هەوا گۆڕکێی شانەکە و پاراستنی پلەی گەرمی‌یەکەی، کارکەرە ئەندازیارەکان خانە شەش پاڵوەکان دروست دەکەن، کارکەری تر هەڵدەستن بە گەشتی دۆزینەوەی شوێنەکانی شیلە و هەڵاڵەی گوڵ، کیمیازانی تایبەت لە پێگەیشتن و پاراستنی هەنگوینە



هەڵگیراوەکە دڵنیا دەبن، کارکەری تر خانەکان پڕدەکەن لە هەنگوین و دایدەخەن، پاککەرەوەی تایبەت پارێزگاری پاك و خاوێنی شەقام و شوێنە گشتی‌یەکانی ناو شانەکە دەکەن، مردوو نێرەکان لاشەی کارکەر و نێرینە مردووەکان دەشارنەوە، پاسەوانانی دەرگای شانەکە چاودێری ئەوانە دەکەن کە دێنە ژوورەوە و دەچنە دەرەوە و بێگانەکان و هەر کەسێك کە بیەوێت ئاسایشی ناو شانەکە تێك بدات دەکەنە دەرەوە)، ئایا کێیە کە هەموو ئەمانەی فێرکردن؟ کێیە کە ئیلهامی پێدان

له سەفەرەکەی‌دا پێوەی نووساوە و خۆشی و شادی هەموو مەملەکەت دەگرێتەوە، کارکەرەکان هەڵدەستن بە ئامادەکردنی خانەی مۆمی شەش پاڵوویی نوێ و چاك کردنەوەی خانە کۆنەکان، بە مەبەستی ئامادەکردنیان بۆ دانانی هێلکۆکەی نوێ تیایاندا، شاژنیش -کە لەوپەڕی دڵخۆشی و چالاکی‌دایە- دەست دەکات بە دانانی ژمارەیەکی ئێجگار زۆر لە هێلکۆکە، کە ڕۆژانە ۱۵۰۰ بۆ ۲۰۰۰ هێلکۆکە دادەنێت بۆ ماوەی زیاد لە ۳مانگ، زانایان وای دادەنێن کە شاژن نزیکەی ۲۰۰ تا ۲۵۰هەزار هێلکە لە یەك وەرزدا دادەنێت، کاتێکیش دەمرێت لەدوای خۆی نزیکەی ۱ملیۆن هێلکۆکە جێ‌دەهێڵێت.

+ لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە: بۆچی دەبێت بۆ هەر شاییەکی شایانە نزیکەی ۲۰۰نێرینە ئامادە بکرێت؟ ئایا یەك دانە یان چەند دانەیەك بەس نییە؟

– بوونی ئەو ژمارە زۆرەی نێرینەکان زۆر پێویستە بۆ مانەوەی شانەی هەنگ، چونکە یەکێك لەو نێرینانە دەبێتە باوکی هەموو ئەندامەکانی شانەی هەنگەکە بۆ ماوەی ٤–٥ ساڵی داهاتوو، ئەگەر ئەم نێرینەیە لاواز بێت و سیفاتی بۆماوەیی باش و بەهێزی نەبێت ئەوا دەبێتە هۆی لەناو چوونی ئەو مەملەکەتە، کەواتە ئەم ژمارە زۆرەی نێرینەکان بۆ ئەوەیە کە نێرینەیەکی بەهێز و خاوەنی سیفاتی باش مسۆگەر بکرێت بۆ ئەوەی لەگەڵ شاژندا جووت ببێت، هەروەها هۆکارێکی تری ئەم ژمارە زۆرە ئەوەیە کە شاژن لە کاتی فڕینی‌دا بەم نێرینانە دەورە بدرێت و لە مەترسی بەدوور بێت.

هۆکارێکی تری فڕینی شاژن بۆ ئەو بەرزییە زۆرە ئەوەیە کە ئەندامی زاووزێی نێرینە بە هۆی پەستانی هەواوە ئامادە دەبێت بۆ جووت بوون، ئەمەش بەهۆی فڕینی زۆرەوە دێتە دی، کەواتە فڕین بۆ ئەو بەرزییانە نێرینەکان ئامادە دەکات بۆ جووت بوون، لە کۆتاییدا دەپرسین: ئایا نابێت ئەو جووت بوونە ڕووبدات بەبێ ئەوەی نێرینەکە بمرێت؟

دەڵێین: لەبەرئەوەیە کاتێك کە شاژن دەگەڕێتەوە بۆ لای کارکەرەکان و ئەندامی زاووزێی نێرینەکەی پێوە دەبینن، دڵنیا دەبن لەوەی کە جووت بوون ڕوویداوە،

دوای تەواو بوونی گەشەکردنی لە خانەکەیەوە دێتە دەرێ، یەکەم کارێك کە پێی هەڵدەستێت ئەوەیە کە دەگەڕێت بەسەر خانە شایانەکان کە شاژنی تری تێدایە و لە قۆناغی تەواو بوونی گەشە کردندان، و هەڵدەستێت بە کردنی چزووەکەی بە لەشیاندا و لەناویان دەبات، ئەگەر دوو شاژن بەیەکەوە و لەیەك کاتدا بێنە دەرەوە ئەوا شەڕ لە نێوانیاندا بەرپا دەبێت تاوەکو یەکێکیان ئەوی تر لەناو دەبات.

پاش هەفتەیەك لە خۆ ئامادەکردن قۆناغەکانی ئەم ئاهەنگە شایانەیە دەست پێ دەکات، سەرەتا شاژن لە شانەکە دەچێتە دەرەوە و لە چەند لایەکەوە بە دەوریدا دەسووڕێتەوە، بۆ ئەوەی پاش تەواو بوونی جووت بوون شانەکەی لێنەگۆڕێت و بە ئاسانی بگەڕێتەوە بۆ شانەکەی خۆی، پاشان هەڵدەستێت بە دروستکردنی چەند دەنگێکی دیاری کراو و بڵاوکردنەوەی بۆنێکی خۆشی تایبەتی بۆ ڕاکێشانی سەرنجی نێرینەکان، کە ئەمانیش بە تەواوەتی کاریان تێدەکرێت و بە پەلە لە شانەکە دێنە دەرەوە و بەدوای شاژندا دەفڕن، شاژن بەهۆی باڵە بەهێزەکانییەوە وەکو تیر بە ئاسماندا دەفڕێت و نێرینەکانیش هەوڵدەدەن پێی بگەنەوە و چەند لە شاژن نزیك ببنەوە ئەوەندە ئەویش فڕینەکەی خێراتر دەکات، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە دانە دانە نێرینەکان بکەونە خوارەوە و نەتوانن پێی بگەنەوە، لە کۆتاییدا شاژن فڕینی زۆر خێراتر دەکات و تا بەرزیی چەند بتوانێت سەر دەکەوێت، تاوەکو ئەو نێرینەیەی کە لە هەموو ئەوانی تر بەهێزتر و بەتواناترە دەتوانێت پێی بگاتەوە و لەگەڵ شاژنەکەدا جووت دەبێت، ئەم مەراسیمە شاهانەیە پاش ١٥-٢٥ دەقیقە لە دەست پێکردنی تەواو دەبێت.

پاش ئەم گەشتە بووکە شاهانەکە دەگەڕێتەوە و میراتی زاوا شەهیدەکەی لەگەڵ خۆی دەهێنێتەوە کە نیشانەی سەرکەوتنی کرداری پیتاندنەکەیە، چونکە ئەندامی زاوزێی نێرینەکە لە لەشی دەبێتەوە لەگەڵ بەشێکی ناوسکیدا، و دوایی ئەم مێرووە بەسەرزمانە تامردن خوێنی لێدەڕوات، شاژنی بێوەژن دەگەڕێتەوە بۆ شانەکەی و کارکەرەکان هەڵدەستن بە پاك کردنەوەی لەو شتانەی

باڵ دەفەرێت وەك ئێوە نەتەوە و ئوممەتن، لەم ئایەتەدا ئیعجازێکی گەورە هەیە چونکە زانایان تەنیا بەم دوایی‌یانە گەیشتنە ئەم راستی‌یانە دەربارەی هەنگ.

سەبارەت بە نێرینەی هەنگ:

هەر لە کۆنەوە مرۆڤ بۆ نێرینەی هەنگی روانیوە وەك مێروویەکی تەمەڵ و بێکار، چونکە تەنیا کاری نێرینەکانی هەنگ ئەوەیە کە شاژن بپیتێنن، ئایا لە راستی‌دا بەو شێوەیە و بە ئەنقەست خۆی تەمەڵ دەکات و کارناکات؟ بەڵگە زانستی‌یەکان ئاماژە بۆ غەیری ئەمە دەدەن، چونکە ئەمانە تەمەڵ نین بۆ ئیش کردن، بەڵکو پەروەردگار وای دروست کردووە کە ناتوانێت بە کاری کارکەرەکان هەڵسێت، لە پێیەکانی‌دا توورەکە نی‌یە کە بتوانێت هەلالەی تێدا کۆبکاتەوە و زمانی زۆر کورتە کە بەهۆیەوە ناتوانێت شیلەی گوڵ بمژێت، کەواتە لە راستی‌دا ئەو توانای ئەوەشی نی‌یە کە خۆراك بۆ خۆی دابین بکات، و داوای خواردن لە هاوەڵە کارکەرەکانی دەکات، کەواتە تەمەڵی لە سیفەتەکانیاندا نی‌یە، بەڵکو توانای جەستەیی نی‌یە بۆ ئەوەی بە کارەکانی کارکەرەکان هەڵسێت، و خوای گەورە کارێکی گرنگی پێسپاردووە کە هەر کاتێك پێی هەستا نامێنێت و دەچێتە دونیای فەوتانەوە، ﴿لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَ هُمْ يُسْأَلُونَ﴾ (الانبياء:٢٣)، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿إعمَلوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِما خُلِقَ لَهُ﴾ رواه البخاري، واتە: هەمووتان ئیش بکەن، چونکە هەموو زیندەوەرێك بۆ ئەوەی بۆی دروستکراوە رێك کراوە و کاری بۆ ئاسان کراوە.

تەنها چەند دانەیەك لە کۆی سەدان نێرینە دەتوانن کارەکەیان لەم ژیانەدا بە ئەنجام بگەیەنن کە بریتی‌یە لە هەستان بە پیتاندنی هێلکەکان، بە مەبەستی بەردەوام بوونی ئەوەی هەنگ و زیاد بوونیان، هەر کاتێکیش کە بە کرداری پیتاندنەکە هەڵسێت کارەکەی لەم ژیانەدا تەواو دەبێت و راستەوخۆ دەمرێت.

ئاهەنگی شایانە:

یەکەم کارێك کە شاژنی نوێ پێی هەڵدەستێت دوای لەناوبردنی هاوشێوەکانی بریتی‌یە لە خۆ ئامادەکردن بۆ ئاهەنگی شایی شایانە، کاتێك کە یەکەم شاژن

هێلکۆکەکانی (گەراکانی) شاژن پاش ٣ڕۆژ دەترووکێن و کرمۆکە دروست دەکەن، لە سەرەتادا هەموو کرمۆکەکانی هەنگ خواردنی شایانە (الغذاء الملكي Royal Jelly)یان دەدرێتێ لە لایەن کارکەرەکانەوە، لە دوای ٣ ڕۆژ تەنها دەدرێت بەو کرمۆکانەی کە دەبن بە شاژن، و ئەوانی تر تەنها هەنگوینیان دەدرێتێ، کاتێك کە چەند شاژنێکی نوێ گەشە دەکەن لە شانەی هەنگدا و دوایی دێنە دەرەوە، سەرەتا ناکۆکی و جەنگ لە نێوانیاندا ڕوو دەدات و لە کۆتاییدا تەنها یەك دانەیان دەمێنێتەوە، کە ئەمیش هێرش دەکاتە سەر شاژنە کۆنەکە و ناچاری دەکات کە شانەکە بەجێبهێڵێت لەگەڵ کۆمەڵێك لە کارکەرەکان، و دەڕۆن بۆ دروست کردنی شانەیەکی نوێ.

ئایا شاژن فەرمانڕەوایەتی شانەی هەنگ دەکات؟

لە کتێبی سروشتناسی (Reader's Digest Family Guide to Nature)دا هاتووە: لەگەڵ ئەوەی کە شاژن گرنگترین تاکی کۆمەڵگای هەنگە بەڵام لە ڕاستیدا فەرمانڕەوایی شانەی هەنگ ناکات، بەڵکو تەنها چەند هۆرمۆنێك دەردەدات کە هەڵس وکەوتی هەنگەکان دیاری دەکات، ئەم هۆرمۆنانە لەرێی ئەو کارکەرانەوە کە لەشی شاژنەکە پاك دەکەنەوە دەگوێزرێتەوە بۆ کارکەرەکانی تر، کاری ڕاستەقینەی شاژن بریتییە لە بەرهەمهێنان و دانانی هێلکەکان، چونکە شاژن تەنها مێینەی پێگەیشتووی شانەی هەنگە، و کارکەرەکان ئەندامەکانی زاوزێیان پێنەگەیشتووە، شاژن هەڵناستێت بە بەخێو کردنی و خواردن پێدانی بێچووەکانی، بەڵکو بە تەواوەتی پشت بە کارکەرەکان دەبەستێت بۆ ئەم کارە، کەواتە کێ فەرمانڕەوای شانەی هەنگە؟ کارکەرەکان خۆیانن، چونکە ئەمانن کە بڕیار دەدەن کەی و لە کوێ شیلە و هەڵاڵەی گوڵ کۆبکەنەوە، ئەمانیشن کە بڕیار دەدەن کەی شاژنی شانەکە بگۆڕدرێت، هەر ئەمانیشن کە کاتی کۆچ کردنیان بە کۆمەڵ دیاری دەکەن بە مەبەستی پێکەوەنانی شانەیەکی نوێ.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَ مَا مِن دَآبَّةٍ فِي الأَرْضِ وَ لاَ طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْـهِ إِلاَّ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم﴾ (الأنعام:٣٨)، واتە: هەموو زیندەوەرێکی زەوی و هەموو تەیرێك کە بە

# هێلکاری قۆناغەکانی گەشەکردنی هەنگ










توێکاری هەنگێک، لەگەڵ جۆرەکانی هەنگ

## له نهێنییەکانی جیهانی هەنگ:



مێشهەنگ مێروویەکی بەسوود و گورج و گۆڵ و بۆزیان، و پاك خۆر و خۆپارێزە لە پیسی، هەر بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی هەنگ دەفەرموێت: ﴿مثل المؤمن مثل النّحلة، لا تأكل إلا طيبا و لا تضع إلا طيبا﴾، واتە: نموونەی ئیماندار وەك هەنگ وایە، خواردنی پاك نەبێت نایخوات، و ئەوەشی کە دای دەنێت هەر پاکە، لە (دائرة المعارف البريطانية Encyclopedia Britannica)دا هاتووە:

هەنگی هەنگوین (Honey Bee) جۆریان زۆرە، هەیانە لە ئەورووپادا دەژی و ناودەبرێت بە (Apis mellipera)، هەروەها هەیانە لە ئاسیادا دەژی و ناودەبرێت بە (A. florea)، ئەمانە جۆرە بچووکەکانن.

جۆرە قەبارە گەورەکانی هەنگ ناویان (A. dorsata)ە ولە هیندستان و چین و ئەندەنووسیادا دەژین، هەموو جۆرەکانی هەنگ لە هێلانە یان لە شانەی هەنگ (Hives)دا دەژین، سێ جۆر هەنگ لە شانەی هەنگدا هەیە:

١- کارکەرەکان (العاملات): کە بریتین لە مێینەی پێنەگەیشتوو (Undeveloped).

٢- شاژنەکان (الملكات Queens): کە قەبارەی لەشیان لە کارکەرەکان گەورەترە.

٣- نێرینەکان (الذكور Drones): کە لە کارکەرەکان گەورەترن و تەنها لە سەرەتای هاویندا هەن، شاژنەکان و کارکەرەکان بەوە جیادەکرێنەوە کە چزوویان (Stings) هەیە بەڵام نێرینەکان چزوویان نییە، شاژنی هەنگە کە بە تەنها هێلکە (گەرا) دادەنێت، ئەو هێلکۆکانەی شاژن کە بە تۆوی نێرینەکان دەپیتێنرێن گەشە دەکەن بۆ دروستکردنی کارکەرەکان، بەڵام ئەو هێلکۆکانەی کە شاژن دایان دەنێت و نایانپیتێنێت گەشە دەکەن بۆ دروستکردنی نێرینەکان.

٣- ووتەی پەروەردگار (فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّـــاسِ): کە ئەیفەرمووە شیفـــای تێدایـە بۆ هەمـوو خەڵکی بەگشتی، بەڵکو بە ڕەهـایـــی ئـــەم بـابەتەی هێڵاوەتـــەوە بـــۆ ئـــــەوەی زانایـان توێژینــەوە لەسـەر ئەو نەخۆشییانە بکەن کە خوای گەورە لەم ماددانەدا شیفای بۆ داناون، لەمەشدا هاندانی تێدایە بۆ مرۆڤەکان بۆ ئەوەی توێژینەوە بکەن، بە مەبەستی ناسینی ئەو کەسانەی کە نەخۆشییەکانیان بەم دەرمانانە چارەسەر دەکرێت.

کەواتە لەم سێ ووشەیەدا (فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّـــاسِ) چەندین موعجیزەی جۆراوجۆر هەیە: ئاماژەی داوە بۆ ئەو ماددانەی کە لە سکی هەنگەوە دێنە دەرێ، پاشان دەفەرموێت: لـەم ماددانـەدا شیفا و چارەسـەر هەیـە، لـە کۆتـایـیدا بـۆ ئێمـەی بەجێهێڵاوە کە بیدۆزینەوە کە ئایا هەر ماددەیەك چ کەسێك و چ نەخۆشییەکی پێ چارەسەر دەکرێت.

لەم سێ ووشەیەدا خوای گەورە بناغەی توێژینەوەیەکی گرنگی زانستی لە بـواری پزیشکی و دەرمانسـازیدا دامەزرانـدووە، چـونکە کاتێـك زانایـان وای دا دەنێن کە لە ماددەیەك یان رووەکێکی دیاری کراودا چارەسەر هەیە، سەرەتا لە پێکهاتن و خاسییەتەکانی دەکۆڵنەوە......

پاشان لە تاقیگەدا تاقیکردنەوەی لەسەر دەکەن، لەناو لوولەی تاقیگە و لەسـەر ئاژەڵەکانی تاقیکردنەوە، بۆ ئەوەی خاسـییەتە شیفاییەکانیان بۆ دەرکەوێت، ئەمە قۆناغی دووەمە.

پاشان تاقیکردنەوەکان دەگوێزرێتـەوە بۆ مرۆڤەکان و توێژینـەوە لەسـەر ئەو کەسانە دەکرێت کە لەوانەیە ئەم ماددەیە ببێتە چارەسەر بۆیان.

لە کۆتاییدا پەروەردگار دەفەرموێت: (إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَـــةً لِّقَـــوْمٍ يَتَفَكَّـــرُونَ)، بە راستی ئەوەی کە تـا ئێسـتاش باسمـان کـرد چـەندین بەڵگەی ئاشـکرای تێدایـە لەسەر موعجیزەی قورئانی پیرۆز، بە تایبەتی بۆ کەسانی خاوەن عـەقڵ و ژیریـی و ئینصاف.

لەوانەیە کەسانێك هەبن کە بپرسن: ئێوە ئەی موسوڵمانان دەڵێن لە قورئاندا هاتووە کە هەنگوین شیفای تێدایە (فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ)، ئێمەش دەزانین کە کە زۆرێك لە نەتەوە کۆنەکان وەك میسرییە کۆنەکان و یۆنانییەکان و رۆمانییەکان هەنگوینیان بەکار دەهێنا بۆ چارەسەر کردن، هەروەها باسی هەنگوین لە کتێبە ئاسمانییەکانی تردا هاتووە، کەواتە رووی ئیعجاز لێرەدا چییە؟

ئێمە دەڵێین: ئیعجازی ئایەتەکانی سوورەتی (النحل) تەنها لەوەدا نییە کە دەڵێت هەنگوین شیفای تێدایە، بەڵکو ئیعجازەکە لە سێ شتدا خۆی دەبینێتەوە:

١- خوای گەورە بە ئاشکرا باسی هەنگوینی نەکردووە لە ئایەتەکەدا کە فەرموویەتی: ﴿يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ﴾، واتە: شلەیەك لە سکی دێتە دەرەوە، و نەیفەرمووە (یخرج عسل) واتە هەنگوین لە سکی دێتە دەرەوە، کە وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا کە جۆراوجۆرە ئەوەی لە سکی هەنگ دێتە دەرێ، و خوای گەورە بۆ مرۆڤی جێهێڵاوە کە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەوانە بکات کە دێنە دەرێ، وەك ئەم پێکهاتووانە: هەنگوین و خواردنی شایانە... و کەتیرە (عیکبیر)... و مۆم... و ژەهری هەنگ. و توێژینەوە لەسەر سیفاتەکان و پێکهاتەکانیان بکات، ئەمەش قۆناغی ناسینە.

٢- لەمانەی لە سکی هەنگەوە دێنە دەرەوە بەگشتی شیفا و چارەسەر هەیە: لە هەنگویندا چارەسەر هەیە... لە خواردنی شایانەدا چارەسەر هەیە... لە عیکبیردا چارەسەر هەیە... لە مۆمەکەشدا شیفا هەیە... تەنانەت لە ژەهری هەنگیشدا چارەسەر هەیە.

مرۆڤ چۆن دەتوانێت دڵنیا بێت لەوەی کە لەم ماددانەدا شیفا هەیە بەبێ ئەوەی کە توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی وورد لەم بوارانەدا نەکات، بۆ ئەوەی سیفاتە شیفاییەکانی ئەم ماددانەی بۆ دەرکەوێت: کە ئایا ئەم ماددانە میکرۆبە کوشندەکان لەناو دەبەن؟ یان ماددەی بەهێزکەری بەرگری لەشی تێدایە؟ یان چاو و پێست و ددانەکان چارەسەر دەکەن... یان....؟ ئەمەش قۆناغی توێژینەوەی زانستییە لە تاقیگەکاندا.

## هەنگوین لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ):

لە سوننەتی پیرۆزدا چەندین فەرموودە هاتووە کە باسی گرنگی و سوودەکانی هەنگوین دەکات لە چارەسەردا، لەوانە:

-عن ابن مسعود (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿عَلَيْكُم بِالشفاءَين العَسَـــلُ وَ القرآن﴾*، واتە: ئێوە لە کاتی نەخۆشی‌یەکانتاندا دوو چارەسەرەکە بەکاربهێنن کە هەنگوین و قورئانە.

-عن جابر بن عبد الله (رضي الله عنه) قال: سمعت النبي (ﷺ) يقول: ﴿إن كانَ في شَـــيءِ مِن أَدْوِيَتِكُم -أو يَكُونُ في شَيءٍ مِن أَدْوِيَتِكُم- خَيرٌ، فَفي شَرْطَةِ مِحْجَمٍ أو شَرْبَةِ عَسَلٍ أو لَذْغَةٍ بِنارٍ تُوافِقُ الدّاءَ، وَ ما أُحِبُّ أَنْ أَكْتَوِي﴾ رواه البخاري، و في رواية: ﴿الشِّفاءُ في ثلاثة: في شَرْطَةِ مِحْجَم، أو شَربَة عسل، أو كَيَّةٍ بِنار، وَ أَنْهى أُمَّتِي عَنِ الكَـــيِّ﴾ رواه البخاري، واتە: ئەگەر لە هەر دەرمانێکی ئێوەدا خێر و چارەسەر هەبێت، ئەوا لە سێ شتدا دەبێت: کەڵەشاخ و خوێن گرتن، یان خواردنەوەی هەنگوین، یان داخ کردن و کەوی بە ئاگر، کە من خۆم حەزم لە داخ کردن نی‌یە، و بەرگری لە ئوممەتەکەم دەکەم کە داخ بکەن.

-هەروەها ئەو فەرموودەیەی پێشتر باسمان کرد، سەبارەت بەو کەسەی کە براکەی سکی دەچوو، و پرسیاری لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد: عن ابي سعيد الخدري (رضي الله عنه) قال: جاء رجل الى رسول الله (ﷺ) فقال: إن اخي إستَطْلَقَ بَطْنُهُ؟ فقال: اسقه عَسلا. فسقاه عسلا، ثم جاء فقال: يا رسول الله، سَقَيْتُهُ عَسلا فما زاده إلا استطلاقا! قال: (إذهب فاسقه عسلا). فذهب فسقاه، ثم جاء فقال: يا رسول الله، ما زاده إلا استطلاقا! فقال رسول الله (ﷺ): (صدق الله و كذب بطن اخيك! إذهب فاسقه عسلا). فذهب فسقاه فَبَرا. رواه البخاري و مسلم.

---

* رواه ابن ماجة والحاكم في صحيحه والخطيب وابن عدي والبيهقي في شعب الإيمان، قال الهيثمي في مجمع الزوائد: إسناده صحيح، وقال الحاكم في المستدرك على الصحيحين: إسناده صحيح على شرط الشيخين، ووافقه الذهبي على ذلك.

ماندوو لەرووی عەقلّی و جەستەیی‌یەوە لەگەلّ نەمانی ئارەزوویان بۆ خواردن، ٨٤٪ی ئەو کەسانەی تاقی‌کردنەوەیان لەسەر کرا ماندوو بوونیان چاکبوو و ئارەزووی خواردنیان بۆ گەڕایەوە، هەروەها بۆ بەهێزکردنی توانای جنسیش بینراوە کە زۆر سوودمەندە، لەو ئافرەتانەی کە دەچنە تەمەنی بێئومێدی‌یەوە (سن اليأس) کە لە نێوان (٤٥-٥٠) سالّی‌دایە، بینراوە کە بەکارهێنانی گولاجێك کە ئەم ماددەیەی تێدایە بووە هۆی کەمکردنەوەی ناڕەحەتی‌یەکانی چوونە ناو ئەم قۆناغەی ژیانەوە.

هەروەك پێشتریش باسکرا بەکارهێنانی هەلاّلە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ئەگەری تووشبوون بە نەخۆشی‌یە هەستیاری‌یەکان و رەبو ئەویش لەرێی راهێنانی لەش (Desensitization) بەو ماددانەی کە دەبنە هۆی تووشبوون بەم نەخۆشی‌یانە، لەو کەسانەی کە بەهۆی شێرپەنجەوە چارەسەری تیشکی‌یان بۆ بەکاردێت چەندین ناڕەحەتی‌یان بۆ دروست دەبێت وەك: ڕشانەوەی بەردەوام، ئازاری ناوسك و نەمانی ئارەزوو بۆ خواردن، بینرا کە ئەگەر گیراوەیەکیان بدرێتێ لە خواردنی شایانە و هەلاّلە دەبێتە هۆی چاکبوون و کەم بوونەوەی ئەم نیشانە ناخۆش و ناڕەحەتانە.

هەوکردنی پرۆستات یەکێکە لە نەخۆشی‌یە زۆر ناڕەحەتەکان کە تووشی پیاو دەبێت، لە دوو توێژینەوە لە وولاتی (سوید) و (ئەلّمانیا) لە کاتی بەکارهێنانی هەلاّلە یان هەنگوینێك کە هەلاّلەی زۆری تێدایە بۆ ئەم نەخۆشانە بینرا کە دەبێتە هۆی زۆر باشتر بوونی نیشانەکانی نەخۆشی‌یەکە تێیاندا لە رێژەیەکی بەرچاوی نەخۆشەکاندا.

لە کۆتایی‌دا بابزانین کە ئێستا هەلاّلە لە زۆرێك لە دروستکراوەکانی خۆجوان کردن و مەرهەمەکانی پاراستن لە تیشکی خۆردا بەکاردێت، هەروەها لە مەرهەمەکانی برین و سووتاوی و ووشك بوونەوەی پێستدا بەکاردێت.

## ٥- ژەهری هەنگ (Bee Venom):

لە فەرهەنگی زانستی بەریتانیدا هاتووە: لە کاتی پێوەدانی هەنگ بە شتێکەوە چزووەکەی لە لەشی جیادەبێتەوە کە کیسێکی پڕ لە ژەهری لەگەڵدایە و بە ماسولکە دەورە دراوە، کە بۆ ماوەی چەند دەقیقەیەك ئەو ژەهرە دەکەنە لەشی پێوەدراوەکەوە و کاریگەریی ژەهرەکە بەهێز دەکات، لە کاتی پێوەداندا ئازارێکی زۆر لەو شوێنەدا پەیدا دەبێت کە ١-٢ دەقیقە دەخایەنێت، پاشان سوور بوونەوە روودەدات بۆ چەند سانتیمەترێك، دوایی لە رۆژی دواتردا ئاوسان روودەدات.

**ژەهری هەنگ لە چارەسەری نەخۆشیدا:**

کاریگەریی دەرمانیی ژەهری هەنگ دەگەڕێتەوە بۆ بوونی ترشی ئەمینی تێیدا، لەگەڵ چەند پێکهاتەیەکی چالاکی وەك: میلیتین (Mellitin)، ئاپامین (Apamine)، و هیستامین (Histamine)، و ئەنزیمەکانی فۆسفۆلایپەیز (Phospholipase)، هایالوڕۆنیدەیز (Hyaluronidase) و ماددەی تری وەك: (Adolapin, Dopamine, Nor epinephrine, Serotonin, Mast cell Degredating Protein).

ئەم ماددانە کاریگەرییەکی هێمن کەرەوەیان هەیە بۆ کۆئەندامی دەماری مرۆڤ و بەرگری گشتی لەش لە بەرامبەر نەخۆشیدا بەهێز دەکات، هەروەها بۆ ئازارەکانی پیشت بە تایبەتی لە بڕبڕەکانی خوارەوەی پشتدا و بۆ هەوکردنی ئێسك و کرکڕاگە و نەخۆشییە رۆماتیزمییەکانیش زۆر بەسوودە.

هەروەها بۆ هەوکردنی رەشێنەی چاو و ئیلتیهابەکانی تری چاو بەسوودە ئەگەر بەژێر پێست بە دەرزی لێبدرێت، هەروەها ئەو ماددانەی لەسەرەوە باسمان کرد کە لە ژەهری هەنگدایە بینراوە کە بۆ چارەسەری هەندێك نەخۆشی پێست بەسوودە، بە تایبەتی لە کاتی هەوکردن و کێم کردنی ئەژنۆکان و نەخۆشی دەردەماسی (داء الصدف) و هەندێك هەوکردنی پێستدا پێدانی یەك لەدوای یەکی هەنگ وەك چارەسەر بەکار دەهێنرێت و بینراوە لەم حاڵەتانەدا و بۆ ئەم نەخۆشییانە زۆر بەسوودە.

## ٦- مۆمی هەنگ ( شمع النحل Bee Wax ):

ئەم ماددەیە لە بەشی خوارەوەی سکی کارکەرەکانی هەنگەوە دروست دەبێت، کە کارکەرەکان هەڵدەستن بە کۆکردنەوەیان و بەرەو دەمیان دەیبەن و دەیجوون بۆ ئەوەی نەرم ببێتەوە و بتوانرێت خانەی شەش پاڵوویی لێدروست بکرێت، ئەم ماددەیە لە رووی پزیشکی‌یەوە سوودی زۆرە کە دەبێت توێژینەوەی تری دوور و درێژی لەسەر بکرێت، لەو سوودانە:

١- وەك ماددەیەکی پرژێنراو (بخاخ) بەکار دێت بۆ چارەسەری هەستیاریی زۆر لە رادده بەدەری بۆری‌یەکانی هەناسەدان.

٢- وەك مەرهەم بۆ هەندێك نەخۆشی پێست و سووتاوی و مایەسیری بەسوودە.

٣- وەك ماددەیەکی دژە بەکتریا و دژە تێکچوون و تەخەمموری خواردەمەنی.

٤- لەگەڵ زەیتی نەعنا بەکاردێت بۆ کەم کردنەوەی ئازارەکانی لەش، و لەگەڵ زەیتی زەیتوون بۆ رێگرتن لە گرژ بوونی درێژخایەنی ماسولکەکانی لەش بەکاردێت.

### دواووتە:

دەبێت کەسێکی نەخوێندەوار کە لەسەدەی حەوتەمی زایینی‌دا ژیا بێت لە کوێوە ئەم فەرموودانە و کتێبە راستگۆ و ووتە شیرینەی هێنابێت؟

مرۆڤی ژیر و خاوەن عەقڵ دان بەوەدا دەنێت کە ئەمانە لە سەروو توانای مرۆڤی ئەو سەردەمەوەیە و دەبێت لەلایەن کەسێکەوە هاتبێت کە ئاگاداری وورد و درشت و هەموو نهێنی‌یەکان بێت، کە بێگومان پەروەردگاری بوونەوەرە.

لەلایەکی ترەوە دەبێت مرۆڤی موسوڵمان هەمیشە خەریکی زانست بێت و پێویستە بەرەوپێشی بدات، چونکە موسوڵمانە کە خاوەنی بەرنامەیەکی ناوازەی وەهایە کە هەردەم و هەمیشە مرۆڤ هاندەدات بۆ چوونە سەر رێگای زانستی راستەقینە و دۆزینەوە زانستی‌یەکان.

لە کۆتایی ووتەکانمدا هەر ئەوەندە دەڵێم کە قورئانی پیرۆز فەرموویەتی: ﴿ذلك لِمَنْ كانَ لَهُ قَلْبٌ أو ألقى السَّمْعَ وَ هُوَ شَهيد﴾، ﴿لَقَدْ كُنتَ فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَـذَا

فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَاءكَ فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ﴾ (ق٢٢)، رەحمەت لەو كەسەش بێت کە بە زمانی شیرینی کوردیمان وتوویەتی: (ئەو کەسە کەسە ئەلفێکی بەسە).

## سەرچاوەکان:


١-تەفسیری (الجامع لأحكام القرآن)/ دانراوی ئیمامی (قرطبي).

٢-تفسير القرآن العظيم/ دانراوی ئیمامی (إبن كثير).

٣-تفسير الإمام الفخر الرازي/ طبعة دار الفكر.

٤-فتح الباري شرح صحيح البخاري/ الإمام إبن حجر العسقلاني.

٥-فەرهەنگی (لسان العرب)/ دانراوی: إبن منظور.

٦-الطب النبوي/ لإبن القيم الجوزية.

٧-معجزة الإستشفاء بالعسل و الغذاء الملكي (حقائق و براهين)/ د. حسّان شمسي باشا/ الطبعة الخامسة-١٩٩٤.

٨-الطب محراب للإيمان/ د.خالص جلبي كنجو.

٩-الطب في ظلال القرآن و السنة/ كلية الطب/ الموصل-١٩٩٩.

١٠-گۆڤاری (الإعجاز العلمي)/ ژمارەکانی: (١٥ و ١٦)/ ١٤٢٤ك - ٢٠٠٣ز/ دەرکراوی: (هيئة الإعجاز العلمي في القرآن و السنة).

11- Davison’s Principles & Practice of Medicine \ 19th Edition 2002 \ Churchill Livingstone-UK.

12- Honey or Sugar in Treatment of Infected Wounds \ Lancet - 1982.

13- Encyclopedia Britannica 2006 ultimate reference suite DVD.

# ووتەی کۆتایی

خوێنەرانی خۆشەویست....

پاش ئەم گەشتە پڕ بەرەکەتە لەناو گوڵزاری فەرمووده شیرینەکانی قورئان و سوننەتی پیرۆز، هیوادارم توانیبێتم کە کەمێک لە گەورەیی موعجیزەکەی، و ناوازەیی ووتە شیرینەکانیانم بۆ ئێوەی خۆشەویست روون کردبێتەوە.

پێم خۆشە لە کۆتایی ووتەکانمدا ئەوە دووبارە بکەمەوە کە مەبەست لەم نووسینانە بریتی‌یە لە دەرخستنی هەندێك لە رووەکانی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا، و ئەم کتێبە کتێبێکی مەنهەجی نی‌یە لەو لقە زانستی و پزیشکی‌یانەی باسم کردوون، پڕوپاگەندەی ئەوەش ناکەم کە شارەزایی تەواوم لە هەموو بوارێکی پزیشکی‌دا هەیە، بەڵکو ئەوەی باس کراوە کورتەیەکە و روون کەرەوەیە بۆ بابەتە ئاماژە پێدراوەکان، هیوام وایە کە لە داهاتوودا کەسانی پسپۆڕ لە هەر لقێکی زانستی و پزیشکی‌دا بتوانن لەم بابەتانە بکۆڵنەوە بەدرێژی و ئەو راستی‌یانەی ئاماژەیان پێدراوە بۆ میللەتی کوردی موسوسڵمان بە شێوەیەکی فراوانتر و قووڵتر روون بکەنەوە.

دیارە هەموو کارێك و هەموو هەوڵێك لەم بوارەدا بریتی‌یە لە کۆششێکی بە نرخ بۆ خاوەنەکەی، و دانپێدانانێکی ئاشکرا بە راستی و گەورەیی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا کە دوو سەرچاوەکەی ئایینە پیرۆزەکەمانن، با بشزانین تەنانەت ئەگەر ئێمە وەك موسوڵمانیش بەم کارە هەڵنەستین ئەوا خوای گەورە کەسانی تر دەرەخسێنێت بۆ ئەوەی بەهۆیانەوە ئەم لایەنە گەورەیە و بەڵگە ئاشکرایانە دەربخەن، کە وەك لەم کتێبەدا بینیمان زوربەی توێژەرەوەکان بریتین بوون لە زانایانی رۆژئاوا و بێگانە بە ئیسلام، کە لەکاتی کارەکانیاندا بە هیچ شێوەیەك ئاگایان لە دەقەکانی قورئان و سوننەت نەبووە، بەڵام کارەکانیان بووە هۆی بەڵگەیەك و دەرخەرێك بۆ راستی‌یەکانی قورئان و سوننەت.

ئێمە لە (ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا) دووبارە بەڵێن بە خوێنەرانی بەرێز و قوتابیانی قوتابخانەکەی پێغەمبەر (ﷺ) دەدەین کە

بەردەوام بین لەم کارە پیرۆزەدا، و تەنها مەبەستمان بریتی بێت لە دەرخستن و روون کردنەوەی ئەم لایەنە مەزنەی ئیعجازی قورئان و سوننەتی پیرۆز، بە یارمەتی پەروەردگاریش بەردەوامی دەدەین بەم زنجیرە کتێبە کە هەوڵێکی گرنگە لەو بوارەدا.

لەخوای گەورە داواکارین کە ئەم کارانەمان بە پەرستش و عیبادەت بۆ بنووسێت و بەهۆی ئەم کتێبەوە سوودێك بگەیەنرێت بە خوێنەرەکەی.

داوا لە خوێنەرانی بەڕێزیش دەکەین لە هەموو کەم و کورتی‌یەکی ببورن و لە دوعای خێریان بێبەشمان نەکەن.

و السلام علیکم و رحمة الله و برکاته

**نووسەر**

## پێرستی بابەتەکان

# کورتەیەك دەربارەی ناوەند و چالاکی‌یەکانی

**ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا:** ناوەندێکی زانستی سەربەخۆیە، هەوڵدەدات بۆ دەرخستن و بڵاوکردنەوەی ڕووەکانی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا، لە ساڵی ٢٠٠٠دا دامەزراوە، لە بەرواری ٢٠٠١/٥/٥دا لە لایەن وەزارەتی ناوخۆی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە مۆڵەتی کارکردنی پێدراوە، بارەگای گشتی ناوەند لە ناو شاری سلێمانی‌دایە.

## دروشمی ناوەند :

ئایەتی: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ...﴾فصلت(٥٣)

## سەربوردێکی خێرای مێژووی ناوەند :

خاوەنی یەکەمین بیرۆکەی دروستکردنی ئەم ناوەندە بەڕێز (د.کاوە فرج سعدون)ە، کە بە هاوکاری بەڕێز ئەندازیار خالید حسن علی بیریان لەوە کردەوە کە مەڵبەندێك بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا لە کوردستاندا دروست بکرێت، بە هاوشێوەی چەند کۆمەڵەیەکی تر کە لە جیهانی ئیسلامی‌دا هەن و گرنگی بەم بوارە دەدەن.

بۆ ئەم مەبەستە چەند بەڕێزێکی تر لە پسپۆڕانی بواری زانستیە جیا جیاکاندا ئاگادار کرانەوە، و یەکەم دانیشتن لە ڕۆژی پێنج شەممە بەرواری ١٩٩٨/٩/٢٤ بەرامبەر بە (٣ی جماد الثاني ١٤١٩هـ) سازکرا، بۆ قسە و باس کردن، ئەوەبوو بڕیاری دامەزراندنی (مەڵبەندی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەت لە کوردستان) درا. کە ئەم بەڕێزانەی خوارەوە بریتی بوون لە دەستەی دامەزراندنی یەکەمی مەڵبەندەکە:

١- د. کاوە فەرەج سەعدون.

٢- ئەندازیار نەوزاد علاء الدين.

٣- ئەندازیار خالید حەسەن علی.

٤- د. سەرتیپ عیززەت قادر.

٥- ئەندازیار دارا محمد ئەحمد.

٦- م. ئەمیر محمد فەقێ فەرەج.

٧- م.عبدالرحمن غەفوور.

٨- م. دانا فاضل.

٩- ئەندازیار سەرکەوت عەلی.

١٠- ئەندازیار شاهۆ ڕەشید.

١١- م. سیروان ئەحمەد.

پاشان لە دانیشتنێکی تری دەستەی دامەزراندندا لێکۆڵینەوە لەسەر پەیڕەو و پرۆگرامی مەڵبەندەکە کرا، و دەستەی بەڕێوەبردنی مەڵبەند دیاری کران.

پاشان بڕیاردرا کە مەڵبەندەکە فراوانتر بکرێت بۆ هەموو ئاستە ڕۆشنبیری‌یەکان، و هەموو ئەو بەڕێزانەی کە توانایان هەیە لەم بوارەدا بانگهێشت بکرێن.

سەرەنجامی پەیوەندی‌یەکان بریتی بوو لە کۆبونەوەی کۆمەڵێك کەسانی زانستیی بەڕێز لە هەموو بوارەکاندا، بە مەبەستی دامەزراندنەوە و داڕشتنەوەی مەڵبەندەکە، لە ڕۆژی ٢٤/٥/٢٠٠٠دا دانیشتنی ئەم دەستە فراوانە سازکرا و بڕیاردرا بە دامەزراندنی (ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا) و پەیڕەو و پرۆگرامی نوێی ناوەند پەسەندکرا، و ئەم ڕۆژەش دانرا بە ڕۆژی دامەزراندن بۆ ناوەندەکە.

لەم دانیشتنە فراوانەدا ئەم مامۆستا بەڕێزانە ئامادەبوون: (محمد عومەر عبدالعزیز، نەشئەت غەفوور سەعید، فاروق ڕەسوڵ یەحیا، شەماڵ عبدالرحمن موفتی، د. دیاری ئەحمەد ئیسماعیل، د. محمد طاهیر، د. کاوە فەرەج سعدون، جەلال حەمە صالح بۆسکانی، مەریوان ئەحمەد ڕەشید، د. فائق حەمەسەعید، عادل شاسواری، د. دارا گوڵ حامد، ئەندازیار خالید حەسەن عەلی، ئەردەڵان صالح

عەزیز، جەمال محمد ئەمین، بەختیار عبدالله، محمد ئەحمەد، ئەندازیار فوئاد جەلال، ئەندازیار نەوزاد علاء الدین).

پاشان هەوڵ درا بۆ وەرگرتنی ڕەسمی یەت بۆ ناوەندەکەمان، بۆ ئەم مەبەستە داواکاری دامەزراندن لە (٢٠٠١/٢/١٢) دا پێشکەش کرا بۆ وەزارەتی ناوخۆ، دواتر لە ڕۆژی ٣/١٨ بۆ وەزارەتی ڕۆشنبیری، و سەرەنجامی کارەکان لە ڕۆژی ٢٠٠١/٥/٥ دا لەلایەن وەزارەتی ناوخۆی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەپێی یاسای کۆمەڵەکان ڕەسمیەت بە ناوەندەکەمان بەخشرا، بەپێی فەرمانی وەزاری ژمارە ٢٤٢٠/١٨.

لە ڕۆژی ٢٠٠١/٦/١ دا دانیشتنی دەستەی دامەزراندنی ناوەند سازدرا بەمەبەستی هەڵبژاردنی دەستەی باڵای ناوەند و ئەم بەڕێزانە بوون بەدەستەی باڵای ناوەند:

١) محمد عومەر عبدالعزیز.
٢) نەشئەت غەفوور سەعید.
٣) فاروق رەسوڵ یەحیا.
٤) شەماڵ عبدالرحمن موفتی.
٥) د. دیاری ئەحمەد ئیسماعیل.
٦) د. محمد طاهیر.
٧) جەلال حەمە صالح بۆسکانی.
٨) د. کاوە فەرەج سەعدون.
٩) خالید حەسەن عەلی.
١٠) نەوزاد علاء الدین.
١١) مەریوان ئەحمەد رەشید.
١٢) عادل شاسواری.
١٣) د. دارا گوڵ حامد.
١٤) ئەرخەوان صالح عەزیز.

١٥) جەمال محمد ئەمين.

١٦) بەختيار عبدالله.

١٧) محمد ئەحمد سەعيد

## ئامانجەكانى ناوەند:

١- خزمەت كردنى بانگەوازى ئيسلام لە كوردستاندا لە بوارى ئيعجازى زانستى لە قورئان و سوننەتدا.

٢- زيندە ئاشناكردنى ڕۆشنبيران و زانستخوازان بە ئيعجازى زانستى لە قورئان و سوننەتدا.

٣- بلاوكردنەوەى بابەت و ليكۆلينەوە لە بوارى ئيعجازى زانستى لە قورئان و سوننەتدا.

٤- پەيوەندى كردن بەهەر دەزگايەك يان دامەزراوەيەك يان كەسايەتىيەك كە گرنگى دەدات بەم بوارە بە مەبەستى هاوكارى كردن.

٥- هاندانى ليكۆلينەوە و نووسين لە بوارى ئيعجازى زانستى لە قورئان و سوننەتدا و هاوكارى كردنى ئارەزوومەندان لەم بوارەدا.

٦- هەولدان بۆ دەرخستنى ڕۆلى زانا موسولمانەكان لە بوارى ئيعجاز و پەرەپيدانى زانستىدا.

## هۆكارەكانى ناوەند:

١- پەيداكردنى سەرچاوەى جۆراوجۆر لە بوارەكانى ئيعجازى زانستى لە قورئان و سوننەتدا، و پيكەوەنانى پەرتوكخانەيەكى بينراو و بيستراو و خوينراوە.

٢- سازدانى كۆڕ و سيمينار و ڕيپۆرتاژ و بەرنامەى راديۆيى و تەلەفزيۆنى بۆ ڕوونكردنەوەى بابەتەكانى ئيعجازى زانستى لە قورئان و سوننەتدا.

٣- بلاوكردنەوەى پەرتوك و ناميلكە و شريت.

٤- دەركردنى بلاوكراوە (وەك گۆڤار و ڕۆژنامە)، كە گرنگى بدات بە بوارەكانى ئيعجازى زانستى لە قورئان و سوننەتدا.

٥- كردنەوەی خولی جۆراوجۆر بۆ زانستەکانی قورئان و سوننەت.

٦- سوود وەرگرتن و سوود گەیاندن لەڕێی تەکنەلۆجیای گەیاندن لە جیهاندا.

٧- بەشداری کردن لە کۆڕ و کۆنگرە زانستییەکانی ناوخۆ و جیهاندا، و بەدەمەوە چوونی بانگهێشتەکان.

٨- سازدان و بەشداری کردن لە وەرزی ڕۆشنبیری دا.

٩- بەکارهێنانی کەناڵە جۆراوجۆرەکانی ڕاگەیاندن.

## لە چالاکییەکانی ناوەند:

١- سازدانی چەند کۆڕێکی گشتی بۆ ڕۆشنبیران و زانست دۆستانی شارەکەمان لە لایەن کەسانی پسپۆڕی ناوەندەکەمان لەبوارەکانی: پزیشکی، گەردوونزانی، جیۆلۆجی، فیزیا، ژمارەیی و بیرکاری، ڕەوانبێژی و مێژوویی... و پەخش کردنیان لەڕێی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە، هەروەها ئامادەکردنیان لەسەر شریتی ڤیدیۆ و (CD) بۆ سوودی زیاتر.

٢- سازدانی کۆڕی ناوخۆیی مانگانە بۆ ئەندامانی ناوەند، لە بوارە جیاوازەکانی ئیعجازدا و دۆکیومێنت کردنیان.

٣- تۆمار کردنی زنجیرە بابەتی ئیعجازیی بۆ مانگی ڕەمەزانی پیرۆز (٣٠زنجیرە)، لەلایەن ئەندامانی ناوەندەوە بە مەبەستی پەخش کردنی لە هۆکارەکانی ڕاگەیاندنەوە (رادیۆ و تەلەفیزیۆن)، هەروەها ئامادەکردنیان لەسەر شریتی ڤیدیۆ و (CD) و بڵاوکردنەوەیان.

٤- ئامادە و پێش کەش کردنی بەرنامەیەکی ڕادیۆیی تایبەت بە ناوەند بە ناوی (هەیڤ) لە ڕادیۆی (یەکگرتوو)وەوە، کە بۆ ماوەی دوو ساڵە بەردەوام بوو لەسەر پەخش کردن.

٥- ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی سایتێکی ئینتەرنێتی تایبەت بە ناوەندەوە.

٦- دروست کردن و ڕێك خستنی کتێبخانەیەکی خوێنراو و بینراو بیستراو بۆ ناوەند لە نووسینگەی سەرەکی ناوەندا.

٧- دەرکردنی گۆڤارێکی تایبەت بە بابەتەکانی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا لەژێر ناوی (هەیڤ)، کە یەکەم گۆڤاری پسپۆڕە لەو بوارەدا لە کتێبخانەی کوردیدا، تا ئێستا ١١ ژمارەی لێدەرچووە کە ژمارە (١) دوو چاپی لێدەرچووە، و لە ژمارە پێنجەوە بەشێکی بە زمانی عەرەبی بۆ زیاد کراوە.

٨- دەست کردن بە دەرکردنی زنجیرەیەك کتێبی تایبەت بە بوارەکانی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا، کە ئەم کتێبەی بەردەستت ژمارە یەکە لەم زنجیرەیەدا.

٩- دروستکردن و بەڕێوەبردنی سایتێکی ئینتەرنێتی تایبەت بە ناوەند:

www.eijazyzansty.org